# کورتەی مێژووی فەلسەفە

مەحمود مەلا عززەت

کورتی کردۆتەوەو کردویە بە کوردی

Soran
کتێخانەی سۆران
٦٦

بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران- هەولێر

زنجیرەی ژمارە(٦٦)

ناوی کتێب : کورتەی مێژووی فەلسەفە

بابەت : فەلسەفە

وەرگێڕ : مەحمود مەلا عززەت

بڵاوکەرەوە : کتێبفرۆشی سۆران – هەولێر

شوێنی چاپ : سلێمانی : چاپخانەی سیما

نۆبەتی چاپ : چاپی یەکەم سوید- ١٩٨٨)

چاپی دووەم- (سلێمانی- لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی.ن.ک)- ٢٠٠٣)

چاپی سێیەم: (کتێبفرۆشی سۆران - هەولێر -٢٠٠٦)

ژمارەی سپاردن : ژمارە (    )ی ساڵی ٢٠٠٥ ی دراوەتێ

ئەم دەقە کوردیە پێشکەشە بەو تێکۆشەرەی کە:

ڕەشەبای ناو ژیانی پڕ کوێرەوەریی خەبات

چرای بیرکردنەوەی زانستیانەی ناکوژێنێتەوە..

گەرداوی دەریای تیوری لەواقیعی خەباتی

ناو بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی نیشتمانەکەی لای نادات..

## ئەم چاپەی کورتەی مێژووی فەلسەفە

بەکوردی کردنی ئەم کورتـەی مێـژووی فەلسـەفەیە بەرهـەمی کـاری ڕووناکبیریی نـاو بـارودۆخی خـەباتی قۆنـاغێکی سـنورداری بزوتنـەوەی نیشـــتمانی و ڕزگـــاریخوازی کوردســـتانە لـــە دەرەوەی نیشـــتمان. مەبەستیش لـەوەرگێڕانی بەرزکردنـەوەی ئاسـتی زانیـاری و هۆشـیاریی سیاسـیی و ئایـدیۆلۆجیی تێکوشـەرانی نـاو ڕیـزی یـەکێتی نیشـتمانیی کوردستان و سەرجەم خەباتگێڕانی سەر ڕێبازی بزوتنەوەی کوردایـەتی بوو.

لـە گەڵیشـیدا بووبـە سەرچـاوەیەکی گـرنگ بـۆ ئـەو خوێنـدکارە کوردانەی کە لە چەند زانکۆیەکی ڕوسـیادا دەیانخوێنـد چونکە ئەسـڵی بەرهەمەکە کە بە زمانی روسیی نوسراوە. تـا ئێسـتاش کتێبێکـی بریـار لەسەردراوە لە پرۆگرامەکانی خوێنـدنی کۆلێج و بەشـی مرۆڤایـەتی لـە

زانکۆکانی ڕوسیای فیدرالدا، ئەوەش بایەخی بەرهەمەکە و ئەم بە کوردیکردنە زیاتر دەردەخات[1]. . .

دوای زیاتر لە ١٦ ساڵ لەوەرگێڕان و ١٤ ساڵ لە چاپکردنی ئەم دەقە کوردییە لە ئەورووپا، کە لە عەرەبییەوە وەرگێراوە، هەمان مەبەست و سەنگ و سوودی لەو زەمەن و زەمینەی بەرهەمەکە، سەرلەنوێ بیری چاپکردنەوەی لە کوردستان هێنایەوە ئارا.

بە تایبەتیش چاپی یەکەمی هەر لە ئەورووپا کراو بڵاوکرایەوە کە بەهۆی نائاسایی ڕێگەویان لەو سەردەمەدا و قەدەغەکردنی هێنان و بردنی کتێب و بڵاوکراوەو نووسین، خوێنەری کوردستان لەو بەرهەمە بێبەش بوو، تاکوئەرا نەبێت کە بەزەحمەتێکی زۆر دەگەیەندرایە زانکۆ و کتێبخانە گشتییەکان. . .

ئەوەی پێویست و گرنگە کە لێرەدا ڕووناکیی بخرێتە سەر چەند تێبینی و باری سەرنج و بۆچوونێکە لە سەر تیۆری و ڕێبازە بنچینەییەکەی ئەم بەرهەمە.

لەناو گۆڕان و پێشکەوتنە مەزن و خێراو پڕکاریگەرییەکانی ئەم سەردەمەی بە جیهانیبووندا، لەگەڵ ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت و بەرەکەی نەمانی جەنگی ساردو هەڵوەشانی ڕژێمی سۆسیالیستیی لەو وڵاتانەداو دەرخستنی ئەو دۆکومێنتانەی کە پەردەی لەسەر

---

[1] لەناو ئەم قوتابیانەی هاتنە لام و ئەوەیان باسکردو سۆراغی دەقە کوردییەکەیان دەکرد ئەوانەی لە بیرم مابن: ئازاد کەرکوکی و چابوك عومەر بوون...

دیکتاتوریەت لەو ولاتانەدا، بە هەموو شێوەکانییەوە، هەڵدایەوە، دوای ئەوەی پرۆسەی مافی مرۆڤو بەسەرکردنەوەی، بەرین و ڕۆلبینەر بوو، بیروباوەرەکانی دیموکراسیی لە زۆر ولات و ناوچەی دنیا بڵاوبووەوە، کە دیموکراسییە ناتەواوو بە سنوورەکەی ئەو تیورییەو دیکتاتورییەتی بلۆکەکە خرانە ڕوو، ڕوون و ئاشکراتر هەندێك لە هەڵەو کەلێنەکانی تیوری مارکسیزم لینینیزم ولایەنێکی فەلسەفەکەی دەرخرا، بۆ چوون و لێکدانەوەی‌نوێ و جۆراو جۆر هاتنە ئاراوە، بازنەی ئەو پیرۆزیی و دۆگمایەی جاران شکێنران، بۆیە تێگەیشتنەکان زیاترو زانیارییەکان بەرین و فراوانتر بوون...

ئەم بەرهەمە لەلایەن سیی و شەش لە مامۆستایانی سۆڤییەت کە سەردەمی گۆرو باوو هێزی یەکێتی سۆڤییەت بوو، دانراوە.

بۆیە دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە گەلێك بیرو ڕاو بۆچوونی تێدایە سەلماون و تا ئێستاش جێگەی خۆیان لەناو فەلسەفە و گۆڕانە نوێیکاندا گرتووە، ڕاو بۆچونی واشی تێدایە کە لەگەڵ گۆڕانەکانی سەردەم و شارستانییەت و پێشکەوتنەکانی ئەمڕۆدا ناگونجێن، زانیاریی ناو ئەرشیفە بەردەستخراوەکانیش پەردەیان لەسەر زۆر لە ڕەوتی ڕوودلوو هەڵەو کارە نائاسایی و خوێناوییەکان هەڵداوەتەوە.

وەك گوتم دەکرێ بلێین بنەمای وای تێدایە سەلماون و تا ئێستاش جێگەی تایبەتی خۆیان لەناو فەلسەفەی سەردەم و گۆڕانە نوێیەکاندا گرتووە و لە تەکیشدا هەر سەردەمێکی زۆر کورتی دوواییدا، هەڵەکانی هەندێك لایەنی تری کەوتنەڕوو، دیسان هی تری وای تێدایە کە پێچەوانەی پێشکەوتنەکانی سەردەمن، زیاتر لەوانە، هەندێکیشی هێندە

بــه وشــکوبرنگی و جامیــدی وەرگــیراون کـــه زیـــانی گـــەورەیان لێبکەوێتەوە...

بۆ نموونه گوتراوە شۆرشه دیموکراسیه بۆرژواکانی ساڵی ١٨٤٨ لـه ئەورووپا ئەوەیان سەلماند که بۆرجوای لیبرال بووە بـه چینێکی دوژمـن به پێشکەوتن، لام وایه ئەوە تەواو پێچەوانەی واقیعی پێشـکەوتنەکانه. هەر چەندە پێشـکەوتنەکان بـه هێـزی بـازوی چـینی گارگـەرو ئـامرازی بەرهەمهێنان بووە، بەڵام ئەقڵ و هێـزی بـیری ئـابووری و تـەکنیك هـەر چینی بۆرجوا بوو، دیسان بۆچونەکان لەسـەر ئـاین جێگـەی مشـتومڕو نـەگونجاوو ململانێیـەکی بـەردەوام بـوون... کـه زیـانێکی گـەورەی لـه تیوریيەکەو ڕژێمه دامەزراوەکان دا!... خۆ هەر نـاوەرۆکی ئـەم بەرهەمـه ئه دەستنیشانکردنه پێشەنگە ناودارەکانی تیـۆری و زانسـت و هونـەر و ئابوری ..که هـەمووی ئـەناو چـینی بـورژواوە بـوون ئـەو بۆچـونانەمان دەسەلمێنن.. زیاتریش لەوانە:

بنەمایـەکی سـەرەکیی ئـەو تیۆریيـە، دیکتاتورییـەتی پرۆلیتاریایـە، ئەزموونەکانی حزبه کومونیست و ڕژێمه سۆسیالیسـتەکان؛ دەرکـەوتنی شـوێنەواری پیـادەکردنی ئـەو دیکتاتوریەتـە، هەڵـەو بۆشـاییەکانی، سـەلماندوویانه کـه ئـەو دیکتاتوریەتـە زیـان و کارەسـاتی گـەورەی لێکەوتەوە، تا ئەوە ئاستەی که ئـەمڕۆ ناحـەزو دوژمنـانی سۆسـیالیزم، هەم ڕژێمەکەو هەم کردەوەو شۆێنەوارەکانی، بەهاوتاو هاوتەریب لەگەڵ نازیزم و فاشیزمدا بدەنه قەڵەم، به لەدایکبوی یەك منالّدانی مرۆڤایەتیی دواکەوتەیان دابنێن.

دیکتاتوریەت هەر جۆرو ڕەنگێك بێت هەر دیکتاتوریەتـە، سـەپاندنی دەسەڵات و بەرژەوەندییه تەسکەکانی بەشێکی بچوکی کۆمەڵە به زۆری

هێز، بەسەر هەمووانداء زەوتكردنی ئازادی و دیموكراسی و هەلبژاردنی گشتیی و ئازادی و عەدالەتی كۆمەلایەتییە لە زۆربە، ئیتر دیكتاتوریەتێكە هی پرۆلیتاریا بێت یان سەرمایەداریی، هی حزبێك بێت یان گروپە ئەفسەرێك، هی بنەماڵەیەك بێت یان هی خێلێك، دیكتاتوریەتی ئایینیو مەزەبی بێت، یان هی سیاسی و رەگەز...

لایەنێكی نێگەتیڤی پیادەكردنی ئەو تیوریە لە حزبی پرۆلیتاریای كلاسكیدا، پێرەوكردنی سەرجەم بنەماكانی تیورییەكەیە، بەبێ ئاوردانەوە لە گۆڕان و لە هەڵەكان، دەنگی ئیندیڤید(تاك)و دەنگی كەمایەتیی لە دەری بازنەی شانە، لە بۆنە تایبەت و دەگمەنەكاندا نەبێت، تەنانەت لە رێكخستنەكەشیدا خنكێنراوە، ناوەندیتی دیموكراسیی كە بنەمایەكی سەرەكی بنكەی رێكخستنەكانی حزبە ماركسییە لینینییەكان كە لە سەردەمێكی دواتردا كرا بە ئامرازێكی دیكتاتۆری حزبی لە ناو حزبەكەشدا، دیالۆگی شارستانیی و رادەربرینی خستوتە ناو ئەلقەیەكی تەسك و داخراوەوە، لەناو ئەو ئەلقە زۆر تەسكەشدا سنورێكی تەسكتر بۆ خاوەن را ئازاو بە جورئەتەكان هەیە..دەبێت لە دەری ئەو سنورە، پێچەوانەی بیرو بۆچوونەكانی خۆی قسە بكات، رای خوی نەلێت و بەرگریی لە رای خەڵكی تر بكات، ئەو دیاردە درێوو نامویە تا ئێستاش تەنانەت سەرجەم حزبە كلاسیكییەكانیشدا، نەك وەك جاران، بەلام لە شێوەیەك لەو شێوانە درێژەی هەیە، چونكە لە سەر شێوازی حزبە ستالینیستەكان دادەمەزران، پێرەوی ناوخۆش كلێشەیەكی ئەوانبوون كە لاسایی دەكرایەوەو زۆربە رەقوتەقیش پێرەو دەكرا. زنجیرەی دیكتاتورییەت لەوانەدا هەرەمێكی نەگۆرە، لە دیكتاتوریەتی یەك چینەوە بۆ

دیکتاتوریەتی سەرکردە کە باڵاو توندو تیژو نایاسایی و ترسناکترین دەسەڵاتی تاکە، لەویشەوە بۆ کۆمیتەی ناوەندی و ئینجا بۆ لێپرسراوە هەمە جۆرو هەمەپلەو پایەکان.. لە وێدایە کە ئیندڤیدو کەمایەتی و لە سەرەنجامدا زۆریەتیش بێ دەسەڵات دەمێنێتەوە، دەبێت ملکەچی تاکە کەس بن، تەنانەت لەکاتی هەلبژاردنە گشتییەکانیشدا چەواشە دەکرێن ئیتر ناتوانن و بۆیان نییە ڕاو بۆچوونەکانی خۆیان ئاشکرا بکەن، دەبێت ملکەچی بڕیارێک بن کە دژ بە بۆچوونەکانی خۆیانە...لەوەشەوە مافی زۆربە دەخەنە ناو هەمان بازنەی داخراوەوە، کە بەرووکەش نەبێت هیچ مانایەك بۆ ڕاو دەسەڵاتی یاسایی و ئاسایی ناهێڵرێتەوە.

ئەگەر پرسیارێکیش دەربارەی ڕۆڵی پێشەنگی چینی کرێکار بکرێ و بگوترێ: دەبێت ئەو چینە بە پێی پلەو پایەی کۆمەڵایەتی و ئاستی خوێندەواریی و ڕووناکبیریی و ڕادەی توانای دارشتنی تیۆری سەنگی ئابوریی و ئەقڵی تەکنیکی کە دەزانین لە چ ئاستێکدان، بەتەنها چی پێدەکرێت و چۆن دەتوانێت ڕۆڵی پێشرەویی ببینێت؟ وا وەڵامەکەی روون و ئاشکرا دەردەکەوێت.

ئەمڕۆ خەباتی تاك و یەك چین و ئەو دیکتاتۆرییەتەو ناوەندێتیی دیموکراسی و حوکمی تاك و کەمایەتی؛ کەوتونەتە بەردەم ڕێگەیەکی داخراوەوە، بەتایبەتی بۆ میللەتانی ژێردەست و چەوساوە، بۆ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازو لە قۆناغی ڕزگاریی نیشتمانیدا.. چونکە خەبات و ئامانجە نیشتمانیی و کۆمەڵایەتیی وسیاسیی و دیموکراتییەکان، هی هەمووان و بۆ هەموانە، جگە لە وابەستەو خاوەن بەرژەوەندە تەسك و بەزیانەکان...

پیادەکردنی هەندێك سیاسەتی هەڵە لەلایەن یەکێتی سۆڤیەت و دەوڵەتانی ناو بلۆکەکەی، چ وەك پیادەکردنی لایەنە نەگونجاوەکان لەگەڵ گۆڕانەکاندا و چ وەك بەشێك لە هەڵەو وبەهەڵە لێکدانەوەی تیۆرییەکە بێ گوێدانە گۆڕان و پێشکەوتنەکان، هەم لاوازیی تیۆرییەکەو هەم بێزراوی دیکتاتۆرێتەکەیان دەرخست:

کوشتوکوشتاری دەیان ملیۆن مرۆڤی بێتاوان لەسەردەمە جیاجیاکانی مێژوی یەکێتی سۆڤیەتدا... پەرش وبڵاوەپێکردنی کەمینە نەتەوەو گەلانی تری ناو سنوری سۆڤیەت و دوورخستنەوەیان لەزێدی باوو باپیرانیان بۆ ناوچە دوورو نامۆکان پێیان.. لەوەدا گەلی کوردیش دووچاری هەمان سیاسەت کرا...

پێشێلکردنی مافەکانی ئادەمیزاد لە بێزراوترین شێوەدا...

پشتگیریکردن ویارمەتیدانی ڕژێمە دیکتاتۆرەکان، لەهەموو ڕوویەکەوەو لەسەرجەمە کیشوەرەکانی سەرئەرز، لەناویاندا ڕژێمی بەعسی عیراق، تەنانەت لە تراجیدیەکانی ئەنفال و چەکی کیمیایی و تارومارکردنی سەرجەم ناوچە دێهاتییەکانی کوردستان، نەك هەر بێدەنگ مایەوە بگرە ئەسە یارمەتیدانی بەعس بە چەك و جبەخانەو شارەزاو پسپۆڕی عەسکەری و لە ڕاگەیاندنەکانیشدا بەرگریی لێدەکرد...

لە ئەزموونە مێژووییەکەی حوکمداری و مەلیکایەتییەکەی جنوبی کوردستان، مەلیك مەحمود بەنامە بۆ سەرکردایەتی دەوڵەتە تازە دامەزراوەکەی سۆڤیەت، داوای یارمەتی و ئاوڕدانەوە، لە کوردی زوڵملێکراوو لە بۆردومانکردنی چەند جارەی شاری سلێمانی و

ناوچەکەنی تری کوردستان کردبوو... بەڵام سەرکردایەتی کورد هیچ وەڵامێکی وەرنەگرتەوە.

لە ئەزموونەکەی مەهاباد بەگشتیی و لە دامەزران و ڕوخانی جەمهوریەتی کوردستان بەتایبەتی، ڕۆڵێکی نا بەرپرسیارانەو بەگورگانخواردوانی ئەو جەمهوریەتەو کۆماری ئازەربایجان بینیی...نامەکەی ستالین بۆ کیشوەری سەرەك کۆماری ئازەربایجان نمونەی هەلپەرستیی و لەخشتەبردنی گەلانی بندەستن لەپێناو بەرژەوەندیی ئیمپریالیستەکەی شای ئێران... (بڕوانە: مەحمود مەلا عززەت، جەمهوریەتی کوردستان، سلێمانی ٢٠٠١).

دەرکەوتنی ڕۆڵی موخابەراتی ئەڵمانیا لەبەرپاکردنی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو سەرفکردنی دەیان ملیۆن مارك بەپەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ڕابەرانی شۆڕشەکە بەلینینیشەوە. لایەنێکی بەرپرسیایشی لە سیاسەتی چەوتی حزبە شیوعیەکانی دنیا بەگشتیی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی بەرەورووی ئەو دەوڵەتە دەبێتەوە، کە لەسەرەنجامدا دووچاری کارەسات و لاوازبوونی بەردەوام بوون...

مێژووی تاقیکردنەوە و ژیان و گەشەکردنەکانی گەلان سەلماندوویانە کە نکوولیکردن لە سەرجەم ئیدیالیزم وبنەما سەرەکییەکانی، بێ سەرنجدان لەو لایەنانەی کە ڕۆڵی گرنگیان لە بینای فەلسەفەو گەشکردنەکان و بینای شارستانییەت بینیوە، بەبێ سەرنجدان لە هەندێك بنەمای سەرەکیی چارەنووسسازو بە ڕەواجپێدانی هەندێك بۆچوونی نەگونجاوو هەڵە، بە گوێ نەدان و بەلاخستنی پیرۆزییەکانی سەدەها ملیۆن لە خەڵکانی سەرەبەم نەتەوەو ئاین یان بەو نەتەوەو ئاینە، بووە هۆی خوڵقانی بەرەیەکی فراوان لەدژی.

کورت و پوخت ئەو تیۆرییە مارکسیزم ـ لینینیزمەی زیاتر لەسەدەو نیوێك لەمەوبەر دایکراوەو گەلێ بۆشایی و کەموکورتی تێدابووە.. زیاتر لەمەندێ ڕووەوە خەیاڵی بوو، بەتایبەتی بۆ ئەم سەردەمانەی دنیای جیهانگیری و پێشکەوتنە گەورەکان و ئالوگۆڕ لەڕۆڵی چینە کۆمەلایەتییەکان.

لەگەڵ ئەوانەشدا ئەم بەرهەمە لەلایەنەکانی ترەوە بەگشتی، نرخی مێژوویی و زانستیانەی خۆی پاراستووە، ناوەڕۆکەکانی لەسەربیرو ئایدیۆلۆجی و فەلسەفە، بایەخێکی تایبەتی و گرنگیان هەیە، نەك هەروەکو زانیارییە مێژووییەکان، بەڵکو وەك بەشێکی گرنگ لەبیرو لە فەلسەفە کە تائێستاش جێگەی خۆیان، وەك ڕاستییە مێژووییە هەڵهێنجراوەکان، پاراستووە، وەك مێژووی سەرهەڵدان و ژیان و گەشەکردن و بەرێوەچوونی کۆمەڵگەو ململانێیەکان کە سەنگی زانستیی و مێژوویی و فەلسەفیی خۆیان هەیە... مەبەستم لەوەدا دیالێکتیکە کە عەرەبییەکەی (جەدەل)ە.

یاساو بنەما یاسا ناسراوەکانی دیالێکتێك سەرنجی ڕیالیست و زانستانەیە بۆ گۆڕانە چەندایەتییەکان بۆ چۆنایەتی، بۆ نەفی نەفی و بۆ یەکێتیی ململانێی دژەکان... مانای کۆڵینەوەیە لەیاسا بنچینەییەکان جوڵەو گۆڕانەکان، لە سروشت و لەکۆمەڵ کە تێیدا ناکۆکییەکان بە سەرچاوەو بنچینەو خوڵقێنەری گۆڕانەکان دادەنێت بەو پێیەی کە مەتریال لە گۆڕانی یەکبینەدایە... مەتریالیزمی دیالێکتێکیش زانستی یاسا گشتییەکانی پەرەسەندنە لە سروشت و لە کۆمەڵدا، گەوهەری تیۆری دیالێکتێك بڕوابوونە بە بوونی ناکۆکی لە هەمووشتێك و لەهەر شتێکدا، بەبوونی دوو لایەنی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ، واتە بوونی لایەنی

چاکەو لایەنی خراپە، یەکێکیان دەفەوتێت و ئەوەکەی تر دەخولقێت و گەشە دەکات، لە گۆڕانی چەندایەتییەکان بۆ چۆنایەتی گەشەکردن و بڕینی قۆناغە کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکان، مەسەلەکانی یەکێتیی و زۆرانبازیی دژەکان، یەککگرتن و سەرلەنوێ دابەشبوون و پۆلینبوونەوە.. تاد.

ئەوانە بەشێکی گرنگی فەلسەفەکەن و بنەما سەرەکییەکانی گۆڕان و گەشەکردنەکان دیارو شیددکەنەوە کە تائێستاش سەنگی زانستیانەی خۆیان پاراستووە.

روخانی یەکێتی سۆڤیەت وبلۆکی سۆسیالیزم، ڕوخانی هەموو لایەنەکانی تیۆرییەکە نەبووە، رووخانی ئەو لایەنانە نەبووە کە لەگەڵ دیموکراسیی سەردەم و ئازادیی بیروباوەڕ و کۆمەڵگای شارستانی دەگونجێن، بەڵکو ڕوخانی کۆمەڵە دەوڵەتێك بوون کە لەناو هەمان بۆشاییدا دەژیان بەکەلەکەبوونی گەلێك هەڵەو بۆشاییی تر تا ئەو ئاستەی کە لەسەروو کۆمەڵگەکانی سۆڤیەت و دەسەڵات و یاساو بیروباوەڕەکانەوە، چینێکی نوێ سەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیست بکات، کە هەموو دەسەڵاتێکی گرتبووە دەست و لەگەڵانی سۆڤیەت دابڕابوو، لەناز نازو نیعمەتدا، کەڕەنجی شانی ئەو چینانەبوون کە ئیدیعای نوێنەرایەتییان ئەکردن، دەژییان.

بۆیە ئەو وخاندنانە، رووخانی عەدالەتە کۆمەلایەتییەکان و لایەنەگەشەکەی سۆسیالیزم نەبوو، بەڵکو ڕوخانی هەڵەو لایەنە چەوتەکان بوو کە لەگەڵ ڕەوتی ژیان و پێشکەوتنەکان نەدەگونجان، باونەمانی ئەو بۆچوون و بیروباوەڕانە بوو کە هەر لەسەرەتاوە هەڵەبوون و بەهەڵەتریش پیادە دەکران، ڕوخانی سستێمی کپکردنی

دەنگی ئیندڤید و کەمایەتی بوو، کورت و پوخت ڕوخانی دیکتاتۆزیەت بوو.

چاپکردن و بڵاوکردنەوەی بەرهەمێکی وا بە پێداچوونەوەو هەوڵی ڕاستکردنەوەی هەڵەی ڕێنووس و بۆشاییەکان، درێژەی مەبەستە سەرەکییەکەی چاپەکەی ئەوروپایە، بەتایبەتی لەم قۆناغە مێژووییەی ڕزگاریی نیشتمانیداو لەم سەردەمەی ژیانی ئەزموونی کوردستانی فیدرالخواز، گرنگییەکی تایبەتی هەیە، لەم هەلومەرجەدا کە وەك دیاردەیەکی بەرچاو، بەها فیکری و تیۆرییە فەلسەفییەکان و بەهاکانی ڕەوشتی حزبایەتی و گیانی هاوڕێی و هەڤاڵێتی، کراون بە ملکەچیی و بەئامرازێ بۆ پاراستنی دەسەلآت و پلەوپایەو ڕابواردن، تا ئەو ئاستەی کە شۆڕیشگێڕێتی جاران کرابێت بە قوربانی حەزی خۆ، هەست و هەستی نەتەوەیی و دڵسۆزیی بۆ نەتەوەو نیشتمان ببنە پەراوێزی ڕووداوەکان، پەراوێزی ژیانی ڕۆژانە، لەوانەدا نەوەکانی سەردەم لەبەردەم هەڵوێستەو وەرچەرخانێکدان کە ئەگەر ئاوڕێکی بەپەرێش ڕ بەبەرنامەیان لێنەدرێتەوە وا لەو ونبوونەی ئێستادا بەردەوام دەبن و ئاییندەیەکی ئاناسایی و نادروستتر چاوەڕوانیان دەکات... زیاتریش لەوانەو تا ئێستا بزوتنەوەی ڕووناکبیریی ئەم لایەنەی لاواز و کتێبخانەی کوردیشی هەژار کردووە، ئەوانەش بۆ خۆیان هۆیەکی تری ئەم چاپە نوێیە بوو، دەمەوێت جەختیش لەسەر ئەوە بکەم کە ئەم کتێبە بۆ سەپاندن یان سەلماندنی دۆگمانەی تیۆرییەك، یان بیروباوەڕێك نییە، بەڵکو بۆ هاوبەشییەکی ڕووناکبیرانەو خستنەڕووی کۆمەڵە بیروباوەڕێکە کە هەمووی بەردەوام جێگەی مشتومڕن، بە ئەسەرکردنەوە یان ڕەتاندنەوە، بەتایبەتی ئەم جۆرە زانیارییانەی هاوتەك لەگەڵ سەرجەم

بیرو تیۆرییە نوێیەکاندا، بۆ ئەمڕۆی ئەوە نوێیەکان هەم مەیدانی زیاتر قسەکردن گەیشتن بەڕاستی بەرین دەکات، هەم بۆ ئەوەی ئەوە نوێیەکان لەو لایەنانەدا دابڕاو نەبن، واتە ئەم کارە مانای ئەوە نییە کە هەموو بیربۆچوونەکانمان سەلمێنراوبن، جێگەی مشتومڕنەبن، بەڵکو ئەمە هەروەك ئەو کارە ڕووناکبیرییەیە کەلەگەڵ سەرجەمی تیۆری و بیروباوەڕە جیاجیاو هەمەڕەنگ و هەمە چەشنەکاندا دیدێکی سەرجەمییترمان دەخەنە بەرچاو، کۆی هەموویان ئاسۆی بیرکردنەوەو تێگەیشتنمان ڕوون و بەرینتر دەکەن، قوتابخانەکانی بیرو فەلسەفە دەوڵەمەندتر دەکەن.

دەقی ڕووسییەکەی ئەم کورتەی مێژووی فەلسەیە لەساڵی ١٩٧١دا دارلفکر لەمۆسکۆ یەکەم چاپی بڵاوکردەوە.

لەساڵی ١٩٨٠ پیشدا دارو لجەماهیر ئەلشەعبیە لەشام و دارولفارابی لەبیرو

ئەم دەقە عەرەبییەی کە مامۆستا ئیبراهیم سەللوم پیی هەستبوو چاپ و بڵاویانکردەوە.

لەساڵی ١٩٨٦یشدا ئەم دەقە کوردییەم تەواوکرد، یەکەم چاپیشی لە ١٩٨٨دا لەسوێد بڵاوکرایەوە.

ئەم بەرگە کورتکراوەی بەرگی یەکەم و دووەمی نوسخە عەرەبییەکەیە کە هەر بەناوی "کورتەی مێژووی فەلسەفە" وەیە کە سەرجەمی مێژووی باسەکانی هەموو باسەکانی هەموو سەردەمەکانی پێش مارکسیزم دەگرێتەوە.

ئەم چاپە وەك چاپی یەکەم، فەرهەنگی زاراوەکانیش دەگرێتەوە خۆی، دیارە بە پێداچوونەوەیەکی ورد و نەهێشتنی هەڵەو پەڵە، بەڵام

لەبەر قەبە نەکردنی بەرهەمەکەو هۆی تریش پێشەکیەکەی لەگەڵدا چاپ نەکرایەوە..

لەچاپی یەکەمدا گەڵێك براو دۆستانم یارمەتیدەر بوون لە تایپکردنی و چاپکردنندا، لە ناویاندا کاك ئازادی کاکە مستەفابوو کە دڵسۆزانە هەر لەسەرەتای کۆمپیوتەرکردنەوە لە لەندەن تا ئامادەکردنی بۆ چاپ و ناردنەوەی بۆم بۆ سوید، هاوکارم بوو،

لەم چاپەشدا یارمەتیدەرانم ئەم دوستە ئازیزو دڵسۆزانە بوون: دوکتۆر محەمەد مەحوی لە پێداچوونەوەی زمانەوانیی فەرهەنگەکە...

خوشك و برایانی بەرێز لە مەکتەبی بیرو هوشیاری شەماڵ عەبدولا، دلێر عباس... تاهیر شوکرو سازان عومەر و هێمن نورالدین و ڕۆژگار معروف کە تایپەکەیان ئەنجامدا، شۆڕش ئەحمەد کە نەخشەی بەرگەکەی کێشا.

بەختیاری مەلا عززەت و فاتح عەزیز ئەحمەد بە بەراورد کردنی دەقی چاپی یەکەم و ئەم دەقە هەستان... پڕبەدڵ سپاسیان دەکەم.

دیارە هەر هەڵەیەکیش ڕوویدابێت هەر خۆم لێی بەرپرسیارم.

**مەحمود مەلا عززەت**

**سلێمانی - نۆڤەمبەری٢٠٠٢**

# بەشی یەکەم

- مێژووی فەلسەفە وەکو زانستێك.. بابەت و بەرنامەو بایەخی.
- فەلسەفە لە قۆناغە کۆمەڵایەتییەکاندا.
- فەلسەفە لە کۆمەڵگەی کۆیلەیەتیدا: لەمیسر، بابل - چین - هیندستان - یۆنان - ڕۆما.
- سەرەتای دەرکەوتنی دیالیکتیك و میتافیزیك.
- مەتریالیزمی سەردەمی پەرەسەندنی دیمۆکراسیی کۆیلەیەتی.
- فەلسەفەی کۆمەڵگەی کویلەیەتی لە ڕۆمای کۆندا.
- فەلسەفەی سەردەمی هێلنیستی.

## مێژووی فەلسەفە وەکو زانستێك.

## . بابەت وبەرنامە وبایەخی.

فەلسەفە phileosophia شێوەیەکە لە شێوەکانی تێگەیشتنی مرۆڤ بۆ جیهان.هەموو ئەو ڕاو دیدانە یە کە دەربارەی مەسەلە گشتییەکانی پەرەسەندنی بوون وهۆشن،بە تایبەتی مەسەلەی پەیوەندیی بیر بەبوونەوە، یان گیان بە سروشتەوە، کە مەسەلەی بنچینەیی لە فەلسەفەدا پێك ئەهێنن. فەلسەفە شێوەیەکە لە شێوەکانی هۆشیاریی کۆمەلایەتی و ئاوێنەی ئایدۆلۆژی چینێکە لە کۆمەڵێکی فرە چینیدا، لە ناو پەرەسەندنیدا بوە بە زانستێکی سەربەخۆی وا کە بابەتی جیاوازی خۆی هەبێت و بە پێی پەرەسەندنی کومەڵگە و پێشکەوتنی زانیارییە زانستییەکان گۆڕاوەو ئەشو نمای کردووە.. تا لە لوتکەی گەشەکردنی بیری پێشکەوتووانەیدا لە فەلسەفەی مارکسیزم– لینینیزمدا، لە مەتریالیزمی دیالیکتکیدا خۆی بینیوەتەوە.

مەسەلەی سەرەکی و بنچینەیی فەلسەفە.. مەسەلەی بیرو بوونە، هی گیان و مەتریالە، واتە لە مەتریال و لە گیان کامەیان کۆنترە، لە بیرو لە بوون، کامەیان ئەزەلییە.

هەندێ هەن لەگەل کونێتی هۆش یا بیر یا گیان دان، ئەمانە بلۆکی ئیدیالیزم پێك ئەهێنن و فەلسەفەکەشیان فەلسەفەی ئیدیالیزمە .

ئەوانـەش کـە لەگـەڵ کـۆنێتی سروشـت یـا مـەتریاڵ دان .. بلـۆکی مەتریالیزم پێك ئەهێنن و فەلسەفەکەشیان فلسەفەی مەتریالیزمە.

دووەم مەسـەلەی گرنگـی فەلسـەفە مەسـەلەی توانسـتی ناسـینی گێتییە، ئایا دەکرێ دیدو تێگەیشتەکانی خەڵك بابەتی و یەقینی بن،یان گێتی لەزانین یاخییە و توانستی دەرکپێکردنی نییە و سەرەنجام، بوونی ڕاستیی بابـەتیی لـە بـیری مروڤدا نییـە. فەلسـەفەی بـڕوای سـەرەتایی بەتێگەیشتنی گێتـی هەیـە و هـۆش بـە ڕەنگدانـەوەی واقیعـی دەرەکـی دائـەنێت، بـەڵام ئیدتالیسـتەکان ئەگـەر بـاوەڕ بـە توانسـتی ناسـینی جیهانیش بێنن.. وا نکوڵی ئەکەن لەوە کە هوشی خەڵك واقیعی بابـەتیی ڕەنگ پێدەداتـەوە، زوربـەی فەیلەسوفە ئیدیالیسـتەکان نکـولین، واتـە نکولی لە توانستی تێگەیشتنی گێتی ئەکەن.

زیـاتر لەسـێ هـەزار سـاڵ لەمەوبـەر لـەوڵاتانی خۆرهـەڵاتی کونـدا فەلسـەفە هاتۆتـەئاراوە، هـەر لەسەرەتاشـەوە دوو شـێوەو دوو ڕێبـازە بووە: مەتریالیزم و، ئیدیالیزم. لـە دوو بەرنامـەی دژ بەیەکدا بـوون کـە دیالیکتیك و میتافیزیکە لە کۆلینەوەدا، بەرنامەی دیالیکتیـك، سـەرجەم دیاردەکـــــــان وەرئـــــــەگرێ.. بەپەیوەندییەکانیانـــــــــەوە، بەدەرخستنی:کامانـەیان ئـە ئـالوگۆڕا سـەر بەیـەکن.. بەپەرەسـەندن و گۆڕانەکانیان، لایەنە دژ بەیەکەکانی ناوخۆیـان ئەدوزێتـەوە کـەململانێی نێوانیان سەرچاوەی ئـەو پەرەسـەندنە پێکدەهێنێت.بەڵام میتافیزیـك هـەر دیاردەکـان شـیتەڵ ئـەکات و جیایـان ئەکاتـەوە بـەبێ ئـەوەی

گوێبداتە ئەو شتانەی پێکیانەوە ئەبەستێت،بێ سەیر کردنی گۆڕان و پەرەسەندنیان، وا سەیری دیاردەکان ئەکات کە گۆڕانی چەندایەتییە وهیچی تر.. بەبێ ناکۆکی ناوخۆو بەبێ زۆرانبازی نێوان دژەکان ڕوو ئەدەن. بەو جۆرە دیالیکتیك و میتافیزیزیك تەنها دوو دەروازەی جیاواز نین بۆ تێگەیشتنی جیهان و بەس بەڵکو دوو لێکدانەوەی جیاوازیشن بۆ جیهان.

لەمەوبەرو ئیستاکەش مێژووی فەلسەفە بایەیخی داوە بەکۆڵینەوە لە پەیدابوون و پەرەسەندنی مەزەب و ڕێبازەکان.. لەمەسەلە فەلسەفییەکاندا ئەم یان ئەو چارەسەر.. لێکدانەوەی مەتریالیزم یان ئیدیالیزم.. دیالیکتیکی یان میتافیزیکی داناوە. لای مارکسیزم مێژووی فەلسەفە مێژووی مەسەلە فەلسەفییەکان و چارەسەرکردنیانە.. بایەخێکی تایبەتی ئەدات بەمەسەلەی پەیدابوون و پەرەسەندنی مەتریالیزم و ئیدیالیزم بەزۆرانبازیی نێوانیان لەسەردەمە جۆربەجۆرەکاندا. فەلسەفە لەمێژووی پەیدابوون و پەرەسەندنی واتاو تێگەیشتەی زانینە بنچینەییەکان ئەکۆڵێتەوە.

مێژووی فەلسەفەی مارکسیزم، بایەخێکی تایبەتی بەتوێژینەوەی دروستبوون و پەرەسەندنی مەتریالیزمی دیالێکییکی ئەدات، سەبارەت بەوەی کەمەزەبێکی زانسنستی فەلسەفی کامڵەو بەرنامەی گۆڕانی شۆڕشگێڕانەی جیهانەو بنەمای فەلسەفییە بۆ ئایدولوژی چینی کرێکارو هەموو ئەو هێزانەی بۆ سەرکەوتنی سوسیالیزم خەبات دەکەن.

ئەگەر بمانەوێت واقیع بگۆڕین..سروشت بێت یان کۆمەڵ..وانەبێت لەو واقیعە بکەین..مرۆڤ بەهۆی زانستە جۆراو جۆرەکانەوە گێتی ئەناسێ،هیچ شتێکیش دایی خەباتی کرێکاران نادات لە پێناوی ژیانێکی باشتردا جگە لە تێروانینێکی زانستیانە نەبێت بۆ جیهان،ئەم تێروانینە زانستیانەیە...فەلسەفەی مارکسیزم یا مەتریالیزمی دیالیکتیکە.

فەلسەفەی مارکسیزم– لینینیزم لە زانست جۆدا ناکرێتەوە بەڵام سیفەتی جیاوازی نێوانیان ئەمەیە:

مەبەست لە زانستەکانی فیزیك و بایلوجی و سایکۆلۆجی ئەوەیە کەلەو یاسایانە دەکۆڵنەوە کە پەیوەندیان بە بەشێکی سنووورداری واقیعەوە هەیە، بەڵام مەتریالیزمی دیالکتیکی لە گشتیترین یاساکانی گەردوون دەکۆڵێتەوە، فەلسەفەی مارکسیزم سەرنجی زانستیانەیە بۆ جیهان، ئەمەش تاکە سەرنجی زانستیانەیە کە لەگەل ڕێگەو شوێنی زانستیەکاندا یەك ئەگرێتەوە.

ئنگلس ئەڵێت:سەرنجدانی مەتریالیستانە بۆ جیهان، مانای ئەوەیە سەرنج لە سروشت بدەیت وەکو هەیە..بەبێ هیچ زیاد کردنێکی دەرەکی لەسەری.

مارکسیزم: ئەو زانستەیە کەلەیاساکانی پەرەسەندن و گەشەکردنی کۆمەڵ و سروشت دەکۆڵێتەوە، ئەو زانستەیە کە لە شۆڕشیچینەزۆر لێکراوو چەوساوەکان دەتوێژینەوە، ئەو زانستەیە کە سەرکەوتنی سۆسیالیزم و کۆمۆنیزممان فێر دەکات.

خوێندن و تێگەیشتنی فەلسەفەی مارکسیزم، فەلسەفەی چینی کرێکار، بۆ کرێکاران و بەتایبەتی بۆ پرۆلیتار..بۆ خۆشی ڕابواردن و لەزەت نییە، بەڵکو ئەوە ئەرکێکی گرنگی چینەکەیان و خەباتی چینایەتییە.هەر تەمەڵی کردنێك لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە، مانای وایە کەرێگە بۆ مانەوەی ڕوانگە و بای سەرنجی نازانست و کۆنە پەرست خۆش ئەکرێت و دەرگاش لە سەر بزوتنەوەی کرێکاران دائەخرێ و ناهێلرێ بەشە پێشەنگەکەی ڕێگای ڕاستەقینەیان بۆ دەستنیشان بکات.

مێژووی فەلسەفە..مێژووی دەرکەوتنیمەسەلە فەلسەفەییەکان و چارەکردنیانە، بۆیە مارکسیزم بایەخێکی تایبەتی ئەدات بەجۆری پەرەسەندن و بەربڵاوبوونی مەتریالیزم و ئایدیالیزم.. بەململانێی نێوانیان..بەدەرکەوتنی دیالیکتیك و ململانێی لەگەڵ میتافیزیکدا، لەهەموو ئەو پلەو سەردەم و قۆناغانەی پێیاندا تێپەڕ بوون.

مێژووی فەلسەفەی مارکسیزم گرنگییەکی تایبەتی ئەدات بەکۆڵینەوە، بەپەیدابوون و پەرەسەندنی مەتریالیزمی دیالیکتیك، سەبارەت بەوە کەمەزەبێکی زانستیانەی فەلسەفیی تەواوە، بەرنامەیەکە بۆ تێگەیشتنی جیهان و گۆڕینی، بەڵام گۆڕینێکی شۆڕشگێڕانە کە بنچینەی فەلسەفی و ئایدیۆلۆژی چینی کرێکار بێت.

لەسەرەتادا، پێش دەرکەوتنی زانستی تایبەت بەسروشت و کۆمەڵ و بەشێوەکانی بزوتنەوەی مەتریال.. فەلسەفە لە یەکەم شێوەو دەقی

سەرەتاییدا بوو، بۆ زانینی تیۆری گشتی بوو. بەلأم لەگەڵ پەرەسەندی زانیاری مرۆڤ و دابەشبوون و لك لێبوونەوەی، زانستی تایبەتی پەیدا بوو کەلە فەلسەفەو جیانەبووەوە..هەر زانستە ئەبوو بەمەیانێکی تایبەتی ئیتر بەرە بەرەفەلسەفەو ئەو جێگەیەی وەك زانستی زانستەکان گرتبووی وەك جاران نەما.. بەڵکو تەنها لە سنووری کۆلینەوەی لە مەسەلە سەرەکیەکانی:بوون و زانیندامایەوە. دوای ئەوە لە فەلسەفە کەوتە لێکوڵینەوە لە واقیعی بابەتیی گێتی..ئایا سروشت، یا گێتی، هەر خۆی هەبووە..مەتریالە..یان هێزێکی نەپەنی و لە تێگەیشتن نەهاتوو درووستی کردووە..؟ئەم جیهانە ئەمرە..خوا کردە یان نە ..؟سروشت لە بزوتنەوەدایە، نۆێ بوونەوەی بەردەوام..بەپێی یاسا بابەتییەکانە کە لەهۆش جودان و سەریەخۆن؟ئایا دەسەلاتی خوا یا کردگار بەدەر پەرە دەسێنێت یا خوای کردوگار ڕۆڵ وازی نەکات..؟

لەمەسەلە گرنگەکانی تری فەلسەفە، مەسەلەی پەیوەندی مرۆڤە بە جیهانەوە،ئەو پەیوەندییەی کە لەچالاکی پراکتیك و تیوریدا دەرئەکەوێ،کە بە شێوەیەکی گشتی سروشتێکی کۆمەلایەتی وەرئەگرێ و لەسەرەنجامدا بەشێوازی بەرهەمهێنانی زاڵ لە کۆمەڵدا سنودار ئەکرێ(١).

لە سەرەتادا،فەلسەفەی سروشت هاتە کایەوەو یاسا گشتییەکانی سروشتی دارشت، لەگەڵ دەرخستن و دیارکردنی دیاردە جۆر بە جۆرو جیاوازەکاندا، ئەمە تا نیوەی سەدەی نوزدەیەم وەکو بەشێکی گرنگی

فەلسەفە مایەوە. ئیتر لە دوای ئەوەوە پەرەسەندنی زانستە سروشتیەکان بایەخی هێشتنەوەی ئەو جۆرە فەلسەفەیەیان نەهێشت، بۆ ئەوەی گشتێتی بەرهەمی تایبەتی زانستەکانی سروشت جێگەیان بگرنەوە سەبارەت بەوەی کە فەلسەفە هەمیشە ڕەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژی و بەرژەوەندی ئەم یا ئەو چین وبەشی کومەلاتییە..بۆیە هەمیشە گرنگی ئەدات بەتۆێژینەوەلەبنچینەی ژیانی کۆمەڵایەتی و هۆی گۆڕانەکان...لەپەرەسەندنی کۆمەلگەی مرۆڤ ئەکۆڵێتەوەو یاسا ئاراستەکەرەکان هەڵئەهێنجێ و دەری ئەخات:ئایا ئەو یاسایانە بابەتین،یاخود، بەخواستی خواوەندو هێزە غەیبییەکانەوە بەستراونەتەوە..هەروەها بایەخ ئەدات بەرۆڵیمرۆڤ لەکومەڵدا..بەدوزینەوەی مانای مێژوو و هێزە بزوێنەرەکان و ئاسوی پەرەسەندی کۆمەڵگەی مرۆڤ. بەفەلسەفەی مێژو ناو براوە و تا ئێستاکەش بایەخی تیۆری و پراکتیکی خۆی پاراستووە.

کۆن و تاڕادەیەك ئێستاکەش، مەسەلەکانی زانستی کۆمەڵایەتی(ژیانی کۆمەڵایەتی و یاساکانی،پەیوەندییە بەرامبەرەکان لەنێوان لایەنە مەتریال و گیانییەکانداو پەیوەندی ناو خەڵك هەی نێوان مرۆڤ و کۆمەڵ، زانستی ڕەوشت،پرنسیپەکانی ژیانی ڕەوشتی و یاساکانی،زانستی جوانیی، جوانیی چییە،پەیوەندی نێوان هونەرو واقیع چییە،هتد...)ئەمانە،لەناو مەسەلە فەلسەفییەکاندا دائەنرێن.

ئیتر لە کاتێکدا هەموو جۆرە بزوتنەوەیەکی مەتریال و یاسای گەشەکردنیان.بوون بە مەتریالی تایبەت بە زانینی سروشت، فیزیك و کیمیاو بایۆلۆجیی (زیندەوەرزانی) هەموو لایەنەکانی ژیاتی کۆمەڵایەتی و یاساکانی پەرەسەندن(ئابوری،سیاسی،زانستی رەوشت،زانستی جوانیی..هتد)ئەمانە مەتریالی زانستی کۆمەڵایەتییان پێك ئەهێنا.لەوکاتانەدا فەلسەفە بوو بەسەرچاوەی وەلامدانەوەی ئەو پرسیارانەی کە زیاتر گشتی تربوون لە دەربارەی بوون وزانین وپەرەسەندنی ری فەیلەسوفەکان بە درێژایی سەدەکان و ئەو فەلسەفانە.. ئەوەش خۆی بابەتی، مێژوی فلسەفە پێك دەهێنێ.

فەلسەفەی مارکسیزم- لینینزم لای وایە کەمێژووی فەلسەفەی شانۆی ململانێی بەردەوامی هەردوو بەشەکەی فەلسەفەیە واتە مەتریالیزم و ئیدیالیزم. بۆیە فەلسەفەی ئەم سەردەمە هەروەك دوو هەزار ساڵ لەمەوبە پێش سەربە لایەك بووە، بەلام ئەم لایەنگیرییەی مارکسیزم - لینینزم لە زانستییەکەی جۆێ ناکرێتەوە، چونکە بەرژەوەندی چینایەتی پرۆلیتاری شۆرشگێرو هێزە تێکوشەرەکانی تر لە پێناوی سۆسیالیزمدا، لەسەرەنجامی شیکردنەوەدا، لەگەل ناوەرۆکی بابەتیی پەرەسەندنی مێژویی تێکەڵ دەبێت و لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەو پەرەسەندنەدا تەواو دەگونجێت، بەم جورە مارکسیزم توانستی زانینی واقیع و یاساکانی و ئاسوی پەرەسەندنی بۆ ئەو هێزانە ئەرەخسێنێ. مارکسیزم لە لێکولینەوەی فەلسەفەکانی پێشوو،

لەهەلسەنگاندنیاندا پشت بەدیدی مێژوویی دەبەستێت و لینین فێری کردوین چون بریار لەسەر جێگەو پایەی ڕوناکبیران بدەین، بەپێی بەرهەمەکانیان، بە بەراوردکردنیان لەگەڵ پێش و ئینجا سەردەمی خۆیاندا، نەك لەگەڵ سەردەمی ئێستادا،((گیانی مارکسیزم و بەرنامەکەی وا پێویست ئەکەن کە هەر مەسەلەیەك:١-لەرووی مێژوییەوە.٢-لەرووی پەیوەندییەکانی لەگەڵ مەسەلەکانی تردا.٣-لەبەر ڕوشنایی تاقیکردنەوە مێژوییەکانی بەرچاو..لێی بکۆڵرێتەوە)).

کەوابو پرنسیپی مێژوی وا ئەخوازێ کە فەلسەفەی ئیدیالیزم فڕێ نەدرێتە لاوەو چاو لە ڕۆڵی و لە پەرەسەندنی فەلسەفی ئەپۆشرێو دەبێ ڕەگوریشەو ناکوکییەکانی دەربخرێ..چونکە خولقاوی ناو پروسەی زانینە. ئینگلس دەڵێت: ئیدیالیزم، لەراستیدا، شێوەیەکی هەلەیە لەشێوەکانی فەلسەفە بەلام هەلەیەك بوو هەر ئەبوو لەکاتی خۆیدا ڕوویدات و ئەنجامێکی حەتمی ڕێرەوی پەرەسەندنی زانین خۆیەتی.(٢)

سەرانی ڕێبازەکانی فەلسەفەی ئیدیالیزمی سەردەمیش لەتوماویزمی نوێو ئایدولۆژی گیانیی spiritualism و بەشەکانی تری فەلسەفەی ئیدیالیزمی بابەتی زیاتر هەڵوێستیان لە دیدی ئایینەوە نزیك کردووەو دەیانەویست، هەروەك ئەوانەی ئەیانەویست، فەلسەفە بخەنە ژێر ڕکێفی لاهوتەوەو مێژوی فەلسەفە ببەستنەوەبە مێژوی ئایینەوە..لەدژی فەلسەفەی مەتریالیزم بن و نکولی لەناوەڕوکی پێزەتیفی مێژوی

فەلسەفە بکەن.بەڵام جەوهەری بەرنامەی مارکسیزم بۆ مێژوی فەلسەفە لەوەوە دەست پێ دەکات کە فەلسەفە دوو ڕووی پێکەوە بەستراوی هەیە:یەکەم" ڕووی زانیارییەکە کەم وزۆر بایەخ بە زانیاری جیهانی ئەدات و هەندێ جاریش هەندێ ئەرکی زانست ئەگرێتە ئەستۆی خۆی.دووەم: ئایدولوژییە"کە فەلسەفە بەشێك لەپێکهاتنی سەرخانی ئایدیۆلۆ ژی پێك دەهێنێت..بۆیە ئەرکی فەلسەفەو مێژوەکەی، دەرخستنی پەیوەندی مەزەبەsckt و تەییار curentە*فەلسەفەییەکان بە: پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان و بە شێوەی بەرهەمهێنان و زورانبازی چینایەتی و بە پێشکەوتنی زانستەکان و بە شێوەکانی هوشیاریی کۆمەڵایەتییەوە..لە یەك سەردەمی دیار دا.

مارکسیزم–لینینیزم ،یاسا گشتییە دیالیکتیکییەکان، کەهەموو شێوەکانی پەرەسەندنی بوون وزانین بەرێوە ئەبەن و یاسا تایبەتییەکان کە لێك جیاکەرەوەی هەموو شێوەکانی هوشیاریکۆمەلایەتین لە گەلٚ یاسای چۆنایەتی پەرەسەندنی فەلسەفەو مێژووی فەلسەفە..بەو پێیە کە شێوەیەکی جیاوازە لە هۆشیاریی کۆموڵایەتی..جیاوازییەکانیان دەردەخات..ئەمانەش یاسای گشتی و تایبەتمەندەکانی گەشەکردن و پەرەسەندنی فەلسەفەن..یاسا دیالێکتیکە ناسراوەکانیش:بوونی گۆرانە چەندایەتییەکان بۆ چۆنایەتی، نەفی نەفی، یەکێتی ململانێی دژەکانن. بەستنەوەی هەموو جۆرە بیرێکی فەلسەفی تەنها بە بنکەی ئابورییەوە کارێکی هەلەیە چۆنکە

هەر چەندە پەرەسەندنی فەلسەفە بە بنکەی ئابورییەوە بەستراوە..
بەلام فەلسەفە هەروەك شێوەكانی تری هۆشیاریی كۆمەلایەتی(٢)،
جۆرە سەربەخۆییەكی نیسبی هەیە..لەمبارەیەوە ئینگلس
ئەلێت:((هەموو ئایدولوژییەك، هەر لەسەرەتای دەركەوتنییەوە..بە
بەستراوەیی لەگەڵ سەرجەم دیدە كۆمەلایەتییەكاندا پەرەئەسێنێت و
لەناو ئەوەدا هاوبەشی ئەكات لە ڕاستكردنەوەی ئایندەدا..))بۆ نمونە
زۆر جار بیری فەلسەفی پێش گۆرانە كۆمەلایەتییەكان ئەكەوێت، وەكو
دەركەوتنی مەتریالیومی دیالیكتیكی و مێژویی لە ناو هەناوی
سەرمایەداریدا..هەر چەندە بنچیەی تیوری ئایدولۆژی سوسیالیزم پێك
دەهێنن.

ململانێی چینایەتی هەر بەتەنها لە سیاسەتدا ڕەنگ ناداتەوەو بەس،
بەڵكو ئایدولوژیش ئەگرێتەوە.

لە مێژوی ئایدولوژیدا بە فەلسەفەشەوە بە شێوەیەكی یاسایی
پەرەسەندنی هۆشی كۆنەلایەتی لە ناو پەیوەندی دیالیكتیكیانەی نێوان
دۆخە نیشتیمانی و جیهانیەكاندا ئاشكرا ئەبن.

مێژوی فەلسەفەی ماركسیزم دژی ئەو بیرورا هەلانەی ئەو
فەیلەسوفانەیە كە ئەلێن، گەل هەیە هاوبەشی دەولەمەند كردنی
فەلسەفەو پەرەپێدانی كردووە و هەشە ئەو هاوبەشییەكی نەكردووە یا
هاوبەشییەكی كەمی كردووە كە شایانی باسكردن نییە...

زانستی مارکسیزم-لینینیزم کە هەمیشە ئەنترناسیۆنالیزم ڕێنمایەتی ئەیسەلمێنێت کە بیری فەلسەفی لە ڕۆژهەلات، و ڕۆژئاوادا وەکو یەك پەرەئەسێنێت و مەزەبە فەلسەفەییەکان کەلە ولاتە جیاجیاکاندا دەرکەوتوون، خودی مەسەلە فەلسەفییە بنچینەییەکانیان چارەسەرکردووە هەر یەکەیان بەشی خۆی هاوبەشی لە دەوڵەمەند کردنی بەرهەمی بیری فەلسەفەی جیهانیی کردووە.بەو جۆرە لە دژی ئەو بیرو تیوریانەش بووە کە دەڵێن تەنها ڕۆژهەلات مەلبەندی ڕاستەقینەی فەلسەفەیە..و گوایا هەموو فەلسەفەکانی تری خورئاوا، بەمەتریالیزمی فەرەنسی و فەلسەفەی کلاسیکیی ئەلمانی و تەنانەت بەمارکسیزمیشەوە لەوەوە داهێنراون.

سەبارەت بەوە کە پەرەسەندنی فەلسەفە وەکو شێوەکانی تری هۆشی کومەڵایەتی بە پەرەسەندنی لایەنی ئابوری کۆمەڵایەتی و گۆڕانەکانیانەوە بەستراوە..بۆیە مارکسیزم مێژووی زۆرانبازی چینایەتی بەم جۆرە دابەش کردوە:فەلسەفەی سەردەمی کویلەیەتی، فەلسەفەی سەدەکانی دەرەبەگایەتی، فەلسەفەی قوناغی گواستنەوە لە دەرەبەگایەتییەوە بۆ سەرمایەداری، فەلسەفەی سەردەمی پێش پەیدا بوونی مارکسیزم، فەلسەفەی سەردەمی سەرمایەداری پێش دەرکەوتنی مۆنۆپۆل، سەردەمی پەرەسەندنی بزوتنەوەی شۆرشگێرانەی پرۆلیتاریا، فەلسەفەی سەردەمی بینای سوسیالیزم و زۆرانبازی هەردوو

سستێمە جیهانیەکە:سۆسیالیزم و کەپیتالیزم و سەردەمی سەرکەوتنی کۆمۆنیزم.لەنێوان ئەو قوناغانەشدا پلەو ماوەی جیاجیا هەیە.

مێژوی زانستانەی فەلسەفە مێژوی بیری فەلسەفی ئەکات بەدوو بەشی سەرەکییەوە: یەکەم: مێژوی فەلسەفە لە پێش مارکسیزمدا.دووەم:مێژوی فەلسەفەی دوای دەرکەوتنی مارکسیزم.دیارە پەرەپێسەندنی ئنینیانەی مەتریالیزمی دیالیکتیکی و مێژویی لە سەردەمی ئیمپریالیزم وشورشی پرۆلیتاریادا و لە سەردەمی ململانێی دوو سستێمەکەو سەرکەوتنی کۆمۆنیزمدا، سەردەمێکی نوییە لەو مێژووە کەلینینیزمە.

## فەلسەفە لە قوناغە کۆمەلایەتیەکاندا :

### فەلسەفەلەکۆمەلگەی کۆیلەیەتیدا :

**ئەمیسر :**

ئاشکرایەکە کۆشك و هەرەم و پەرستگاکان و شارستانێتی کونی میسر، لەسەر شانی کویلە دروستکراون ودامەزران.لەسەرەتایی سێ هەزار سالەی پێش عیسادا سستێمی کۆیلەتی گەیشتە لوتکەی گەشەکردن..کشتوکال و ئاودێری و بینا دروستکردن، پێویستییان بەوە بوو کە زیاتر بایەخ بدرێت بە زانیاری..ئەم ڕووەوە مارکس ئەلێت:"پێویستی حیسابکردنی بەرزو نزم بوونەوەی ئاوی ڕوباری نیل..ئەستێرە زانیی لای میسرییەکانی خۆلقاند.(٤)

پێویستییە ئابورییەکان بایەخی دانانی سالنامەیەکی وردی هێنایەکایەوە کەلەسەربناغەی زانیار مانگ ڕۆژ وئەستێرەکان دانرا..ژیانی ئابوری لەمیسر لەسەرکشتوکالّ و مەڕومالات بەخێوکردن بوو، ئیتر ئەوی پەیوەندی بەوانەوە هەبوایە پێش ئەکەوت، ئاودێری، ئەستێرە زانی، حیساب وئەندازیاری و سالّنامە و سالّ دابەشکردن بە (٣٦٥) ڕۆژ چارەکی ڕۆژێك.هەروەها ئەفسانە ڕۆلّی خۆی بینی وبوو بە فەلسەفە زیاتر لەوەی بە ئایینی بمینێتەوە..زانیاری و زانست گەشەیان کرد، ململانێی نێوان کۆیلەو خاوەنەکانیان پەیدا بوو.نوسراوەکان لە

سـەر دەرخسـتنی گومـان لـە ڕاسـتیی بـیروڕا ئایینیـەکان کەوتنـە بوو..هەروەها دەربارەی ژیانی هەمیشەیی ئەو دونیا، گومان لە ڕەوایـی ئەو سستێمەی لە سەر زەبرو زەنگ دروست کراوە.. و لە بیروڕای چینی دەسەلاتدار بەمەبەستی پاراستنی دەسکەوت و پایـە و دەسـەلاتی دژ بەکۆیلە و شۆڕشەکانیان..بلاوئەبوونەوە.بۆیە بیری فەلسەفی لـە یەکـەم هەنگاوەکانی دا لە زانستی سروشت و فەلەك و ماتما تیـك لەلایـەك ، لـە ئەفسانەکانەوە لـە لای دووەم..دروسـت بـوو، هـەر چـەندە لەسـەرەتادا وەکو شێوەیەکی جیاواز لە شێوەکانی هۆشیاریی کۆمەلایەتی نـەبووە.. زۆر بەرهـەم دەربـارەی ئـایین نووسـرا..ململانێـی چـینایەتی بـەهێز بوو.جارجار یاخی بوونی چەکداریش ڕووی ئەدا.

**لە بابلیشدا:**

لەسـەرەتای سـێ هـەزار سـالەی پ.ع، سسـتێمی کۆیلەیـەتی گەیشـتە لوتکـەی پەرەسـەندن..پرۆژەکـان بەکۆیلـە دروسـت ئـەکران.بیری فەلسـەفی لـە ئەفسـانەکانەوە و لـەو هەوڵانەوەکـە خـەلك ئەیدا بۆ ئـەوەی لە دیـاردە سروشـتییەکان بگـەن سـەری دەرئـەهێنا، وردە وردە ئـەو ئەفسـانانەی باسـی ئەسـلی خوایـان ئـەکردو هـەنگاوە زانسـتییەکان و دیـاردە سروشـتییەکان، بۆنـە بنچـینەی زانیـاری دەربـارەی ئەسـلی جیهـان، مـانگ لای بابلییەکان"باوکی خواکان"بوو، ئەستێرەکانیش یەزدانەکانن و شـەوی تاریـك ڕوونـاك ئەکەنـەوە..بـەلام کـە خـۆر دێـت

دەیانکوژێنێتەوە، بۆیە خۆر سەرچاوەی تاریکییە، ئەو هێزەیە کە(جیهانی خوارەوە)جیهانی ناو جەرگەی زەوی بەرێوە ئەبات، بەلام مانگ دوای مردنی، زیندوونەبێتەوە بۆیە لای بابلییەکان نیشانەی ژیان و نەمری بووەو ڕووناکیشی هارگیز کوژاندنەوەی بۆ نەبووە.

دروستبوونی ململانێ کۆمەڵایەتییەکان بوونە هۆی دەرکەوتنی هەندێ نووسراو کەرای بڕوا نەبوون بەبیرورا ئاینییەکانی تیل دەرخرابوو: لەوانە ((دیالوگی نێوان کۆیلەو خاوەنەکەی-دەربارەی-مانای ژیان-بوو))ئەم نووسراوە گالتەی بەدیدو پرۆسە ئایینیەکانی دەکرد.

ئەو کورتە باسە مێژوویەی بیری فەلسەفی لە میسۆپۆتامیاو دۆڵی نیل، سەرەتاکانی بیری فەلسەفی و کۆمەلایەتی دەرئەخات..شوێنەواری ئەدەبی فیرعەونی، هەر چەندە لە شێوەیەکی سادەدا بووە-بەلام مەسەلەی بنچینەیی مەتریالی دیاردەکانی سروشتی خستوتە ڕوو.باسی ئاوی سارد ئەکات کە هەموو زیندەوەرەکانی لێوە دروست بووەو هەموو شتێك لەوەوە دێتە دەر...

بەگشتی بیرە مەتریال و بڕوا بە ئاین نەبووەکان، هەرچەندە لای میسری و بابلییەکان سادەو ساکار بوون..بەلام کاری خۆیان

کردە سەر پەرەسەندنی ئایینده‌ی زانست و بیری مەتریالیستی لەجیهانی کۆندا.

## فەلسەفەی کۆنی چین:

لە سەدەکانی ٨-٦ی پ.ع، لەگەل پەرەسەندنی کۆمەلگەی کۆیلەدا، دوو ڕێبازی بیری دژ بەیەك هاتنە کایەوە:کۆنپارێزو پێشکەوتن خواز، واتە غەیبی و مەتریالیستی.

ئایینی کۆنفۆشیۆس:ئەم ئایینە، کۆنفۆشیۆس(٥٥١-٤٧٩پ.ع)داینا، فرمانە ڕەوشتی وسیاسییەکانی جێگەیەکی درەوشاوەی لەمێژووی چینی کۆندا گرتووە، زۆر بەرهەم ئەگێرنەوە بۆ ئەو، لەوانە: پەرتووکی گۆرانی و، بەهارو پاییز.

ئەم ئایینە ئەلێت:ئاسمان سەرچاوەی سامان ودەسەلاتە.

کۆنفۆشیۆس ئەلێت:"هەموو خەلك لە ڕووی سروشتیەوە وەك یەکن بەلام لە ناو پەروەردەکردنیاندا ئەگۆرێن"."بۆ ئەوەی لە نوێ بگەین ئەبێ کۆن بخوێنینەوە و تێیبگەین.خوێندن و فێرکردن بەبێ بیرکردنەوە بێ کەلکن، بیر کردنەوەش بەبێ زانست بێکەلك و بۆشە".دوای کۆنفۆشیۆس زۆر جێگرو شاگردی هاتنە ئاراوە .لەو فەیلەسوفانەی کە دژی کۆنفۆشیۆس وەستان-میتزو-بوو، تیوریەکەی کە دەربارەی زانین بوو هەندێ بیری مەتریالی تیابوو، وەکو: زانین لە کۆلینەوەو لە ڕاستەوخۆی واقیع پەیدا ئەبێت، ئیتر زور زاناو فەیلەسوف هاتنە کایەوە

و لەپەرەپێدانی فەلسەفەی کۆنی چین رۆلیان وازی کرد، بەتایبەتی بیروراکانی-سن تزو-وقوتابخانەی-فیتشپا- و- فان تشون- بەو جورە لە ناو ململانێی مەتریالیزم و ئیدیالیزمدا، هەروەك فەلسەفەی ولاتانی تر، فەلسەفەی کۆن لە ولاتانی چیندا پەرەی سەند کە لە ناو ئەو رێرەوەدا..دۆخی مێژوویی تایبەت بە چین، مانەوەی نەریتی خێڵەکی و پاتریارەکی و سروشتی دواکەوتنی پەیوەندی کومەلایەتی کۆیلەتی، هۆی سەرەکی پالپێوەنەری خو تەرخان کردنی زاناکان بوو بۆ چارەسەر کردنی مەسەلە کومەلایەتی و رەوشتی و سیاسییەکان.

**فەلسەفەی کۆنی هیندی:**

ناوەراستی یەکەم هەزار سالەی پێش عیسا..سەرەتای دەرکەوتنی فەلسەفەی هیندی بوو، لەو سەردەمەدا سەرکردایەتی خێڵەکی براهماتییەکان فەرمانرەوا بوو، "راجاکان"سەرداری دەوڵەتۆکەکان بوون و پشتیان بە دەسەلاتی نوررووستۆکراتەکانی زەوی و خاوەن مولکەکان دەبەست، سستێمی پاتریارکی، رۆلی گرنگی لە پەیوەندیە کومەلایەتییەکاندادەبینی.ڤیدا-پەرتوکی زانیاری-کۆنترین شۆێنەواری ئەدەبی هیندییەکان بوو کە دەربارەی ئاین بوو.لە دوایدافەلسەفەی ئیدیالیزم ومەتریالیزم لەدوو رێبازدا سەریان دەرئەهێنا:کونپارێز کەبروای بە پیروزی" ڤیدا"بوو، کونە پارێزی کە بروای بەو پیروزییە نەبوو..زۆربەی ئەو قوتابخانانەی دەهاتنە کایەوە سەر بە رێبازی

یەکەم بوون، لەوانە:فیدانتا، نیایا..لە قوتابخانەکانی سەر بە ڕێبازی دووەمیش-بوزی-بوو کەلەنێوان سەدەی٦و٥ی پ.ع دا هاتە کایەوە.

بوزی.. یەکێکە لەئایینە جیهانییەکان. زیاتر لە ناو هەژاراندا. بڵاو بوەوە، هەرچەندە لە دواییدا دەسەلاتدارەکان توانیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاری بهێنن.ئەم ئایینە نەسەر ئەفسانەی میر(سیدهارتا)گاوتاما بۆزای پێغەمبەر دامەزراوە."ترپیتاکا"یەکەم سەرچاوەی فەلسەفی ئاینەکەیە مەسەلەکانی:

١-ژیان پرە لە ئازار. ٢- هویەك هەیە کە ئازاری پەیدا کردووە.
٣- لە تواناداهەیە کە ئازار بوەستێنرێت.. سەرچاوەی بیروڕاکانی ئەو ئایینە بووە. زانا هیندییەکانی ئەو سەردەمە وایان دەڕوانییە-زانین-کە ڕێگەیەکە بۆ ڕزگار کردنی مرۆڤ لە ئێش و ئازار، ئەمەش هەر لەسەر زەمین ئەکرێت نەك لە ئاسمان.. بڕوایان بەگیان نەبوو، بڕوایان بەگۆڕانی گشتی هەبوو، ئەوەی پێویستایە ببێتە مرۆڤێکی ڕەسیو، ئەبوو ببێتە خاوەنی هەشت چاکە کە: ڕەوشتی دروست و شێوەی ژیانی ڕاست و قسەی باش و مەبەستی چاك و دڵنیایی و بێزار نەبوون.. زەمینەی بوون.

نهێنی بڵاوبوونەوەی ئەو ئایینە تا گەیشتە چین و ژاپۆنیش.. ئەوەدا بوو کە ئایینی سەرفرازی بوو، هیوای ڕزگاری لەمێشکی هەژاراندا ئەچاند، بەلام هەروەکو ئایینەکانی تر هەوڵی نەداوەو نەیتوانیوە ڕەگ و ڕیشەی چەوساندنەوە لە ژیانی کومەلایەتیدا دەربکێشێت. سەرەنجام

ئەم ئایینە بووە چەند بەش و قوتابخانەیەك.. جگە لەوانە چەندین قوتابخانەی تر دامەزران، کەهەر یەکە سەر بەبەرەیەك بووە، بەلام مەزەبی پێگەیشتوانەی مەتریالیزم ـ بۆ ئەوە سەردەمە ـ فایشیشیکا ـ بوو سەدەی ٦، ٥ پ.ع، باس و قسەی ئەم ئایینە لەسەر: لێکدانەوەی واقیع و گەردیلەو گیان و لۆجیك و جەوهەرو وتەی گشتی و تایبەتی و.. هتد بوو.. ئیتر هێدی هێدی شێوەی ئایینیی ئاشکرا ترئەبوو.

## فەلسەفەی کۆمەڵگەی کۆیلەیەتی لەیۆنان و ڕۆما:

### لەیۆنان:

سەرەتای دەرکەوتنی فەلسەفە لەیۆنان لەشارو دەوڵەتۆکەکانیدا لەنێوان سەدەی ٧، ٦ پ.ع، لەرۆخی ڕۆژئاوای ئاسیای بچووك و ئینجا لەخوارووی ئیتالیاو لەدوایشدا لەئەسینادا.. بوو. لوتکەی گەشەسەندنی لەسەردەمی ئەسکەندەری مەکدۆنی جێگرەکانیدا بوو. تالەسەدەی شەشەمی دوا عیسا ڕوونـاکی نەدا. بەلام لە رۆمـای کۆندا..ئەو سەرەتایە لە سەدەی دووەم و یەکەمی پێش عیسادا بوو.لەو ساتانەدا شێوەی بەرهەمی کۆیلەیی لە یونان و ڕۆمادا گەیشتە لوتکەی گەشەکردن..ئیتر کاری کۆیلەکان بووە هۆی خۆشکردنی زەمینەی گونجاوی گەشەکردنی کولتور وشارستانیتی..بەسوود ودرگرتن لە شارستانێتی گەلانی کۆن.داستانەکانی هزیۆد و هومیرۆس و مێژووەکەی هـیرۆدۆت و شـانوگەری سـافۆکلیس و پەیکـەرەکانی فیـدی و

فەلسەفەکانی هیراکلیتس و دیوکریتس و ئەفلاتون و ئەرستۆو ئەبیقورو هتد...نیشانەی ئەو ئاستە بەرزە بوون کە شارستانێتی یۆنانی و ڕۆما پێی گەیشت..دیارە کۆیلە و کویلەیەتی سەرچاوەی ئەو پێشکەوتنانە بوون، هەروەك ئنگلس ئەڵێت: کویلەیەتی نەبوایە نە دەوڵەتی یونان و نە هونەری یۆنانی و زانستی یۆنانی و هەتا خودی ئیمپراتورێتی ڕۆماش نە ئەبوون(٥).

یۆنانییەکان زیاتر بیروڕای فەلسەفی گەلانی بابل و ئێران و میسری کۆنیان وەرگرت، بەتایبەتی لە بابلیەکان زانستی ماتماتیك و فەلەك و جوگرافیا و سستێمی پێوان و سەرەتاکانی جەبرو ئەندازیارییان وەرگرت، فەلسەفەی یونانی ڕۆڵێکی گرنگی لە پەرەپێدانی فەلسەفەی جیهانیدا بینی.

مارکس و ئنگلس ئەڵێن:ئەو فەلسەفەیە "لەڕووی مێژوویییەوەی ئەم شێوەی دیالیکتکیە لە لێکولینەوەی ئەم فەلسەفەیەدا دەرئەکەوێت کە چۆن هەردوو ڕێبازی ئیدیالیزم و مەتریالیزم و ململانێی نێوانیان و پەرەسەندنی فەلسەفە لە ناو سەیرکردن و تێروانینی ئەفسانەوە هاتنە ئاراوە.

سەرەتای فەلسەفەی مەتریالیزم لە مەلاتییەی ئاسیای بچوك هاتە کایەوە، هەر لەو کاتانەوە بۆ فەیلەسوفەکان دەردەکەوێت کە هیچ شتێك مردوو نییە، هەموو شتێك گیان لەبەرەو ئەجولێت، زۆر تێبینی و

پێشبینی و تێگەیشتەی فیزیکی و بایۆلۆجییان دارِشت، زۆر دیاردەی میتۆرلۆگیا پێش بینی کرد.

"تالیس" یەکەم فەیلەسوفی مەلاتیا بوو کەپراکتیك و کۆلێنەوەی قولی سروشتی پێکەوە گرێداو لەبازرگانییەکەیدا زۆر زانیاری کۆکردەوە، کەلکی لەزانستی بابلی و میسرییەکان وەرگرت. بەلام خۆی دوای پێشبینییەکەی لە ڕۆژگیرانەکەی ٢٨ی ئایاری ساڵی ٥٨٥ پ.ع دا، ناوبانگی دەرکرد. بۆچوون و باری سەرنجی زیاتر مەتریالیستانە بوو، ئەیووت هەموو شت لەمەتریالێکی شێدارەوە، یاخود لەئاوەوە پەیدا بووە، زەمین لەسەر ئاوە، ئەم جیهانە پڕە لەیەزدان، زۆر هەوڵی دا جێگەی ڕۆژو مانگ و ئەستێرەکان دەستنیشان بکات. دوای خۆی قوتابییەکەی "ئەناکسمیندری" بایەخی دا بەجۆری دروستبوونی کێنیی، لەجوگرافیاو سروشتەوە هەنگاوی ناو دەستی کرد بەزانیاری کۆکردنەوە دارشتنی فەلسەفییانەیان. یەکەم کەس بوو نەخشەی ئەرزی دروست کرد، ڕای زۆری لەسەر ئەستێرەوانیی هەبوو. ئەیووت: مەتریال سنووری بۆ نییە. لای وابوو لە دروستبوونی گێتیدا، لەپێشدا هەواو ئاو ئینجا ئەستێرەو وشکانی دروست بوو.. کە ئاژەڵ دروست بوو پێستی دڕکاوی هەبوو، کەهاتە سەر وشکانی ئەو پێستەی فڕێ دا.. مرۆڤ لەناو سکی ماسیا ئەژیا، کە گەورەو خورت ئەبوون ئینجا ئەهاتنە دەری بۆ سەر وشکانی و ئەوسا شێوەو ڕوخساریان ئەگۆڕا. لای وابوو، هەوا سەرچاوەی ژیان و دیاردە ئەدروونییەکانە..

ئەم بیرو بۆچوونانەی شاری مەلاتییە بەشارەکانی تری یۆناندا بڵاو بوونەوە، "ئەکسانوفان" یەکێکە لەو فەیلەسوفە بەناوبانگانەی کە گاڵتەی بەهەبوونی چەند خوایەك دەکردو ئەیگوت خەڵك خۆیان دروستکەری خواکانن بەپێی شێوەو ڕوخسای خۆیان. لەیەکەم کەسانێ بوو کەبڕوای بەیەکێتی هەبوونی مەتریال بوو، جیهان لای ئەو نەمرەو ڕزینی بۆ نییە ئەمەش ئەو خوایەیە کەلەگەڵ هەموو شتێکدا جووت ئەبێ و یەك ئەگرێ.لە دوایدا"فیساغورس"٥٨٠–٥٠٠پ.ع، یەکێتی فیساغورسییەکانی لە شاری ئەفروتون پێکهێنا.ئەم یەکێتییە ئایینی بوو.سەبارەت بەوەی هیچ نوسراوێکی ڕاستەوخۆ لە خویەوە نەماوە و قوتابییەکانیشی زۆر شتیان بە دەمەو هەڵبەستووە.. بۆیە زانینی ڕاو بۆچوونەکانی، وەکو خۆیان، زەحمەتە.بە گشتی بیروڕا ئایینی و ڕەوشتی و سیاسی و باری سەرنجی فەلسەفی و بۆچوونەکانی، زانستی بوون.. خۆخەریککردنی بە حیساب و ئەندازیارییەوە کاری کردە سەر بیرە فەلسەفییەکانی..مەزەبەکەی لە تێڕوانینی ئەفسانەو خەیاڵ تێکەڵ وبیروڕای ئیدیالیزمیش لەرای فیساغورسییەکاندا بەدی ئەکرێ.

## سەرەتای دەرکەوتنی دیالیکتیک و میتافیزیک.

هیراکلیس: زەمینەی مەزەبەکەی ئەم فەیلەسوفە لەو سەرچاوەوەیە کە دەڵێ: دروستبونی هەموو شتێك لە مەتریالەوەیە.ئەیوت:((ئەم جیهانە بۆ هەموو شتێك وهەموو بوویەك هەر هەمان جیهانە، نە یەزدان و نە هیچ کەسێك دروستی نەکردووە، بەڵکو لەمەوبەرو ئێستاکە و لە پاشە رۆژی بێ کۆتایشدا ئاگرێکی لە کوژاندنەوە نەهاتووە بەبڕ بەردەوام ئەبێ و هەر بەبڕیش ئەکوژێتەوە)).

لینین دەربارەی ئەم واتایە ئەڵێت:(٧) دەرخستنێکی سەرکەوتوانەی دیالیکتیکە. بۆیە هیراکلیس بەیەکێك لە دانەرەکانی دیالیکتیك دائەنێت. یەکێك لە خەسلەتە سادەو سەرەتاییەکەی دیالیکتیك لای ئەم فەیلەسوفە ئەوەیە کە: بڕوای بە لێکدانەوەی بەردەوامە بۆ هەموو بوویەك و بڕوای بە بوونی ململانێیە لە نێوان سەرەتا دژەکاندا وەك هۆیەك بۆ گۆران. لای وابو ((ململانێ باوکی هەموو شتێکە و گەورەی هەموو شتێکە)) لە ململانێی دژەکاندا یەکێتی ناو خۆییان دەرئەکەوێت، ئەمرەکان لە ناو ئەچن و لە ناو چووەکانیش زیندوو دەبنەوە وژیانی هەندێك مردنی هی ترە.لێرەدا چاك وایە جۆری رێکخستنی گواستنەوەی شتەکان بۆ دژەکانیان سەرنج بدەین((ئاگر مردوویی خۆڵ ئەژێنێتەوە، هەوا مردویی ئاگر ئەژێنێتەوە، ئاو مردویی

هەوا ئەژینێتەوە، خۆڵ مردویی ئاو ئەژینێتـەوە وئـاژەڵ مردوویـی ڕوەك ئەژینێتەوە، وە مرۆڤ مردوویی هەردوكیان ئەژینێتەوە)).

هێراكلـیس نیسـبییەتی سـیفەت بـە چـەند تاقیكردنەوەیـەكی هەڵهێنجراوی نا بینینی مرۆڤ و ئاژەل ئەسەلمێنێ"ئەگەر ئیختیار بدرێتـە دەست كەر ئەوا جۆ هەڵئەبـژێرێ نـەك ئـاڵتون"ئەمـەش مانـای وایـە كـە نرخی ئالتون نیسبییەو هەر بۆ مرۆڤ بە نرخە، ئاوی دەریا باشترین ئاوە بۆ ماسی و ناساز ترینە بۆ مرۆڤ چونكە بـە كـەڵكی خواردنـەوە نایـەت، ئیتر بە هەمان شێوە لە شێوەكانی ڕەوشت وجـوانیی و چـاكەدا هـەمان پێوانەی نیسبییەتی هەیە.بەگشتی ڕا ئەرستۆكراتەكانی، هەندێ بـیری پێشكەوتوانەیان تیا بووە.

لـە سـەدەكانی ٦و٥پ.ع، مەڵبەنـدەكانی پەرەسـەندنی بـیر لـە یونانەوە گوێزرانەوە بۆ خوارووی ئیتالیا كە زیـاتر كشـتوكاڵ و خـواردن دروسـتكردنی تیـا بـاو بـوو. بۆیـە ئـایین كـارێكی گـەورەتری كـردە سەرفەلسەفە و فەلسەفەش زیاتر ئیدیالیستی بوو. لەشاری""ئیلیـادا"" بارمینـدسـی فەیلەسـوف و زینـونی قوتـابی ژیـاوە–٤٩٠–٤٣٠پ.ع– بارمینـدس دژی ڕاكـانی هێراكلـیس بـوو.جیهـان لای ئـەم فەیلەسـوفە تۆپێكی مەتریال وپێكەوە بەستراوو بێ بۆشاییە تا ئەگاتە تەماشا كردن لە بزوتنەوە، دەركـەوتن، مـردن لـە گێتیـدا. ئـەڵێ: لەبـەر ئـەوە گێتـی، یەكە، بۆیە نەبەش و نەزۆری تیا نییەوە ئەوەش كـە بەچـاو بـەو جـۆرە ئەبینرێ لەهەڵخەڵەتاندنی هەستەكان زیاتر هیچـی ترنییـە.. بـەو جـۆرە

بارمیندس ئەگاتە ئەو مەڵبەندەی کەنکوڵ لەو جوڵەو، دەرکەوتن، و لە ناوچوون بکات، تێگەیشتەی میتافیزیکی بۆ هەبووی یەقینی وای لێ کرد کە بێ بڕواو باوەڕ بێت بەرامبەر بەتابلۆی جیهان.

بەڵام - زینۆن - ی قوتابی.. بەرپەرچی دایەوەو ئەرستۆ (سەدەی چواری پ.ع) ناوی لێنا "پێشەنگی دیالیکتیک" کە ئەوەش لەو سەردەمەدا مانای "هونەری گەیشتن بوو بەیەقین".. بەهۆی دەرخستنی ناکۆکییەکانی ناو قسە دژەکانەوەو ئینجا نەهێشتنیان، بەڵام ناوبراو بەمانای سەردەم دیالیکتیکی نەبوو.

## مەتریالیزمی سەردەمی پەرەسەندنی دیمۆکراسیی کۆیلەیەتی.

لەناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی پێش عیسادا، مەڵبەندی بیری فەلسەفی گوێزرایەوە بۆ ئەسینا، دوای ئەوەش لە کۆتایی ئەو سەدەیەدا هێرشی فارسەکان وەستێنراو شکێنرا جێگەی ئابووری و سیاسی پتەوبوو.

"برکلیس" ئەناکساغۆری - ٥٠٠ - ٤٢٨ پ.ع - لەخۆی نزیک کردەوە. بەڵام دوژمنانی دیمۆکراسی کۆیلەیەتی بەخوانەناس تاوانباریان کرد چونکە ئەیووت (ڕۆژ - تەنێکی مەتریالە) ئیتر بەناچاری ئەسینای بەجێ هێشت و لە (لامباسکی) ئاسیای بچوک جێگیربوو، هەر لەوێش مرد. ئەم فەیلەسوفە لای وابو کە جیهان هەر یەکەیەکی غەریب نییە لە زۆری و جیاوازیی و بەس، بەڵکو لەژمارەیەکی بێ سنور لە (تۆو) پێک هاتووە، واتە لەوردیلە، کەبێ ئاکام بەسەر خۆیاندا دابەش ئەبن. هەموو بوونێک

بەشێکی بوونێکی تری تیا هەیە، هەروەك چۆن: تووك و نینۆك و دەمارو ئێسقان و بۆڕی خوێن لە (تۆو) دان، هەر بەو جۆرە شت لەناو یەکتردا هەن.. ڕەش سپی و سپیش ڕەشی تیایە، قورسی سوکایی تیایەو سوکاییش قورسی تیا هەیە.. هتد، هانی خەڵکی ئەدا بۆ تێگەیشتنی ئەفسانە ئایینیەکانی ناو شیعرەکانی هۆمیرۆس، چونکە لای ئەو نموونەی مانای چاکەو یەکسانین.

بەگشتی بیروڕاکانی ناوبراو دەسکەوتێکی گەورەی فەلسەفەی مەتریالیزم و زانستی سروشت بوون. لەسەر دەستی ئەم و ((ئەنبا دۆقلیس)) فەلسەفەی مەتریالیزم هەندێ شێوەی دەرکەوتوی وەرگرت، کەلەوەو بەر بەر جۆرە ئاشکرا نەبووبو.

**سوفسەتایی sophists**

لەسەدەی پێنجەمی پ.ع لەزۆر لەشارەکانی یۆناندا، سستێمی دیموکراسی کۆیلەیەتی جێگەی دەسەڵاتی ئەرستوکراتیی کۆنی گرتەوە، لەگەڵ ئەم گۆڕانەدا هەندێ دامودەزگای هەڵبژێردراوی وەك ئەنجومەنی میللی هاتەڕوو کە لەزۆرانبازی نێوان چین و پارتی دانیشتووە ئازادەکاندا ڕۆڵکی گرنگیان وازی کرد. مشتومڕی سیاسی و یاسایی بووبەباو سەبارەت بەوەی کەزانین هێشتا دابەش نەبووبو بەفەلسەفی و زانستی تایبەتی، لەبەر ئەو پایەیەی فەلسەفە لەناو ڕووناکبیراندا هەیبوو.. بۆیە مامۆستا نوێیەکان هەر بەوەوە نەوەستان کەزانیاری سیاسی و یاسایی بەخەڵك ڕەوان بکەن، بەڵکو ئەو جۆرە زانیاریانەیان

ئەبەستەوە بەباوەڕو مەسەلە گشتییە فەلسەفەییەکانەوە، ئەمانە بەسوفسەتایی ناوبران. واتە ـ زاناکان ـ حەکیمەکان ـ مامۆستای زانیاری. لەدواییدا نووسەرانی دژ بەم ڕێبازە پێیان دەوتن سوفسەتاییەکان نایانەوێ بگەنە ڕاستی، بەڵکو ڕای درۆ ئەچەسپێنن و پشتگیری لێ دەکەن، ئەم وەسفەش خاڵی نەبوو لەڕاستی، چونکە زیاد لەپێویست سروشتی نیسبییان ئەلکاند بە هەموو زانینێکەوە، تەنانەت حاشایان لەهەق و ناهەق، لەخێرو شەڕ ئەکرد، شانازییان بەوەو ئەکرد کە ئەتوانن لەیەک کاتا لایەنگیری ڕایەک بن و دژایەتیشی بکەن. لەڕاستیدا ژمارەیەک لەفەیلەسوفەکانی ئەم فەلسەفەیە ڕوناکبیری گەورەو زانا بوون، بەڵام تێندێنسی خۆیەتی وای لێ کردن کەنکولی لەزانستی شت بکەن و بەرەو خۆیی بیانبات. لینین دەڵێ "فرمانەکانی گورگیاس، بۆ نمونە هەر تەنها نیسبیی نین و بەس بەڵکو هەروەها گومانیشن ـ بۆیە سوفسەتاییەکان ـ هەر چەندە هاوبەشییان لە دانانی دیالێکتیکدا کرد بەڵام هەندی جار هەوڵیان ئەدا فرمانی بێ بڕوباوەڕی و نەبوونی پەتی دابڕێژن، کە ئێستا بەسوفسەتایی دەناسرێت" (٨).

**سوکرات ٤٦٩ ـ ٣٩٩ پ.ع:**

یەکەم فەیلەسوفی گەورەی یۆنانی کۆن بوو کەڕێگەی خۆش کرد تا ئیدیالیزمی بابەتی بێتە ئاراوە. خۆی پەیکەرتاش بوو. لە ئەسینا نیشتەجێ بوو، گەلێ قوتابی لەدەوری خۆی کۆکردەوەو دەستی کرد

بەرەخنەگرتن لە دیموکراسیەکەی ئەسینا.. بۆیە فەرمانڕەواکان ڕقیان لێ هەڵگرت و بەتاوانی خراپکردنی بیری لاوان بەهۆی بیروباوەڕی ئاینی ئازادەوەو نکوڵی کردن لەخوای کۆن و شتی تر ووتن.. درا بەدادگاو لە ئایاری ٣٩٩ پ.ع دا بەکوشتن بڕیاری لەسەر دراوو دەرمان خواردیان کرد کوشتیان.

سوکرات هیچی نەنووسی، بەڵام قوتابی و هاوسەردەمەکەی: ئەکسانۆمان و ئیفلاتون و ئەرستۆ.. زۆر لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە کە دەبێت بەچاوێکی رەخنەگرانەوە سەیریان بکرێت. بۆ ئەوەی لەسوکرات بگەین دەبێ بەوردی لەو نووسیانە بکۆڵینەوە.

لەبەر ئەوەی سوکرات لەسەردەمی سوفسەتایەکانا بوو، بۆیە چەند رێگەو شوێنێکی لەوانەوە وەرگرت، هەر چەندە خۆشی دژیان بوو. بۆچوونی سوکرات خاڵی نەبوو لە گومان و تێندینسی گومانی.

لای سوکرات رۆڵی فەلسەفە ئەوە نییە کە: سەیری سروشت بکرێت و لێی بکۆڵرێتەوە، بەڵکو فێری کردنمانە کە چۆن بژین، بۆیە بەرەنگاری زاناکانی سروشت بووەوە. بڕوای وابو کە دەسەڵاتی مرۆڤ لە سنوری دەرووندایە، نەك سروشتی دەرەکی یا جیهان، بەو جۆرە زانینی راست رەواناسینی دەرونە، کاری سەرەکی زانینیش ناسینی خۆیە "خۆت بناسە". سوکرات رای وابو کە مرۆڤ خراپە ناکات، ئەوەی ئەیکات لەسنووری زانیاریدایە و لەڕووی چاکە و خێرەوەیە ئەگەر بزانێت خراپەیە وا نایکات، کەس بە ئارەزووی خۆی خراپە ناکات، نەزانی و

لادان سەرچــاوەی خراپــەن. بــەو پێیــە ســوکرات لەفەلســەفەکەیدا ئیدیالیست بوو، ئەم بیروڕایانـەی سـوکرات لەسـەر دەسـتی "نوێنـەرانی قوتابخانـەی سـوکرات" میگارێـە، ئیلدێـە، ئیرترێـە - پاکەلبێیـە - دا پەرەیان پێدار. هەروەها ئیفلاتونیش لەلایەنگرانی بوو.

**دیموکراتیوس**

شـێوەیەکی نـوێ لـە شـێوەکانی فەلەسـەفەی مـەتریالیزم و مەتریالیستی گەردیلەیی لەسەر دەستی "دیموکراتیـوس" هاتـە ئاراوە. ئەم زانایە دەرکەوتووترین فەیلەسوفی ئـەم مەیدانـە بـوو، سـەردەمی دیموکراتیوس سەرەتای سەدەی چوارەمی پ.ع بوو. سەفەری زۆری بـۆ ولاتـانی ڕۆژهـەڵات کـرد، هاوبەشـییەکی زۆری لـە: زانسـت و هونـەرو فەلەسەفەو لۆجیـك و زانسـتی دەروون و ڕەوشـت و زمـان و ماتماتیـك و فیزیـك فەلـەك کردووە. ئـەم ڕێبـازەی دیموکراتیـوس، ژیـان و دەرونـی مرۆڤیشی دەگرتەوە، هەروەکو فەیلەسوفە ئیدیالیستەکانی پیش خۆی، پەیدا بوونی زینـدەوەری ئەگێڕایـەوە بـۆ بـوونی هەلومـەرج و فـاکتۆری سروشتی بێ مەبەست و بێ هۆی جیاوازکەر. لای وابـو گیـان لەگەردیلـە لـە (ئـەتۆم) پێـك دێـت، کـەژیان و مردنـی زینـدەوەر ئەگەڕێتـەوە بـۆ یەکگرتن و جیابوونەوەی گەردیلەکان.

تیۆرییە مەتریالیسـتییەکەی دیموکراتیـوس دەربـارەی زانـین لەگـەڵ تێگەیشتنی مەتریالیستانەی بۆ سروشت ئەگونجا.

هەست لای ئەم سەرچاوەی زانین و بناغەیەتی، کەنەك هەر نمونەی مەتریالی ئەنجامکردەی شتەکانی ناو هەستەکان ئەبینێ و بەس بەڵکو هەروەك وێنەی گواستراوەی خودی شتەکان ببینن لەڕێگەی ئەندامەکانی هەستی دەرەکییەوە ئەچنە ناو لەشی مرۆڤەوە، ئەم وێنانەش مەتریالن لەتەنەکان دەبنەوەو ئەبنە گەردو لەناو هەموو بۆ شایی ئاسمانا بڵاو ئەبنەوە، کە دەگەنە ئەندامانی هەست، لەڕێگەی کونەکانیانەوە دەچنە ناویانەوە خۆ ئەگەر وارێکەوت کەقەبارەی کونکەو شێوەکەی لەگەڵ وێنەی شتەکان کەلێیانەوە دەچنە ژوورەوە، یەك کەوتن واوێنە هەستییەکان بەشێوەیەکی ڕاست شتەکان عەکس دەکەنەوە. بەو جۆرە وێنەی هەستی بنچینەی زانین پێك دەهێنن. بەڵام هەندێ شت و خسڵەت هەن بەهۆی بچوکییانەوە، بەهەشت دەرك پێناکرێن، بەڵکو تەنها بەئەقڵ دەرك پێدەکرێن لەگەڵ ئەوەشا ئەو دەرك کردنە ئەکرێ یەقینی بێت.

ئەم فەیلەسوفە گەلێ مەسەلەی تری وەك: جودا کردنەوەی واقیع و مەزەنە لەیەکتر، مەسەلەکانی لۆجیك و پەیوەندی بەتیوری زانینەوەو بەکارهێنانی ڕێگەی لەیەك چواندن Analogy و هتد.. هێنایە ئاراوە.

بەڵام لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بایەخی بەدیاردە کۆمەڵایەتییەکان داو لای وابو کەسیاسەت گرنگترینی هونەرەکانە.. و ئەرکی گەورەشی مسۆگەر کردنی بەرژەوەندی گشتی خەڵکە. لەژێر سایەی دیموکراسیی کۆیلەیەتیدا.. لایەنگیری گەرمی ئەم جۆرە دیموکراسییەتە

بوو: "هەژاریی ژێر سایەی دیموکراسی لەژیانی بەناو خۆشیی ژێر سایەو سێبەری قەیسەرەکان باشترە". گرنگی دا بەدابەش کردنی کار، بەچالاکی بەرهەمهێنان و بەدەوڵەت و.. هتد. لای ئەم ئامانجی گرنگ ژیان بوو کەئەبووت ئەبێ بەیاساو پرنسیپ بپارێزرێت بۆ ئەوەی هێمن و بێ کەدەربێت. لای وابو کەمەرجی پێویست بۆ ژیان.. دابەشکردنی ئیشە، دیارە ئەمەش دیدی خاوەن کۆیلەکان بوو. لەڕووی ڕەوشتەوە، لای وابو کە لەزەت وەرگرتنی ڕاستەقینە لەژیان، لەهێمنی دەروون و ئارامیدایە. ئەمەش بەخۆگونجاندن لەگەڵ سروشتا پەیدا ئەبێت، بەکار ئەنجامدان و خۆبەستنەوە بەسنوورێکەوە لەهەموو شتێکداو بەئازایەتی دەروون و جورئەتی بیرکردنەوە دێتەدی، تاکە ڕێگەی گەیشتن بەوانە هەر خوێندنە، لاشی وابو کە خوێندن لەپەروەردە جودا ناکرێتەوەو بێ ئەو زانیاری و هونەر بەدەست نایەت.

تائەو کاتەش ئەم بوو کەمەزەبێکی مەتریالی کامڵی داناو ناو خاوەنەکەی بەدرێژایی سەدەکان ئەمر کرد. فەلسەفەی دیموکراتیوس مەنگاوێکی مەزن بوو بۆ پەرەسەندنی مەتریالیزمی یۆنانی.. خاوەنەکەی شیاوی ئەو نازناوە بوو کەلینین لەڕێبازە مەتریالیستەکەی ناو لەناو فەلسەفەی یۆنانیدا بە "هێڵی دیموکراتیوس"، واتە بەناوی خۆیەوە ناوی ئەبرد. ئەوەشی دوپاتی کردەوە کە فەلسەفەی مەتریالیزم، بەڕادەیەکی گەورە، لە قوڵی و ڕوونی و هێزی سەلماندن، لەلایەن دیموکراتیوسەوە چارەسە کرا، مارکس و ئەنگلس(٩) بەزانایەکی

ئـەزموونی و یەکـەم ئـەقڵی ئینسـکلۆپیدی یۆنـانی کۆنیـان دانـا. بۆیـە تەنانەت لەسەدەی نۆزدەیـەم و بیستەمیشـدا ئیدیالیسـتەکان هـەروەکو دوژمنێکی زیندوو هێرشی توندو تیژیان کردۆتە سەر.

**ئەفلاتون ٤٢٧ ـ ٣٤٧ پ.ع:**

تاسەدەی پێنجەمی پێش عیسا مەتریالیزم بەرێبازی بنچینەیی باوو، لەناو بیروڕای فەلسەفەی یۆنانیدا مایەوە لەباسەکانی لۆجیکدا ئەفلاتون زیتر بایەخی داوە بەم باسانەی خوارەوە:

١ـ ڕێگەی زانینی مەزەنە کردن: ئـەفلاتون بـەم بەشـەی کۆلینـەوەی لۆجیکی وتووە "دیالیکتیك" وە دانراوەی "تۆپۆی" "TOPOI" ((ئەم بـاری سـەرنجە گشـتیانەی کـە حوکمـە مەزەنـە کراوەکـانی لێـوە پـەرە ئەسەنێت))ی بۆ تەرخان کردووە.

٢ــ بایەخـدان بەهــەردوو ڕێگــەی بنچـینەیی مەزەنــەو یــەقین ـ پێناسکردن و سەلماندن ـ وەك یەك.

٣ــــ مەســـەلەی ڕێگـــەی دۆزینـــەوەی پایـــەگاکانی زانـــین ـ INDUCTION ـ استقرا.

ئەفلاتون هەر دانەری زانستی دەروون نیەو بەس، بەڵکو هی زانسـتی چـالاکیی دەرونیشـە، نامەکەشـی ((لەدەرونـدا)) بێگومـان، بـەنرخترین دانراوەکانێتی. تیایا لە کێشەی دەروون و دیاردەکانی و دەرك و زەیـن، دەکۆڵێتــەوە. لای ئــەم ئــەقڵ بەشــێکە لــەدەروون کــە بەپێچـەوانەی

بەشەکانی ترەوە مردن و ڕزینی بۆ نییە، بەڵام قسەکانی دەربارەی دەروون و ئەقڵ.. بێ تەمومژ نین و وای لێ کرد جێگەی بگرەو بەردەش بن. لەگەڵ ئەوەشدا ڕێبازی دیالیکتیکی پێوە دیارە.

دەربارەی ڕەوشت و گەردوون گەلێ بیروڕای دەرخستووە. بەڵام بیروڕا سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان و دیاردەکانی بەقوڵی دەرخستووە. مارکس ئەڵێ: ئەفلاتون جگە لە شیکردنەوەی دیاردەکانی سروشت و کۆمەڵ و شێوەکانی بیر، یەکەم کەسێ بووە کەلەشێوەی "بەها" کۆڵیوەتەوە(١٤) . هەر چەندە پەیوەندییە کۆیلەتییەکانی ئەو سەردەمە توانستی بینینی جەوهەری ڕاستەقینەی دیاردە ئابوورەییەکانی لێ شاردبۆوە لەگەڵ ئەوەشدا: توانینی نرخی ئاڵوگۆڕی شمەك نرخی وەك یەکیان ببینێت. ئەفلاتون لەراکانیدا دەربارەی دەوڵەت پشتی بەدەستووری ١٥٨ دەوڵەت لەشارەکای یۆنان بەستووە. کە قوتابییەکانی، لەساڵی ١٨٩دا کۆیان کردەوە، یەکێك لەو دەستوورە دۆزراوانە دەستووری ئەیسنا بوو. ڕاکانی ئەفلاتون دەربارەی چینە کۆمەڵایەتییەکان و شێوەکانی حوکم، گرفتی کۆمەڵگەی کۆیلەتی لە ئەسینادا دەردەخات، ڕەنگدانەوەشە بۆ سەرەتای داتەپانی چینی خاوەن کۆیلە. لای ئەفلاتون ددسەڵاتدارێتیی خزمەتگوزار بەگەڵ: پاشایەتی، ئەرستوکراتی و بولیتیا (واتە فرمانڕەوایەتی چینی ناوەڕاست)یە بەڵام خراپەکانیان: زۆرداری، ئۆلیگارکی و دیموکراسی لاتنگیرە.

ئەفلاتون ئەیووت: "بیرەکان" هەرەمێکن.. لەسەرو هەموویانەوە "ئیدیە"ی خێرە، ئەم "ئیدیە"یەش سەرچاوەی هۆی بوونی شتەو مەرجی زانینێتی و هەر ئەمیشە ماهییەتەکەی ئەداتێ..لێرەدا فەلسەفەکەی ئەفلاتون سروشتی مەبەستیی telelogy وەرئەگرێ.

ئەفلاتون ئەیووت:جیهانی شتی هەستیی جیهانی ڕاستەقینە نییە چونکە شتی هەستپێکراو لە گۆڕان وجوڵەی هەمیشەییدایە،دروست ئەبێ و ئەڕزێ،هیچ شتێکی یەقینی و نەگۆڕی تێدا نییە.بەڵام ماهییەتی ڕاستەقینەی شتە هەستپێنەکراوەکان، لە مەتریال بێبەرین،تەنها بەئەقڵ دەرك ئەکرێن و جیاکەرەوەن،فەیلەسوف پێی ئەڵێ (بیرەکان)یان بێهاوتاکان(مپل)...

بەشێکی تیورییەکەی ئەفلاتون وا بنیات کراوە:هەبوون خۆی ناکۆکی تیایە،خاوەن دژەکانە: یەکێکە و زورە نەمرە ونەمرێ، نەگۆڕێ، ئەبزوێ و نابزوێ. بەڵام ناکۆکییەکان بەتەنها لە ڕا مەزەنەکراوەکانا دەرئەکەن کەلە بەشی خوارووی گیانا دروست دەبن، لەگەڵ ئەوەشدا مەرجێکی پێویستە بۆ ماندانی دەروون کەبیر بکاتەوە. بەڵام هونەرێ کە ماندەری بیرکردنەوەبێ بەرێگەی دەرخستنی ناکۆکییەکان، لەدیدی ڕۆژانە یاخود ڕامەزەنەییەکانە، ئائەوە "دیالیکتیکە".

لە کۆسمۆلۆژیدا - زانستی پێکهاتنی کەون - لەژێر کارتێکردنی فیساغۆرسییەکاندا ئەفلاتون بەردەوام ئەبێ و دووبارەی دەکاتەوە کەیەکەم سەرەتاکانی هەموو شتەکان لەسێگۆشە پێکهاتوون و دابەش

نـابن، یـان گەردیلـە هەندەسـیین و لەمـەتریال بێبـەرین، ڕا "کـەون" یـەکانیش لـەبیری گیـانی جیهـانیی و گیـان چوونە لەشـێکی تـرەوە ـ تەناسـوخی گیـان ـ بنیـات دەکـات و ئـەڵێت: زۆریـەی خـەڵك بـەتوانای تایبەتی خۆیان ناتوانن بەکەماڵ بگەن، بۆیە پێویسـتە دەوڵـەت و یاسـا هەبێت.. دەوڵەتیش ئەبێت لەسـەر بنچینەی دابەشـبوونی کـار لـەنێوان هاوڵاتییـە ئازادەکانـدا دابمـەزرێت، ئەمـەش بـەقازانجی هـەموو کۆمـەڵ دەگەرێتەوە ـ لەڕاستیشدا هەر خـاوەن کۆیلـەکان دەگرێتـەوە ـ ئـنگلس ئەڵێت: ئەفلاتون بلیمەتانە بیری لەدابەشکردنی کار کردۆتەوە کە ئەڵێت بنچینەی سروشتی شـارە، شـاریش لای یۆنـانی کـۆن بـەمانای دەوڵـەت بەکار دەهـات، هـەروەها مـارکس ئـەڵێت: کۆمـاری بێوێنـەی ئـەفلاتون، لـەڕووی کـار دابەشـکردنانە، هـیچ نییـە تـەنها وێنەیـەکی ئیدیالیسـتی ئەسینایی نەبێ کەلە ستێمی چینایەتی میسری کۆنەوە وەرگیراوە(١٠). ئـەفلاتون لای وابـو کـە: موڵکایـەتی تایبـەتی و خێـزان سەرچـاوەی ناخۆشـییەو هەڕەشـەش لەیـەکێتی کۆمـەڵ ئـەکات، بۆیـە ـ لەشـاری بێوێنەدا ـ پێشنیار دەکات کەسەرکردەو سەرباز مافی موڵکدارییان نەبێ و داوای هاوبەشێتی بەختیارییش لەدڵنیاییدایە، لەنەبوونی ترس و لـەرز دایە.

بەگشتی: فەلەسەفەی ئەفلاتون کارێکی گەورەی کردە سـەر ڕەوتـی گشـتیی پەرەسـەندنی بـیری فەلەسـەفی دوا خـۆی، بەتایبـەتی لەسـەر ئیـدیالیزم ـ لینین پەنجـە بـۆ ئـەوە ڕادەکێشـێت و ئـەڵێت: بـۆ چـوونە

بنچـــینەییەکانی، پەرەســـەندووترین فەلەســـەفەکانی ئیـــدیالیزم، لەجەوهەردا، لە فەلسەفەی ئەفلاتون جوادا نیین(١١).

**ئەرستۆ ٣٨٤ ـ ٣٢٢ پ.ع:**

یــەکێك بــووە لەشــاگردە بلیمەتــەکانی ئــەفلاتون، لەڕاســتیدا فەلەسەکەی کۆڵەکەیەکی گرنگی کۆشکی فەلەسەفەی یۆنانی بوو ئەگەر هــەرە گرنگەکــەیان نــەبوبێ. ســەردەمی داتــەپانی ستێمی دیموکراسی ئەسینای بینیــوە، لــەو کاتــەدا مەکــدۆنیا بــەهێز بــووە پــارتی خــۆی دامەزرانــدووە، واپــێ دەچــێ ئەرســتۆش لایــەنگیری کــردووە، ئــەم فەیلەسوفە نووسینی زۆرەو بەتــەواوی نەگەیشتۆتە دەستمان، ئــەوەی گەیشتووتە بێگومانە کە دەستکارییان زۆر کراوە،بەناو بانگترینیان:"لــە پشتی سروشتەوە" یان "متیافیزیکا" یە شاگردەکانی کۆیان کردۆتــەوە ئەرستۆ لەناو زۆر بابەتا کاری کردووە: لۆجیك، زانستی دەروون، تیوری زانین، هەبوون، فەلەك، سروشــت، زانســتی ئــاژەڵ، سیاســەت، ئــابووری سیاسی، ڕەوشت، پەروەردە، خوتبە، زانستی جوانیی...

لە زۆر حالەتا، نووسینەکانی بەبەنرخ و ووردترین سەرچاوە دائــەنرێن کــە زانیارییــەکانمان دەربــارەی ئــەو ڕێبــازە فەلســەفیە کۆنانــە زۆر ئەکەن..

فەلسەفەی ئەرستۆ جۆرێکی ئیدیالیزمی بابەتییە بــەڵام تەبانییــەو جارجــار هەنــدێ بابــەتی جەوهــەری مــــەتریالی تێکەڵــە. لیــنین ئــەڵێت:"ڕەخنــەکانی ئەرستۆ لــەتیوری ـ مپل ـ، لــەوە دەرئەچێت

کەرەخنە لە ئیدیالیستیی ئەفلاتونی بێت بەڵکو بەگشتی ئەشبێت بەرەخنە لە ئیدیالیزم" (١٢) هەر چەندە خۆشی لەو سنووورە ئیدیالیستییە دەرنەچووە، بەڵام هی ئەرستۆ گشتی و بابەتی و دووربین تر بوو ئەوەی ئەفلاتون، بۆیە فەلەسەفە سروشتییەکەی لەمەتریالیزم نزیکتربوو.

بۆ تیوری زانین، ئەیووت: واقیعی بابەتی بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەزات، هەیە، هەستی مرۆڤ ڕەنگدانەوەی شتەکانی ناو جیهانە ئەرستۆ یەکەم فەیلەسوفی یۆنانی کەبەرهەمە بەدەست گەیشتووەکانی بەشێوەیەکی ڕێك و پێك و بەبەرنامە مەسەلەکانی لۆجیك چارەسەر دەکات.

یەکێك لەمەسەلە سەرەکییەکانی فەلسەفەی ئەرستۆ لەسەر ((بوون))، مەسەلەی پەیوەندی گشتییە بەتایبەتەوە، ئەمەش مەسەلەیەکی دیالیکتیکییە.. سەبارەت بەوە، لۆجیکی ئەرستۆ پەیوەندی هەبووی نێوان بیردکان بەپەیوەندیە، یان، سنووورداریی هەبوون دائەنێت بۆیە مەسەلەی دیالیکتیکیش ئەخاتەڕوو. لینین ئەڵێت: لای ئەرستۆ هەمیشە لۆجیکی بابەتی لەگەڵ لۆجیکی خۆیدا تێك دەئاڵێ، هەرچەندە، دەرکەوتووەکانی، هەمیشە بابەتییە ئەویش لەهەر هەنگاونانێکا هەردەم دیالیکتیك بەتایبەت ئەخاتەڕوو.(١٣)

بەو جۆرە بۆ یەکەم جار فەلسەفەی ئیدیالیزم لەسەر دەستی ئەفلاتوندا گەیییە رادەی ڕێبازی فەلەسەفەی گشتی و وەك ڕێبازی

فەلسەفی دژ بەرێبازی مەتریالیزم خۆی نواند. بەو شێوەیە مەتریالیزم و ئیدیالیزم لەیۆنانی کۆندا دەرکەوتن ئەفلاتون لەخێزانێکی ئەرستوکراتی رەسەن لەئەسینا هاتبووە دونیاوە، تادوا رۆژی ژیانی لەدژی دیموکراسیتەکەی ئەسینا بوو، باسەکانی لەسەر ئەمانە بووە: هەبوون، جیهان و پەیدابوونی، دەروون، زانین، کۆمەڵ، دابەشکردنی کار، پەروەدەو هونەر.. هتد.

## فەلسەفەی سەردەمی هێلنیستی

لەکۆتایی سەدەی چواری پ.ع دا، بەروونی نیشانەکانی ئەو تەنگوچەلەمەیەی کە دیموکراسیی کۆیلەیەتی رامالی.. دەرکەوت. ئەم تەنگوچەلەمەیە بووە هوی ئەوەی ئەسیناو شارەکانی تر سەربەخۆیی سیاسییان لەدەست بدەن.

ئەسیناش بووبە بەشێك لەو ئیمپراتوریتەی ئەسکەندەری مەکدونی دایمەزراند، هەڵوەشانی ئەم ئیمپراتۆریەتەش دوای مردنی ئەسکەندەر، لەبەرەو خراپتر چوون و زیاتر ئالۆزی و تەنگوچەلەمەکەی نەگۆری و بووە هۆی گۆرانێکی قوڵی ژیانی بیر. لەم سەدەیەدا سێ تەیاری سەرەکی لەفەلسەفەی هیلنیستی لەئارادا بوون: مەزهەبی گومان Seepticism، ئەبیقۆری و رواقی Stoicism، یەکەمیان.. مەزهەبی گومانییە:

رابەرەکەیان بیرۆن (دەورووبەری ٣٦٥ ـ ٢٧٥ ق.ع) بوو.. لای ئەم، فەیلەسوف ئەو مرۆڤەیە کەئامانجی بەختیارییە ئافرەتیشی دەکردە مندالّ پەروەردەکردنیشی بۆ دەولّەت دائەنا.دیارە ئەوانە هیچیان فریان بەسەر کۆمۆنیزمەوە نییە، وەك فەیلەسوفەکانی بۆرژوا باسی دەکەن چونکە ئەفلاتوون کاتێ داوای نەهێشتنی مولّکایەتی تایبەتی ئەکات یاداوای دابەشکردنی بەرهەم ئەکات، کەئەوانە تەنها لەباری سەرنجی دەستکەوتی چینی دەسەلاّتدارەوە بێت.

بیرون لای وابوو، ئەو مرۆڤەی خواستی ئەوەبێ بگاتە بەختیاری وائەبێت وەرامی سێ پرسیار بداتەوە: ١ـ شت لە چی پێکهاتووە؟ ٢ـ ئەبێ هەلوێستمان بەرامبەری چی بێت؟ ٣ـ چ سودێك لەو هەلوێستەمان وەردەگرین؟

بۆ پرسیاری یەکەم هیچ وەرامی نییە، چونکە قەت ناتوانین بریاردانێکی برێنەرەوە بۆ پرسیاری یەکەم هەبێت، بیرۆن ئەچێتە سەر پرسیاری دووەم: هەلوێستی فەلسەفی راست بەرامبەر شتەکان وا ئەخوازێت کە هیچ بریارێك دەربارەی نەدرێ. ئەمەش واناگەیەنێت کەشتی یەقینی لەئارادا نەبێت، چونکە دەرکی هەستیمان و سەرنجە هەست پێکراوەکانمان حەتمەن یەقینین، بەلاّم هەلّە ئەحوکمەکانەوەیە لەکاتێکا کە ئەمانەوێ بریار ئەسەر ئەوەی دیارە یا ئەوەی لەروو بەسرشتی شت دەرئەکەوێ.. بدەین. لێرەدا وەرام لەسەر پرسیاری سێیەم دێتە پێشەوە: ئەو کەلّکەی لە نەدانی حوکمەکان وەرینەگرین،

حاڵەتێکی ئارامی و دڵنیایی و بێ بێزاری و بێ پەشیمانییە، لوتکەی بەختیاری تیایە کە فەیلەسوف ئەتوانێ بەدەستی بێنێ.

ئەم فەلسەفەیە لەدواییدا لەسەر دەستی لایەنگرەکانی بیرۆن پەرەی پێدرا. فەلسەفەی ئەبیقۆر: مەزەبی مەتریالیزمی گەردیلەی یۆنانی لە فەلسەفەکەی ئەبیقۆردا (٣٤١ ت ٢٧٠ پ.ع) گەیشتە لوتکە. ئەبیقۆر لای وابوو کە ئەرکی گرنگی فەلسەفە.. دانانی ڕەوشت و بناغەکانی ڕەفتارە کە دەبێتە هۆی بەختیاری. ئەبیقۆر مەزەبی هەستیی sensualism مەتریالی پەسەندکردو پەرەی پێدا.

بیری ئەبیقۆری دەربارەی جوڵەی خۆیی گەردیلە، هاوبەشییەکی نایاب بوو لەپەرەپێدانی مەتریالیزمدا. ئەم فەیلەسوفە لەم تیورییە ساکارەوە دەست پێدەکات و ئەوە دووپات ئەکاتەوە کەلادانی گەردیلە، مەرجێکی پێویست و بنچینەییە بۆ سەربەستی مرۆڤ.

هەروەها فەلسەفەکەی لەدژی ئەفسانەو واهیمەی ئاییتی ئاراستەکرد، چونکە ئەوانەی بەسوک کردنی کەرامەتی مرۆڤ دائەنا.

مەبەستی ڕەوشت بەختیارییە، بەختیاریش لەمەست بەلەزەت کردندایە، هەرشتێکیش ببێتە هۆی ئەوە، خێرەو ئازاریش شەڕەو هەرشتێکیش ببێتە هۆی ئازار هەر شەڕە. فەلەسەفەکەی ئەبیقۆر دوا فەلسەفەی مەتریالیزم بوو لەیۆنانی کۆندا. بیروڕا ڕێڕەی ژیانی، کەنزیک بوو لەوازهێنان لەدونیا.. جێگەی ڕێزو پایە بەرزیی بوو لای ڕۆشنبیرە یۆنانییەکانی دوای خۆی..

**رواقی ـ ستویزم ـ ی یۆنانی:**

زینۆن ـ دەوروبەری ٣٦٦ ـ ٢٦٤ پ.ع ـ دامەزرێنەری ئەم فەلسەفەیە بوو. دژایەتییەکی توندی بەرامبەر فەلسەفەی ئەبیقۆری کرد، رواقییەکانیش هەروەك ئەبیقۆرییەکان لەوەوە هەنگاویان هەڵهێنا کەدەیانوت: ڕەوشت چەقی فەلسەفەیەو ئامانجە بنچینەییەکەیەتی، فیزیکەکەشیان تێکەڵیەك بوو لە فیزیکی ئەرستۆو بیروڕا سروشتیەکانی هیراکلیتس. دەربارەی گێتی ئەیانوت: یەك لەشە، زیندووە، دابەشە، گیانێکی مەتریال بەناویدا ئەڕوات، سیفەتی خوایەتی ئەنێن بەجیهانی مەتریالەوەو لەگەڵ خوادا جووتی ئەکەن. بەسروشتی خوایەتی ـ نان بەجیهانەوەو بەو گیانەی پیایا دەڕوات و ئەو ئەقڵەی کەلەجیهاندا ئەبێت، بەوانە بەربەرەکانیی ئەبیقۆرییەکانیان ئەکرد.

لە ڕەوشتیدا: جیاوازییان لەگەڵ ئەبیقۆرییەکان لە دیدی هەر لایەك بۆ ئازادی و بۆ دوا مەبەست لەژیانی مرۆڤایەتیدا دەرئەکەوێت فیزیك و ڕەوشت لای ئەبیقۆر لەبناغەدا بۆ ئەوە ئاراستە کراوە کەمرۆڤ لەکۆتوپەیوەندی "پێویست" سەرفرازبن، کەچی هی ڕواقی بڕوای بەحەتمیەتی (قەدەرو چارەنووس) لەناو چوونی سەرجەم گێتی هەبووە.. لێرەوە ئەمان "ئازادی" خۆیان جویێ ئەکەنەوە چونکە لایان وایە کرداری خەڵك جیاوازن نەك بەوەی ئازادە یان نە، چونکە هەموو لەبن دەستی ئەو "پێویستە" بەزەبرەدان کەچاری خۆلێلادانی لەئارادا نییە.. بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە کە ئایا ئەم بندەست بوونە لەخۆوە

بووە یان بەزۆر بووە، چۆنکە قەدەر، ئەوەی ملکەچی بێت ڕازی ئەکات و ئەوەی بەربەرەکانێشی بکات ناچاری ئەکات.

لە ڕۆمادا: هەر لەکۆنەوە ئابووریی ڕۆما لەسەر کشتوکاڵ بووە. پەرەسەندنی پەیوەندی کۆیلەیەتی، بەجێگیربوونی هێزی دەوڵەت و بەرفراوان بوونی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانەوە هاوپەیوەند بوو کەناوچەی فراوانی ڕۆژهەڵات و خوارەوەی گرتبووەوە، ئەمەش کاری کردە سەر زۆربوونی کۆیلە بەرادەیەکی فروان گەورە بوونی سامان و دەوڵەمەندی خاوەن کۆیلەکان.

ڕۆمان لاگەشەکانی شارستانیەتی یۆنانییەکانی وەرگرت.. زاناو وتاربێژو هونەرمەندە فەیلەسوفە یۆنانییەکانی ڕاکێشا بۆ لای خۆی..

مەتریالیزمی "لوکریتس کار" (دەورووبەری ٩٩ ـ ٥٥ پ.ع)، کەخاوەنی باوەڕی بلیمەتانەی فەنسەفی "لەسروشتدا" بوو، گەورەترین بەرهەمی فەلسەفەی ڕۆمانی بوو. سەردەمی ئەم فەیلەسوفە زۆر ئالۆز بوو، لەڕۆژانی دیکتاتوریەتی "سۆل" و ململانێی لەگەڵ "ماری"و کەرت و پەرت کردنی چینی سوارەکان و ڕاپەرینەکەی کۆیلەکان بەسەرکردایەتی سپارتاکوس ٧٤ ـ ٧١ پ.ع دا بوو. ئەو ڕووداوانە ناکۆکییە چینایەتییە قوڵ و گرژبووەکانی نێوان کۆیلەو ئازادەکان، وردە جوتیارو خاوەن موڵکە گەورەکان، دوایش لەنێوان خاوەن کۆیلەکان خۆشیاندا ـ لەنێوان سەرکردایەتی کلاسیکی کۆن و بازرگان و سوخورەکاندا.. ئەو ڕووداوانە ئەم ناکۆکیانەی ئاشکرا دەرئەخست.

"لۆکریتس" مەزەبی گەردیلەو گێڕانەوەی بۆ سەر ڕەگەکەی کە مەزەبی ئەبیقۆرە، شتیاڵ کردەوەو هەروەك پیشووەکەی، لای وابوو کەئامانجیی، ئامۆژگاری کردنی مرۆڤە بۆ ژیانێکی ئارام و دڵنیا کەترس و لەرزی تیا نەبێ، نەلەدۆزەخ و نەلەوەو دونیا، نەلە دەست تێوەردانی خوا لەکارە تایبەتییەکانمانا. لۆکریتس.. لای وابوو کە ئەرکی فەلسەفە خەباتە لەدژی ئەو دوژمنانە.. کە گەورەترین دوژمنی بەختیاری مرۆڤن.

لۆکریتس دوو بیری بنچینەیی ئەبیقۆری دووپات ئەکردەوە:

١- بیری لەناوچوونی گیانی مرۆڤ و بڕوانەبوونی بەرۆژی قیامەت.

٢- بیری نەتوانینی خوا کەکار بکاتە سەر ژیانی مرۆڤ.

ئەم نکولیی لەبوونی خوا ناکات بەڵام هەروەك ئەبیقۆر، جێگەیەکی تایبەتی لەناو ئەو بۆشاییانەی کە جیهانەکان لێك جیا ئەکاتەوە، بۆ داناوە.. حاشا لەوە ئەکات کەئەم خوایە توانستی دەستخستنە ناو ڕێڕەوی ڕوداوەکانی هەبێت و ئەڵێ: هیچ شتێ نییە لەهیچ لەدایك ببێ، سەرجەم شتەکان لەتۆوەوە هاتوونەتە خوارێ.. ئەو تۆوانەش نەمرو ئەزەلین، ئەگەر وانەبوایە واهەر لەدێرزەمانەوە هەموو تۆوەکان خراپ ئەبوون.

ناتوانین ڕێبازی پەرەسەندنی فەلسەفەی کۆمەڵگەی کۆیلەی کۆن و سروشتەکەی تێبگەین، هەر تەنها لەبەر ڕۆشنایی ئەو کارتێکردنە نەبێت کەستێمی کۆمەڵایەتی ڕۆمای کۆن کردییە سەر فەلسەفە، ئەو سەردەمە سەردەمی ڕوخانی دەوڵەتە کۆنەکان بووە کەرێگا قیوتی دان

و له سەربەخۆیی سیاسی بیبەشی کردن.. سەردەمی زیاتر هەژاری و کوێرەوەری جەماوەر دەرکەوتنی چینێکی خاوەن جێگە بوو لەمشەخۆرەکانی ڕۆما.. گۆڕانە سیاسییەکان بەخێرایی و یەك بەدوای یەکدا دەهاتن، بوونە هۆی هەڕەشەکردن لەچارەنووسی پێرسۆنالی سەڵتایەتی و شڵەقاندنی ئارامییەکەی. ئەو قوڵبوونی ناکۆکییە کۆمەڵایەتییانەو زیاتر ڕووت و ڕەجاڵی و کارەسات، بوونە هۆی ئەوەی ڕەش و ڕووت و هەژارەکان ڕوویکەنە ئایین کەچاوەڕوانی دڵدانەوەو خۆشییان لێ ئەکرد. لەگەڵ نزیکبوونەوەش لەدەرکەوتنی عیسا، ڕووکردنە ئایین لەلایەن چینە جۆر بەجۆرەکانی کۆمەڵگەی ڕۆمانەوە زیاتر نەبوو، ئەو شەپۆلە ئامۆژگاری و کردارە ئایینیانەی لەرۆژهەڵاتیشەوە دەهات کاری کردە سەر ئەم ئیمپراتۆریەتەو زەمینەیەکی لەباری لەکۆمەڵی ڕۆماندا دۆزییەوە.. لەسەدەی چوارو پێنجیشدا ئیفلاتۆنیی نوێ بووبە قوتابخانەیەکی تەواو کەلەدواییدا کارێکی گەورەی کردە سەر پەرەسەندنی ئایینی مەسیحی.

لەناودارەکانی ئیفلاتۆنی نوێ: ئەفلۆتین و فۆرفیریۆس (سەدەی سێیەمی دوای عیسا)و ئەبرۆقلۆس.. بون ئەم نوێ بوونەوەیەی ئیفلاتۆنی.. هەروەك ئایینی مەسیحی، لەئەنجامی تەنگو چەلەمەی گیانیدا بوو کەبووە هۆی لەناوبردنی کۆمەڵگەی کۆیلەیەتی کۆن.. بۆیە کاری گەورەی کردە سەر پەرەسەندنی مەسیحییەت.

دوای ئەم کورتە باسەی فەلسەفەی یۆنان و ڕۆمان، ئەبێت ئەوە دەربخەین و بلێین کە: ئەم فەلسەفانە پلەی بەرزی پەرەسەندنی بیری فەلسەفی بوون لەکۆمەڵگەی کۆیلەیەتیدا.. نرخی مێژوویی و گەورەی ئەم دوو فەلسەفەیە لەوەدایە کە کۆمەڵێك مەسەلەی بنچینەیی و زۆر گرنگیان خستەڕوو، لەم قۆناغەشدا بوو کەلایەنە ناکۆك و دژ بەیەکەکانی فەلەسەفە دروست بوون و زۆرانبازی نێوان مەتریالیزم و ئیدیالیزم دەرکەوت کەناوەرۆکی بنچینەیی مێژووی فەلسەفە دروست ئەکات. هەروەها یەکەم شێوەی مێژووی دیالیکتیك دامەزراو گەیشتە ڕادەیەکی بەرز لەپەرەسەندن. ئەمەش بەتایبەتی، بایەخی مێژوویی و نەمری فەلسەفەی یۆنان دەرئەخات.

## بەشی دووەم

- فەلسەفە لەسەردەمەکانی قۆناغی دەرەبەگایەتیدا:

١- بیری فەلسەفی و کۆمەڵایەتی لەوڵاتانی خۆرهەڵاتدا: چین - ئێران - ژاپۆن - بیزەنتە - هیندستان - فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامی.

- سۆفیزم و تەییارە کۆنپارێزەکان. فەلسەفەی جولەکە.. فەلسەفەی گەلانی پشتی قۆقاس و ئاسیای ناوەڕاست. بیری فەلسەفی لە ئەرمەنستان - لەجۆرجیا.

٢- فەلسەفە لەوڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوادا.

٣- بیری فەلسەفی لەروسیادا (سەدەی نۆیەم - سەدەی حەڤدەیەم).

- فەلەسەفە لەسەردەمەکانی قۆناغی دەرەبەگایەتیدا:

## ١. بیری فەلسەفی و کۆمەڵایەتی لەوڵاتانی خۆرهەڵاتدا:

### لەچین:

لەنێوان هەردوو سەدەی سێ و چواری د.ع، هێزەکانی هۆن و دوای ئەمانیش خێڵە بەربەریەکانی تر چینیان داگیرکردو هەتا کۆتایی سەدەی شەشەم ناوچاکانی باکوور لەژێر دەستیاندا مایەوە، ئیتر باری ئابووری داڕوخا.. خەڵکێکی زۆر کوژرا.. لەو باروبۆخەدا کۆنفۆشی کەئایدیۆلۆژی سەردەمی خێزانی هۆن بوو بەرەبەرە جێگەی خۆی لەژیانی گیانیی وڵاتەکەدا ون ئەکرد (سەدەی دووەمی پ.ع ـ سەدەی دووەمی د.ع).

لەهەمان کاتدا سۆفییەتی "بوزی" و "تاوی" گەشەیان ئەکرد.. بوزی ئەو بیروڕا فەلسەفییە لاهوتیانەی بڵاو ئەکردەوە کەژیانی ئەم جیهانەی بێ بایەخ ئەکردو بڕوا بەئەمری گیان و بەگیان چوونە لەشێکی ترەوەو بڕوا بەنەبوون و بەوەی کەئەناو کەماڵی هۆشی خۆییەوە ئەگەین بەئارامی گیانیی، بەهێز ئەکرد. ژمارەیەك لەزاناکان بەتایبەتی فان شێن ـ سەدەی پێنجەم و شەشەم ـ کە لە دژی بیروباوەڕی ئەو ئایینەبوون مان شێن ئەیووت: ئەوەودونیا دڕۆیەو نییە، گیانی مرۆڤ شێوەیەکە لەشێوەکانی بوونی لەش کە ئەم نەما ئەویش نامێنێ.

لەسەردەمی تـانج دا ٦١٨ ـ ٩٠٦ دەرەبەگایـەتی گەیشتە ڕادەیـەکی بەرز لەپەرەسەندن.. ڕۆشنبیری و هونەرو ئەدەب گەشەیان کرد.. بوزی بەباشی بڵاونەبوەوەو جێگـەی بەکۆنفۆشـی و تـاوی، لێژنـەکرد.. بـەڵام ئەم ئاینە خۆشـی دووچـاری گێروگرفـت و پارچـەبوون بـوو، کـەلاوازی کردو ڕێگەی بۆ کۆنفۆشی خۆش کرد تا سەر لـەنوێ هـەوڵی گێڕانـەوەی دەسـەڵاتی کـۆنی بـدات.. کۆنفۆشـییەکانی ئـەم سـەردەمە نوێنـەری دەسکەوتی دەرەبەگیی دونیایی بوون. هان لوی لەسـەدەی نۆزدەیەمـدا ناوبانگی پەتریارکی قوستەنتینییە "فـوتی" داکـەوت کـە هەڵبـژاردەی فەیلەسوفە جۆر بـەجۆرەکانی کۆکردەوە لەدانراوەکەیـدا "کتێبخانـە" بڵاوی کردەوە. ئەرستۆی پەسند کردو ئەفلاتونی بەنازانستی و خـەیاڵی و نـاکۆک تاوانبـار کـرد. دوای ئـەم شـاگردەکانی بەپێچـەوانەی خۆیـەوە لایـەنگیری ئـەم و لـەدژی ئەرسـتۆبوون.. بـەو جـۆرە نـاکۆکی لـەنێوان لایـەنگرانی ئەرسـتۆتالی و ئـەفلاتونی لەبیزەنتـە پەیـدابوو، تـاگرتنی قوستەنتینییە لەلایەن تورکەکانەوە درێژەی کێشا. لەسـەدەی یـانزدەو دوانزدەشـدا.. ژمارەیـەك فەیلەسـوف لەبیزەنتـە ڕۆڵـی گرنگیـان لەپەرەپێـدانی بـیری فەلسـەفی و کۆمەڵایـەتی و سیاسـیدا وازی کـرد. لـەنێوان سـەدەکانی ٩ـ١٤دا بزوتنـەوەی بـەرینی دژ بەدەربەگایـەتی لەبیزەنتـەدا پەیـدابوو.. ڕاپەڕینـە میلـلی و هەرتەقییـەکان.. ڕووی ئاشـکرای ئـەو بزوتنەوەیـە بـوون کـەخۆی لـەزۆرانبازی نێـوان دوو بیروباوەڕدا ئەنواند: خێرو شەڕ..

**بیری فەلسەفی لە ئێران:**

هەر لەکۆنەوە، لە ئێران و وڵاتانی تری دراوسێ لە ڕۆژهەڵاتدا.. ئایینی زەردەشتی، ئایینی "ئەهوارمزدا"و پەرتوکە پیرۆزەکەی "ئاڤێستا"و * ناوبانگی پێغەمبەرەکەی "زەردەشت" بڵاوبوەوە.

زەردەشتی مەزەبێکی دوانە Dualistic یەو شوێنەواری دەرکەوتووی ئەفسانەی پێوە دیارە. بیری سەرەکی ململانێی دوو هێزی ناکۆکە: ڕووناکی و تاریکی، ژیان و مردن و خێرو شەڕ.. هتد. نرخی مێژوویی زەردەشتی لەوەدایە کەبیروڕاکانی لەسەر: جەوهەری، یا، هەردوو پرنسیپی کەونییە، ئاوێنەی ئەو بیرە بووەکە دەیووت : ململانێی نێوان ناکۆکەکان بنچینەی هەموو ئەو شتانەیە کەهەن. لەسەدەکانی سێیەمەوە تاحەوتەمیش، ئالۆگۆڕی گەورە لەزەردەشتیدا کراوە، هۆی ئەو ململانێیانەی لەنێوان ڕێبازە جۆر بەجۆرەکانیدا پەیدابوون لەریزەکانیدا زیاتر مشتومڕ لەسەر ئەم مەسەلەیە گەرم بوە: ئایا یەکەم جەوهەر تاك بووە یان جووت، لەناو لایەنگرانی تیوری تاك جەوهەردا،

---

*ئەهوار مزدا: خوای خێری ئەهریمەن: خوای شەڕە.. نیشانەی خوای خێر ڕۆژە لەئاسمان و ئاگرە لەسەر ئەرز.. لەمەوە ڕۆژو ئاگر پەرستی دا کەوتووە. وە ئاڤێستا بەزمانی زەندی Zand نووسراوە.

ژمارەیەکیان ڕای مەتریالی خوانەناسییان هەبووە "دەهرییەکان" ئەیانووت هیچ شتێك نییە مەتریال نەبێت. نەیەزدان و نەئاسمان و نەگیانی نەمر هیچیان نین نەبەهەشت هەیەو نە دۆزەخ. هەر شتێك لەگێتیدا ڕوویدات ئەگەڕێتەوە بۆ زەمانی بێ کۆتاییی (زەرفان دەهر).

لەسەدەی سێیەمیشدا ئاینێکی فەلسەفی نوێ پەیدابوو: "مانەوی". مانی (٢١٦ یا ٢١٧ - ١٧٦) دامەزرێنەری بوو، خولیای دانانی ئاینێکی نوێ بوو کەبە تێکەڵکردنی فرمانەکانی دەهری و بوزی بێنە ئەنجام. مانەوی لەرووی فەلسەفییەوە جۆرێك بوو لە "فنوسی" (ئەمەش مەزەبێکی سوفی غەیبی بوو، بڕوای بەبوونی زانینێکی تایبەتی هەبوو کەنهێنییەکانی بوون و ڕێگەی سەرفرازی گیان دەردەخات). "پانتیزم" pantheism ی* ڕۆهەلاتی؛ لەرووی"سامکار"دا (سەدەی نۆیەم) دەرئەکەوت. کەبڕوای تەواوەتی بەهەبوونی موتڵەقی یەك گیانی کەونی - براهمان هەبووە لەگەڵ هاوسەرەکانیدا کە ئەمانەن: بون، هۆش و بەختیاری.

ململانێی نێوان ئیدیالیزم و مەتریالیزم هەرگیز وەستانی بۆ نەبووە.

---

*مەزەبی یەکێتی بوو، دەیووت: خوا لەگەڵ سروشت تێکەڵەو لەناویا بڵاوبۆتەوە.

بەدرێژایی ماوەکانی نێوان سەدەکانی پانزدەو پانزدە مەزەبەکانی سکولانیزم و ئیدیالیزم لەهیندستاندا زاڵ بوون و کاری سەلماندنی دروستی باوەڕە ئایینییەکانیان لەبەرچاو گرتووە. ئەهرۆ ئەم سەردەمە وا باس ئەکات: "گیانی پێشخواستن و لەزەتی بەڵەدویستی ئەهێشت بۆ رێگە پاککردنەوە بۆ لۆژیکی ڕوکەشی و مشتومڕی ئەزۆك، تەنانەت براهمانی و بوزی دەستیان کرد بەداڕوخان، گەلێ شێوەی نزم لەپەرستن دەرکەوت، بەتایبەتی چەند پەرستێنکی تەنتەری و ئەو شێوانەنانەی بەمەزەبی "بۆغا" وە لێکتران هاتنە پێشەوە" (١٥).

لەسەدەی پانزدەو شانزدەوە دەرەبەگایەتی لەهیندوستان کەوتە داڕزان و هەڵوەشان.. شان بەشانی ئەو پرۆسەیە بزوتنەوەی دژ بەدەرەبەگێتی دەستی پێ کرد گەبەرگ ئایینی بوو. بەڵام داخوازی ئەوەبوو کەملکەچی هەر بۆ یەك خوا بێت، بەتایبەتی بزوتنەوەی "بەهاکت" کەلەنێوان سەدەکانی شانزدەو هەژدەدا گەیشتە لوتکەی بەرین بوون، شاعیری بەناوبانگ تویس داس (١٥٣٢ ـ ١٦٢٤) لەناودارەکانی ئەم رێبازە بوو.. بیروڕای زاناکانی بەهاکت، هەرچەند سروشت ئایینی بوو، بەڵام ڕوخساری پێشکەوتوانەی کۆمەڵایەتییان پێوە دەردەکەوت، بەتایبەتی کاتێك کە لەدژی سستێمی جیاکەرەوەو جیاوازی کۆمەڵایەتی و لەدژی دەمارگیریی کوێرانەی ئایینی کوێرانەی ئایینی ودستان. لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمیشدا شەڕی بەرهەمهێنانی دەرەبەگانە لەداڕۆخان و گەندەڵ بوون بەردەوام بوو..

لەسنورێکی فراواندا بیروڕای "فیرانتی" ئیدیالیزمی بانەتی بلاوبووەوە کەبۆ خزمەتی ڕێبازە ئایینیە کۆنەپارێزەکان بەکارئەهێنرا.

**ژاپۆن:**

لەژاپۆنیشدا سەرەتای بیری فەلسەفی لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا لەژێر کارتێکردنی فەلسەفەی هیندی و چینی کوریایدا دەرکەوت.. کۆنفۆشی و بوزی دوو تەیاری باوبوون لەژیانی بیری سەدەکانی ١٢ـ ١٥دا.. لەسەدەی حەڤدەیەمیشدا زانای وادەرکەوت کەدەیووت: گێتی خەڵق نەکراوە، بەڵکو ئەزەلییەو بەپێی پێویستی سروشتی پەرەی سەندووە. تاگەیشتۆتە ئەم شێوەی بوونەی ئێستاکەی.. "کایبا ئیکین" لەفەیلەسوفە گەورەکانی ژاپۆن بوو کە نەمری مەتریالی سەلماندو حاشای لەوە کرد کەگیان بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەمەتریال هەبێت، دژی سستێمی دەرەبەگێتی ـ پاشایەتی ژاپۆن بوو. لەکۆتایی سەدەی حەڤدەو نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەیەمدا ژمارەیەك فەیلەسوفی مەتریالیست دەرکەوتن کەهەموو لەدژی سستێمی کۆمەڵایەتی دژ بەگەل قسەیان ئەکرد..

**بیری فەلسەفی لەبیزەنتە:**

لەبیزەنتەی دەرەبەگایەتیشدا، هەروەکو وڵاتانی تری ژیاوی ناو ئەو سستێمە وا سەیری فەلسەفەیان ئەکرد کە خزمەتگوزاری لاهوتەو ئەرکی سەرشانی سەلماندنی ڕاست و دروستیی بیروباوەڕە ئایینییەکانە، بەتایبەتی هەبوونی یەزدان و نەمیی گیان.. فەیلەسوفە ناودارەکانی

تری ئەم فەلسەفەیە ٧٦٨ ـ ٨٢٤ ڕەخنەیان لەبوزی ئەگرت و هەندێ ئیدیەی مەتریالستانەشیان ئەخستەڕوو.. بەڵام هەر کەسەرکەوتنیان بەدەست هێنا ئیتر پشتیان کردە ئەو بیروباوەڕانەیان و سەر لەنوێ ئاڵای ئیدیالیزمیان بەرزکردەوە.. کۆنفۆشی نوێ بوو بەئایدیۆلۆژی ئەرسۆزۆکسی وڵاتی چینی دەرەبەگایەتی.. لەناو ئەم نوێکردنەوەیە کۆنفۆشیدا فەلسەفەی ئیدیالیزم و ئینجا بەرامبەرەکەی، مەتریالیزم هاتنە کایەوە.

لەو ڕێڕەوەدا، لەسەردەمی فرمانڕەوایەتی خێزانی مینج دا ـ ١٣٦٨ ـ ١٦٤٤ توندوتیژی ناکۆکییەکانی ناو سەرجەم کۆمەڵگەی دەرەبەگیتی زیاتر بوبوو.. بۆیە ڕێگەو شوێنەکانی مەتریالیزمی دژ بەئیدیالیزمی کۆنفۆشی، بوون بەبناغەی بیری جوڵانەوەی دژ بەدەرەبەگایەتی.. لەسەدەی شانزدەیەمیشدا زیاتر گێرمەو کێشەی دەرەبەگایەتی قوڵ و دژوارتر دەبوو.. ئەوەش بەهۆی هێرشی بەردەوامی خێڵەکانی سەروو جەنگی ژاپۆنەوە بوو.

لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەمیشدا مەنشوریا چینی داگیرکرد.. لەم کاتەدا کەخەڵکی چین دژی داگیرکەران وەستان بەرگرییان لەزەوی و وڵاتەکەیان ئەکرد، سەرکردایەتی دەرەبەگیتی پشتی داگیرکەرانی ئەگرت و کۆنفۆشی نوێ بوو بەچەکێکی ئایدۆلۆژی کۆنەپەرستانە بەدەست سەرکردایەتییە دەسەڵاتدارەکەوە.

زۆر لەفەیلەسـوف لـەدژی ڕاوبـیرە کۆنەپەرسـتانەکان ڕاپـەڕین و هاوبەشییەکی کاریگەریان لەخەباتی چەکداریی دژ بەداگیرکەراندا کرد.. لـەناو بـیری مەتریالیسـتانەی ئەوانـدا، یـەکێتی عەفـەوی نێـوان نیشـتمانپەروەری و مرۆڤپـەروەری ئاشـکرا بـوو، بـوو بەچـەکێکی ئایـدیۆلۆژی دژ بـەو سەرکردایەتیـیە. لەسـەدەی هەژدەیەمـدا زیـاتر دەسەڵاتی بنەماڵەی مەنشوریا بـەهێزبوو.. قوتابخانـەی ئەرسۆزوکسـی بـووە ئایـدیۆلۆژی زاڵ و ڕەسمـی.. لەبەرامبەریشـی بیروبـاوەڕی کۆمەڵایـەتی دژ بەبەنـدەگێتی دەرەبەگایـەتی و داگیرکردنـی مەنشـوریا ڕۆڵێکی گرنگی وازی کرد، ڕای پێشکەوتنخوازانە زیـاتر پـەخش ئـەبوو.. بەتایبەتی "دای تشیـن" بەتیوریـیە کۆمەڵایەتییەکەی دژی بەنـدەگێتی دەرەبـەگێتی و داگیرکـەرە مەنشـورییەکان ئاراستـەی دەکـرد، ڕۆڵێکـی باشی وازی کرد.

**بیری فەلسەفی لەهیندستان:**

دەرکـەوتنی سسـتێمی دەرەبـەگێتی لەهیندسـتاندا ئەگەڕێتـەوە بـۆ پێش عیسا، لەنێوان سەدەکانی چوارو شەشەمیشـدا جێگیربـوو. کاتێـك لەشـکری ئیسـلام ئـەم وڵاتـەیان گـرت.. کـارتێکردنی عـەرەب وئێرانییـەکانیش ڕۆڵی خۆیان لەسەر ڕووداوەکان وازی کرد.

لەم وڵاتەشدا.. هەروەکو هەموو شوێنێکی تر، لەگەڵ گۆڕان و بـەرەو چەسـپین چـوونی سسـتێمی دەرەبەگایـەتی.. دەسـەڵاتی ئایـینی و ئایدیالیزم بەهێزتر ئەبوو..

براهمـانی زیـاتر لەهـەموو ڕێبـازە ئایینـەکانی تـر بڵاوبـووەوە، لەدواییشدا بوو بەئایینی هیندۆسی.. بەڵام بـوزی کۆنپـارێز ئـەو جێگـەو دەسـەڵاتەی نـەما. لـەنێوان سـەدەکانی چـوارەم و نۆیەمـدا نـۆ ڕێبـازی فەلسەفی کۆنپـارێزو کۆنـنەپارێز بڵاوبوونـەوە، هەرچـەندە هەریـەك لـەو تەیبارانە تایبەتمەندی خۆیی و کێشـی تایبـەتی خـۆی هـەبوود، دیسـان هەموو، هەر لەدووبەرەکەدا: مەتریالیزم و ئیدیالییزم کۆبوبوونـەوە. لـەو سەردەمەشـدا زیـاتر ئیـدیالییزم زاڵ بـووە، بەئاشـکرایی لـەکردارەکانی فەیلەسـوفی براهمـانی چـینایەتییەوە، دەرخـەری نـاڕەزایی و بێـزاری جـەماوەری چەوسـاوەبوو لـە دژی دەرەبەگایـەتی دەرکـەوتوو. مـانی: داوای خواپـەرستی و وازهێنـان لـەم ژیانـەو لەوەچەخستنەوەی ئـەکرد، وەکو ڕێگەیەکی پێویست بۆ سەرکەوتنی خێـر بەسـەر شـەڕدا، ئەمـەش جیاوازی سەرەکی نێون مانەوەی و زەردەشتی بوو.

لەسەدەی پێنج و شەشیشدا "مـەزدەکی" لـەئێران و ئازەربایجـان و ئاسـیای ناوەڕاسـتدا بـەزۆری بڵاوبـوەوە، ڕابـەری ئـەم بزوتنەوەیـە ـ مەزدەك ـ (لەساڵی ٥٢٩ دا کۆچی کردووە) بـوو کـە ڕەواجـی دا بـەبیری مسـۆگەربوونی سـەرکەوتنی ڕوونـاکی بەسـەر تاریکیـداو خێـر بەسـەر شـەڕداو یەکسـانی کۆمەڵایـەتی بەسـەر زۆر و نایەکسـانیدا.. داوای بەکارهێنانی زەبروزەنگی ئەکرد بۆ لابردنـی جیـاوازی کۆمەڵایـەتی و بـۆ هاوبەشی کردنـی موڵکایـەتی کەهـەموو کـەس وەکـو یـەك سـوودی لـێ وەربگرن. مەزدەکی کـارێکی گـەورەی کـردە سـەر خـەڵك.. هـەژارەکان

ڕاپـەڕین و بـەزۆری هێـز موڵکومـاڵی دەوڵەمەنـدەکانیان زەوت کـردو دەرەبەگـەکانیان دەکـرد. بـەڵام دوای سـەرکەوتنێکی کورتخایـەن بزوتنەوەی مەزدەکی خامۆش کراو زۆر دڕندانە سزای لایەنگیرانی درا..

لـە ڕۆژانـی فەرمانڕەوایـەتی کیسـرای یەکەمـدا ـ سـەدەی شەشـەم ـ زانسـت و فەلسـەفەی یۆنـانی کاریـان ئـەکردە سـەر بـیری فەلسـەفیی فارسـی. کـە قوتابخانـەی فەلسـەفی ئەسـینا داخـراو نوێنـەرەکانی لەبیزەنتە دەرکران، "کیسرا" میوانداریی کردن. دانراوەکـانی ئەرسـتۆو ئـەفلاتون کـران بەفارسـی و چـەند مەڵبەنـدێکی زانسـتی کرانـەوەو لێکوڵەرەکانیش گرنگییـان ئـەدا بـە پزیشـکی و زانستەکانی سروشـت و فەلـەك و فەلسـەفە. بـەڵام لەسـەردەمی ئیسـلامدا ڕوونـاکبیری بـەرز هەڵکەوت، لەوانە ئەبوبەکری ڕازی (٨٦٤ ـ ٩٢٥) پزیشـك و کیمیاگـەر.. ئـەیووت: ئـەبێت پێشەسـازی پزیشـکی لەسـەر بیـنین و ئـەزموون دابمـەزرێت. ڕازی هـەروەك زانایـەکی زانسـتی سروشـت بەرزنـەبووەوە، بەڵکو وەك فەیلەسوفێکی مەتریالیسـتی دەرکـەوتویش نـاوی دەرکـرد.. ڕازی، مـەتریال و هـەردوو هاوسـەرە سـەرەکییەکەی ـ شـوێن و کـات ـ لەگەڵ خوادا، شان بەشانی یـەك، دایئـەنان و لای وابـوو کەپرنسـیپەکان هـەر لەئەزەلـەوە هـەن ئـەیووت پەیوەنـدی تونـدوتۆڵ لـەنێوان گیـان و لەشدا هەیە، جوڵانـەوەی دائـەنا بەسـیفەتی بنچینەیی مـەتریال کـەلێی جیانابێتەوە.. لەزانیندا لایەنگری مەزەبی هەستیی مەتریال بوو.

**فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامی.**

گۆڕانە قوڵەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لەنیمچە دورگەی عەرەبیدا.. لەدوای هەڵوەشاندنی سستێمی هاوبەشێتی سەرەتایی و بالاکردنی پەیوەندییە دەربەگاتییەکان و پەرەسەندنیان.. بەبەستراوەیی لەگەڵ دەرکەوتنی ئیسلامدا هاتنە ئاراوە. ئسلام خێڵە دژ بەیەکەکانی عەرەبی لەدەوڵەتێکی یەککگرتووی شێواز دەرەبەگیدا یەکخست. گرتنی وڵاتانی تریش لەلایەن عەرەبەکانەوە.. بوە هۆی ئەوەی دەوڵەتێکی تیۆکراتی فرەنەتەوە (خەلافەت) بێتە ئاراوە کە عەرەب بارێکی تایبەتی تیا هەبوو، ئیسلامیش ئایینی رەسمی بوو.. لەو سەردەمەدا، لەسەر بناغەی تێگەیشتنی فەلسەفەی عەرەبی ـ ئیسلامی دەرکەوت و پەرەی سەند کە ـ شان بەشانی عەرەبی ـ فارس و قیپتی و جولەکەو تورک و تاجیك و ئوزبەکی و ئازەر.. هاوبەشییان تیاکرد. ئەم فەلسەفەیە لەنێوان سەدەکانی دەو سیانزدەیەمیشدا لەچوار رێبازی سەرەکیدا بەگەلالەیی دەرکەوت:

١ـ گەڕیدەیی ئەرستۆتالی ـ خۆرهەڵاتی.

٢ـ فرمانەکانی "ئیخوان و لسەفا".

٣ـ سۆفیزم؟

٤ـ فەلسەفەی دەقیی کۆنپارێزی ئیسلامی.

ئیخوان و لسەفا: کۆمەڵێکی نهێنی بوو لەنیوەی دووەمی سەدەی دەیەمدا لەبەسرە دامەزراو ٥١ پەیامیان* دانا کەزانیاری مەیدانە جۆر

بەجۆرەکانی زانست فەلسەفەی سەردەمی خۆیان تیا کۆکردەوە. سودیان لەبەرهەمەکانی ئەرستۆو جالینۆس و ئەفلاتوون و فیساغۆرس وەرگرت. ئیخوان و لسەفا لایان وابو کەزانین بەسێ ڕێگە دەست ئەکەوێت: بەئەندامانی هەست، بەئەقڵ و بەخەملاندن. ئەمان لەلایەنگرانی یەکخستنی هەموو ئاین و مەزەب فەلسەفییەکان بوو لەسەر بنچینەی زانیارییە زانستی و فەلسەفییەکان کە ئاین لەواهیمەو ئەفسانە ڕزگار بکات.

### گەڕیدەیی خۆرهەڵاتی Periatetikos :

کندی ۸۰۰ ـ ۸۸۹ یەکەم فەیلەسوفی عەرەب بوو کە ڕێگەی بۆ دەرکەوتنی ئەم ڕێبازە خۆش کرد، بایەخی بەلۆجیك و زانیندا، کندی بڕوای بەمەرجی هۆیی دیاردەکانی سروشت و کۆمەڵ و سروشتە یاساییەکەی هەبووە.

*جگە لە کۆپەیام کەبە (٥٢) هەمین پەیامی ئیخوان و لسەفا دائەنرێ.

فارابی و ئیبن سیناو بیرونی لەنوێنەرانی ناوبەرزی ئەم فەلسەفەیەن. فارابی زانیارییەکی زۆری دەربارەی ئەرستۆ هەبوو.. فەیلەسوف و پزیشك و زانای ماتماتیك و ئیدیالیست بوو، بەڵام بڕوای بەوە بووە کە جیهانی دەرەکی بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەهێزە لەئاسا بەدەرەکان

هەیەو ئەبووت لەتواناد‌ا هەیە لەجیهان بگەین، سەرچاوەی زانینیش ئەندامانی هەست و مێشکۆلەو ئەقڵە.

بیرونی (٩٧٣ ـ ١٠٤٨) زاناو ڕووناکبیرێکی بەرزبوو.. ژمارەیەک نووسراوی دەربارەی زانستە جۆر بەجۆرەکانی نووسی، لەفەلسەفەدا ئیدیالیست بوو، بەڵام ڕا سروشتیەکانی هەندێ بیری مەتریالیستانەی تیایە.. لای ئەم سروشت لەگۆڕان و پەرەسەندنێکی بێ وەستاندایە.

بەڵام ئیبن سینا (٩٨٠ ـ ١٠٣٧) ناودارترین زاناو ڕووناکیبری وڵاتانی خۆرهەڵات بوو لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا.. مەیدانێک نەبووە لەمەیدانەکانی زانست کاری تیا نەکردبێ، بەڵام لەفەلسەفەو پزیشکیدا دەستێکی باڵاتری هەبوو، زیاتر لە ٣٠٠ دانراوەی نووسیوە کە ٥٠ دانەیەکی دەربارەی فەلسەفەیە. بوونی بابەتیی سروشتی ئەسەلماند، زۆر جار مەڵبەندی ئیدیالیستی و ئایینی بەجێ ئەهێشت بەرەو مەتریالیزم... کەیاساکانی بیری لۆجیکی و شێوەکانی ئەخستەڕوو، تەقەلای ئەدا کەلەخودی تایبەتمەندەکانی بوون هەڵیانهێنجێ. سەرنجی تایبەتیشی بۆ پەیوەندی ئاڵوگۆڕکەری نێوان فیزیک و لۆجیک و میتافیزیک تەرخان کرد. جیاکردنەوەی "ماهییەت" و "بوون" لەلایەن ئیبن سیناوە ڕۆڵێکی گەورەی لەمێژووی فەلسەفەدا بینی. بەپێی تیۆری هاپەیوەستی Immanence (الفیض)ی ئیبن سینا گێتی بۆ پەزدان نەخوڵقێنراوە، بەڵکو بەشێوەیەکی سروشتی، واتە ناڕاستەوخۆ، لەوەوە دەرچووەو بەهۆی چەند ئەقڵێکەوە دەکرێ، ئەم فەلسەفەیە کەتەوەری

بنچینەی میتافیزیکی ئیبن سینایە لای وابوو کە: خواوەند، بێ بوونی توانستی خۆی ناتوانێت هیچ شتێك بخولقێنێت، سەرچاوەی ئەو توانستەش مەتریالە خولقێنراو نییەو ئەمریشە، خۆ ئەگەر یەزدان ئەمر بێت. واجیهانیش دیسان، ئەمر ئەبێت، چونکە ئەگەر ئەویان هەبێت واهیچ چارنییە ئەبێت ئەمیشیان هەبێت. هەرچەندە ئەم بۆچوونە ڕووی ئاینی لاهوتی پێوە دیاربوو، بەلام پایەگاکانی ئایدۆلۆژی ئاینی غەیبی لەق کرد، دیسان بیری ئەمریی گێتی مەتریال بەتەواوی پێچەوانەی دیدی ئاینی بووە لەدەربارەی دوایی هاتن و سنوردانێتی گێتی. هەر بۆیە ناویراو دووەم مامۆستا دوای ئەرستۆ "یەکەم مامۆستا".

**سۆفیزم و تەیارە گۆنپارێزەکان.**

سۆفیزم و فەلسەفەی ئاینی و غەیبییە کۆنپارێزەکان، وەکو بەرپەرچدانەوەی بلاوبوونەوەی بیری مەتریالیستی و ئەقلی هاتە کایەوە. سۆفیزم ـ مەزەبێکی زۆر نزیکە بەئەفلاتونی نوێ. لەناو ئەم ڕێبازەدا دوو تەیاری لەیەك جیا هەبوو: کۆنپارێزو هەرتەقی.

غەزالی ١٠٥٩ ـ ١١١١ لەدژی فارابی و ئیبن سینا قسەی کردو بەتوندی بەرامبەر بیری ئەمریی و ئەزەلی و یاسایی گێتی وەستا.. ئەم لای وابو کەخوا گێتی لەنەبوو دروست کردووەو خواستی خوا هەمیشە ڕێڕەوی ڕووداوەکان ئاراستە ئەکات.

لەناوەڕاستی سەدەی دوانزدەیەمیشەوە ئایدیۆلۆژی غەیبیی کۆنپارێزی کۆنەپەرست بەهەردوو باڵەکەیەوە، ڕۆژهەڵاتی وڵاتی عەرەبی گرتەوە، ئیتر بەدرێژایی چەندین سەدە بڵێسەی زانست و فەلسەفە کوژایەوە.

هەر لەم سەدەیەدا فەلسەفەی عەرەبی - ئیسلامی لەخۆرئاوای عەرەبی (ئەندەلوس و بەشی خۆرئاوا لەسەرووی ئەفریقیا) گەیە لوتکەی گەشانەوە "گەڕیدەیی خۆرهەڵاتی" لەسەر دەستی ئیبن باجەدا (کۆتایی سەدەی یانزدە - ۱۱۳۸)و ئیبن توفەیل (دەوروبەری ۱۱۱۰ - ۱۱۸۵)و ئیبن ڕوشد (۱۱۲٦ - ۱۱۹۸)، پەرەسەندنێکی تری بەسەر هێنرا. بەتایبەتی لەسەر دەستی ئیبن ڕوشددا.. ئەم فەیلەسوفە لای وابو کە جیهانی مەتریالی لەزەماندا بێ کۆتاییە، بەڵام بۆ زەمین سنورێکی هەیە، ئەو دیدە لاهوتیەی ڕەت کردەوە کەلای وابوو جیهان لە "شت" دروست نەکراوە. خواو سروشت هەر لەئەزەلەوە هەن، هیچ کاتێکیش خوا لەپێش بوونی سروشتا نەبووە. خوا سەرچاوەی ئەزەلیی واقیعە، بەڵام مەتریال تاکە بنچینەیە بۆ بوون و سەرچاوەی ئەزەلیشە بۆ زەمین. مەتریال و وێنە پێکەوەن و هیچ یەکێکیان بێ ئەوی تر نییەو ناتوانرێ جیا بکرێنەوە لەزەینداا نەبێت.. هەر لەبەر ئەوەشە کەزەمان و واقیع یەکێتییەك پێك ئەهێنن. مەتریال سەرچاوەی تەواوو ئەزەلی جوڵانەوەیەو جوڵانەوەش ئەزەلی و ئەمرو هەمیشەییەو هەموو

جولەیـــەکی نـــویێ لەیـــەکێکی پێشـــووتری دەرنەچـــێت. بـــەڵام بـــیرە مەتریالیستەکانی ئیبن ڕوشد لەگەردی ئیدیالیزمیی بێ بەری نەبوون.

لـەو مشـتومڕەی لەسـەر تێکەیشـتە گشتیـیەکان کرا، ئـیبن ڕوشـد ڕێڕەوێکـی مەتریالیسـتانەی گـرت.. ئـەم فەیلەسـوفە دوا نـاوداری پایـە بەرزی مێژووی فەلسەفەی عەرەبی ـ ئیسلامی سەردەمی دەرەبەگایەتی بوو. *

## فەلسەفەی جولەکە:

فەلســـەفەی جولەکـــە لەســـەردەمی دەرەبەگایەتیـــدا بەپەیوەنـــدی تونـدوتۆڵ لەگـەڵ فەلسـەفەی عـەرەبی ـ ئیسـلامیدا پـەرەی سـەند. نووسینەکانی زۆربەی زاناکانی جولەکە لەو سەردەمەدا بەعەرەبی بوون. سۆفیزم و سکولانیزم لەسەدەی ناوەڕاسـتدا زاڵ بـوون، سـۆفیزم لـەدوو ڕێبـازدا خـۆی نوانـد: کابـالا، ئـەفلاتونی نـوێ. بـەناوبانگترین زانـای ئـەفلاتونی نـــوێ ســـلمون کـــوڕی جبرویـــل (١٠٢١ ـ ١٠٧٠) بـــوو، لەنووســـراوەکەیدا "بنەچـــەی ژیـــان" هەوڵیـــدا تیـــوری خـــوای تاقانـــە Monothism ی جولەکـە لەگـەڵ پـانتیزم Pantheism ی ئـەفلاتونی نوێ یەك بخات. لەسەدەی دوانزدەشدا، موسای کوڕی مـەیمون (١١٣٥ ـ ١٢٠٤) نوێنـەری ئەرسـتۆتالی بـوو لـەناو فەلسـەفەی جولەکـەدا، ئـەم فەیلەسـوفە ویسـتی بیسـەلمێنێت کـە ئـەتوانرێت ئایـــینی جولەکـەو فەلســەفەی ئەرسـتۆ پێکـەوە بگونجێنرێـت.. بۆیـە هەوڵیـدا ئایـین و فەلسەفە لەگەڵ یەك بسازێنێت و فەلەسەفەی جولەکەش بە فەلسەفەی

یۆنانی و تێندیسته ئەقڵییەکەی موتوربە بکات.. کە ئەمەش بوە هۆی ئەوەی پیاوانی لاهوتی جولەکە کۆنپارێزەکان هێرش بکەنە سەر ئەم فەیلەسوفە.

---

*ئەبێت زۆر کورت کردنەوەی باسەکە بوبێتە هۆی ناو نەبردنی ئیبن خەلدون ۱۳۳۲ ـ ۱٤۰٦ لینین زۆر بایەخی بە "پێشەکی" یەکەی ئیبن خەلدون دا، کە ڕۆڵی فاکتەرە ئابورییەکانی لە کۆمەڵگەکاندا دیارکرد.. لینین پرسیاری ئەکرد: "تۆ بڵێی لە ڕۆژهەڵاتا فەیلەسوفی تری وەکو ئەم نەبێت؟".

## فەلسەفەی گەلانی پشتی قۆقاس و ئاسیای ناوەڕاست

بیری فەلسەفی لای گەلانی پشتی قۆقاس و ئاسیای ناوەڕاست، لەسەردەمی دەرەبەگێتیدا گەیشتە ئاستێکی بەرز بەبەراورد کردن لەگەڵ گەلانی دراوسێیاندا.

**لە ئێران:**

لەسەدەی سێیەم و چوارەمی - د.ع - لەئازەربایجاندا پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان دروست بوون. لەکۆتایی سەدەی حەوتەمیشدا کەوتە ژێر دەسەڵاتی عەرەبەوە.. وەکو هەموو ناوچەکانی پشت قۆقاس و ئاسیای ناوەڕاست فەلسەفە لەناو فەلسەفەی عەرەبی - ئیسلامیدا پەرەی سەندو بەتایبەتی مەزدەکی و مانەوی و سۆفیزم و گەڕیدەیی ڕۆژهەڵاتی.. باهمینار(ساڵی ١٠٦٥ کۆچی کردووە) لەبەناوبانگەکانی گەڕێدەیی ڕۆژهەڵاتی بوو، دانراوەکانی بەعەرەبی نووسیوەو هەوڵی داوە فەلسەفەی ئەرستۆو ئەفلاتونیی نوێ یەك بخات.

لەناودارو ڕووناکبیرە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەلسەفییەکانی ئەم وڵاتە شاعیرو ڕوناکبیر نظامی غیاندجفی (١١٤١ - ١٢٠٩) بەناو نابانگ بوو، بەگشتی ئیدیالیست بوو لەفەلسەفەکەیدا، بەڵام کردارەکانی چەند بیرێکی مەتریالیستی و دیالیکتیکی عەفەوی تیا بووە... بەتوندی ڕەخنەی لەستێمی کۆمەڵایەتی و ژیان و ڕەوشتی کۆمەڵگەی سەردەمی خۆی گرتووە، خواستی جەماوەری بەرینی چەوساوەی دەرخستووەو

ئازایەنــە لــەدژی زۆرداریــی کۆمەڵایــەتی و چەوســاندنەوەی بــێ ڕەزای دەرەبەگــەکان وەســتاوە، کۆمەڵگــەی دەرەبەگایــەتی بــە ـ بەندیخانــەی شوم ـ ناوبردووە.. لە "ئیقبال نامە" دا نظـامی نەخشــەی شـارێکی بـێ وێنــە ئەکێشــێ کــە نــەفرمانڕەوای تیایــەو نەرەعیــەت، نەدەوڵەمەنـدو نەهەژار.. هەموو کەس لەژێر سایەیدا ئازادی تەواوو مـافی یەکسانیــیان هەیە.

**لە ئەرمەنستان:**

لەسەردەمی پێکهاتنی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان، لەسـەدەی چوارەمدا، بیری کۆمەڵایـەتی و فەلسـەفی لەئەرمەنسـتان دەرکـەوتووە. لەسەدەی پێنجەمدا "یزنیك کوهپستی" دانـەری زمـانی ئـەدەبی کۆنی ئەرمـەنی، یـەکێك لـە ڕووناکبیرە دەرکـەوتووەکان بـووە کـە هێرشـی کردۆتە سەر فەلسەفەی مانیی و دوانەیی Dualist لەسەدەی شەشەم و حەوتەمیشدا گەلێ فەیلەسوف هاتنە پێشـەوە، وەکـو داڤیـد ـ سـەدەی شـەش ـ کـە ڕووناکبیری سـەرکردایەتی دەرەبـەگێتی و فەیلەسـوفێکی ئیدیالیست و نوێنەری ئەفلاتونیی نوێ بووە.. جیهانی مەتریالی لای ئەم بەرهەمی گیانی جیهانییە یان یەزدان. تەنها دەسەڵاتی یەزدانە کـە ئـەم جیهانــە بــەڕێوە ئــەبات. ئــەم ڕا ئیدیالیســتانەی هەنــدێ ڕەگــەزی مەتریالیســتانەی تێکـەڵ بـوو. ئـەوەی جێگـەی سـەرنج ڕاکێشـانە لـە فەلسەفەکەی ئەم فەیلەسوفەدا: تیۆرییەکەیەتی دەربـارەی سـێ شـێوە بۆ هەبوون: "یان بەمەزەنە، یان لەوانەیـە لـەبیردا بێـت، یـاخود بەسـەر

بەخۆ لەبیر" هەروەها تیۆرییەکەیەتی دەربارەی زانین. سروشت هەروەکو یەزدان بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەهۆش هەیەو دەتوانرێ جیهان دەرك پێبکرێ.. پرۆسەی زانین لەهەستەکانەوە دەست پێ دەکات ـ کەپلە یەکەمی زانینە، ئینجا خەیاڵ کردنەوەو مەزەنەو تێوربوونەوەو ئەقڵ بەدوایا دێن. بەلام "شیراکسی" جوگرافی زان و فەلەك ناس و زانای ماتماتیك بەناوبانگترین ڕووناکبیری زانستی و فەلسەفی ئەرمەنستان بو لەسەدەی حەوتەمدا.. هەوڵیدا کە لەدانراوەکانیدا وێنەی جوڵان و گۆڕانی جیان دەربخات..

"فوروتنیسی" ١٣١٥ دەوروبەری ١٣٨٨ ڕۆڵێکی گرنگی لەپەرەپێسەندنی بیری فەلسەفی لەئەرمەنستان بینیوە.. ئیدیالیستانە بیری کردۆتەوە، بەلام لای ئەم سروشت لەیەزداندا نییە بەڵکو لەدەرەوەیەتی، هەروەها لەتیوری زانیندا هەندێ ڕەگەزی مەتریالیستانەی تیابوو.. دوای ئەمیش فەلسەفە هەر لەپەرسەندندا بووە.. بەلام لەدواییدا دووچاری گرفتی قوڵ بووە کە داڕوخانی گشتی ژیانی ئابوری و کەلتوری ئەم ولاتە دروستکەری ئەو گرفتانەبوو.

**لە جۆرجیا:**

لەسەدەی شەشەمەوە لە جۆرجیا ئایدولۆژی دنیایی دژ بەدۆگماتیزمی کلێسە دەرکەوت. نوێنەرانی ئەم ڕێبازە لایان وابوو کە بایەخدان بە مەسەلەکانی ژیانی ئەم جیهانە ئەبێت ئەرکی ئیدیۆلۆگەکان بێت. سەدەی دوانزدەو سێزدەیەمیش سەردەمێکی گرنگ بوو

لەمێژووی جۆرجیا چونکە لەو ماوەیەدا ئەم وڵاتە سەربەخۆیی خۆی بەدەستهێناو لەیەک دەوڵەتی ناوەندیدا یەکخرا، لەو ماوەیەدا بیری فەلسەفەی یۆنانی بڵاوکرایەوەو لەسەدەی دوانزدەیەمیشدا "شوتا رۆستاڤیلی" شاعیر رۆڵێکی دەرکەوتووی لەپەرەسەندنی بیری کۆمەڵایەتی لەجۆرجیادا وازی کردوە.. قەسیدەکەشی (سوارێك لەبەرگی پڵنگدا) لوتکەی رۆشنبیرێتی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی جۆرجیا کۆن بووەو یەکێکە لەجوانکارییەکانی ئەدەبی جیهانی.. راستە ئەم شاعیرە وشەی "یەزدان" و "ویستی خوداوەند"ی بەکارهێناوە بەلام ئەم خوداوەندە بەوە تێدەگات کە "کەماڵی هەموو بوونێکە" و هیچی تر.. تارادەیەکی زۆر، گرنگی دابوو بەمەسەلەکانی رەوشت، وای دانابوو کە راستی و هەڤاڵێتی گرنگترین سەرەتاکانی رەوشتن. "رۆستاڤیلی" شاعیرێکی مرۆڤپەروەری گەورە بوو کە مرۆڤ و ژیانی جیهانی واقیعی.. هەموو بیری داگیرکردبوو. لە لایەنگرانی دامەزراندنی یەک دەوڵەتی ناوەندی بوون، داوای سنووردار کردنی دەسەڵاتی پاشای ئەکردو ئەبووت پێویستە، رەوایەتی و دروستی، زۆر بەوردی لەبەر چاوبگیرێت،..

## ١ـ فەلسەفەی گەلانی ئاسیای ناوەڕاست:

لــــەنێوان ســــەدەکانی چـــواردەم و شەشـــەمدا پەیوەندیــــیە دەرەبەگایەکان لەئاسیای ناوەڕاستدا دەستیان کرد بەدەرکەوتن و بەدرێژایی هەردوو سەدەی نۆیەم و دەیەمیش میرنشینی دەرەبەگایەتی ناوچەیی دائەمزران کە لەخەلافەتی عەرەبی سەربەخۆ ئەبوون.. لەو ناوچانەی ئاسیای ناوەڕاستدا زانستەکانی سروشت گەشەیان کرد. ئەبو بەکر خوارەزمی ـ سەدەی نۆیەم ـ زانایەکی گەورەی جوگرافیاو فەلەك و ماتماتیکی ئەو سەردەمەبوو. بەرهەمەکانی ماتماتیکی هیندی و یۆنانی عــەرەبی پەرەپێداو بــڵاوی کــردەوە. یەکــەم کــەس بــوو کەجــەبری بەزانستێکی ماتماتیکی نوێ داڕشت.. لەناودارەکانی تری ڕوناکبیرانی ئاسیای ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا: فارابی و بیرونی و ئیبن سینا بوون*..

لەدوایــیشدا ئــەبێت پەنجــە درێژکــەین بــۆ شــاعیرو فەلــەك نــاس و ڕونـاکبیری گــەورەو زانــای ماتماتیــك عومــەر خــەیام ـ ١٠٤٠ ـ ١١٢٣ ـ کارەکــانی لەجەوهــەردا مەتریالیســتانە بــوون. ئازایانــە بــیری ئایــینی ڕەخنە لــێ ئــەگرت و حاشــای لەنــەمریی دەروون و بــوونی جیهــانێکی تــر ئەکرد.

---

*کەلەشوێنی خۆیدا باسیان کراوە..

## ٢ـ فەلسەفە لەوڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوادا.

**تۆخی پەرەسەندنی فەلسەفە لەکۆمەڵگەی دەرەبەگێتیی ئەورووپا خۆرئاوادا:**

دەرەبەگێتی (بەندەگێتی) لە ئەورووپای خۆرئاوادا لەسەر شوێنەواری کۆمەڵگەی کۆیلەیەتی دروست بوو. ئەوانەی لەزەوی دەرەبەگەکاندا کاریان ئەکرد لەلایەك و دەرەبەگەکان، کە بەری ڕەنجی ئەوانیان بۆ خۆیان ئەبردو دەسەڵاتیان هەر لەدەستی خۆیاندا چڕ ئەکرد؛ لەلایەکی تر.. ئەوانە دوو چینی سەرەکی بوون لە کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتیدا.. شان بەشانی ئەو دوو چینە، پیشەگەریش هەبوو کەلەناو جوتیاران و بازرگانەکانەوە پەیدا ئەبوون. پیاوانی کڵێسەش ڕۆڵێکی گەلەك گرنگیان لەژیانی کۆمەڵدا ئەبینی، چونکە موڵکدارێتی کلێسە بۆ زەوی زۆرو بەربڵاو وای لێکرد کەببێتە هێزێکی ئابووری ـ کۆمەڵایەتی گەورە. کڵێسوکەش بوو بوون بەقەڵاو مەڵبەندی کاری کشتوکاڵ لەسەر شێوازی دەرەبەگی و دام و دەستگای ڕۆناکبیری و کەلتووری ئەو سەردەمە.

لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا و بەدرێژایی سەدەکانی سیستەمی دەرەبەگایەتی، ئایدیۆلۆژی ئایین بەسەر ژیانی ڕۆشنبیریدا زاڵ بوو، دژی نێو چینایەتیش لەو سەردەمانەدا بەرگی ململانێی ئایینی پۆشی بوو. فەلسەفەش کرا بوو بەخزمەتکاری لاهوت.

گەلانی خۆرهەلات پەرەیان بەو زانیارییە زانستی و فەلسەفییانەدا کە کۆمەلگەی کۆیلەیەتی بەدەستی هێنابوو.. لەدواییشدا، لەبارودۆخی کۆمەلگەی دەرەبەگێتی نوێدا، لەسەرخۆ پەرەی پێدرا. لەگەل روخاندنی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا، لە رۆما خۆی و لەو دەولەتە ساوایانەشدا کەلەو ناوچانەی لە پێشا لەژێر دەستی رۆمادا بوون، دانەمەزران (ئیتالیا، ئسپانیا، فەرەنسا، ئەلمانیاو ئینگلتەرەی ئیستاکە) ئاستی کەلتوری بەشێوەیەکی هەست پێ کراو نزم بووبوەوە.

دوای بلاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی کلێسە بووە پارێزەری کەلەپوورو ئینجا رۆشنبیرکردن لە ئەوروپادا.. بەلام هەلوێستی دژانەی بەرامبەر مەتریالیزم، پالی بەپیاوانی کلێسەوە نا کە تەنها کەلەپوری فەلسەفی ئیدیالیستانە بلاو بکەنەوە.بۆیە شتێکی سەیرو سەمەرە نەبوو کەزانستەکانی عەرەبی ـ ئیسلامی، کەلە ولاتانی خۆرهەلات و ئەندەلوس گەشەیان ئەکرد، بەدرێژایی چەندین سەدە ـ تانزیکەی سەدەی شانزدەیەم ـ لەپێش زانستەکانی ئەوروپای خۆرئاواوە بن، بەلام پەرەسەندنی رۆشنبیری لەگەل جیاوازی ئاستیاندا لەخۆرهەلات و خۆرئاوا، پەرەسەندنی یەك رەگەزی بوو کە سستێمی دەرەبەگایەتیی بوو.

بۆیە هاسان نەبوو کە، ئایینی مەسیحیش ببێتە ئایدیۆلۆژی زال و بێ بەربەرەکانی لە خۆرئاوادا.. چونکە ئەبوو زۆرانبازییەکی توندوتیژ بکات تابەسەر ناحەزو دوژمن و بەرهەلستکەراندا سەر بکەوێت،

بەتایبەتی لەبێزەنتەو ڕۆما و لەناوچەکانی هیلنیستی و لەسەرووی ئەفریقاو پێشەوەی ئاسیاو لەدەوڵەتانی ئەورووپای خۆرئاوادا کە هاتنە سەر ئەم ئایینە نوێیە. دوای تێپەڕبوونی چەند سەدەیەکیش، لەسەدەی پێنجەمدا کە ئایینی عیسا لە یۆنان و ڕۆمادا کرا بەرەسمی، ئەو ساکاری فەلسەفەی ئەفلاتونی نوێ و دژی ئاینی مەسیحی یە لەناو ڕۆشنبیرەکاندا بەهێزبوو. ململانێی نێوان لاهوتیەکانیش لەدوو تێندێنسدا خۆی ئەنواند: لایەك داوای ئەکرد کە نکوڵی لەمەزەبە فەلسەفیە ئیدیالیستە کۆنەکان بکرێ، لەیەکەی تریش داوای بەکارهێنانیانی ئەکرد - ئەگەر بەشێکی کەمیش بێت - بۆ ئەوەی بەرگری لە ئایین پێ بکرێ و دروستیی باوەڕەکانی پێ بسەلمێنرێ..

لەم سەردەمی زۆرانبازی مەسیحییەت و تێندێنسی بڕوا بەچەند خوایەك کردندا زانستی ئاخاوتنی مەسیحی Apologeties بەرگریکەر لەباوەڕەکانی ئایینی مەسیحی و دوای ئەمیش "نووسینەکانی کڵێسە" patristies و نووسینەکانی "باوکانی کڵێسە" کە بنچینەکانی فەلسەفەی مەسیحییان دانا، دەرکەوتن و هەردوو ڕێبازەکەش لە یۆنان و ڕۆمادا پەرەیان سەند. هەر لەسەرەتای سەدەی سێیەمیشەوە زاناکانی ئاخاوتن هەوڵیاندا ئیمپراتۆرکان تێبگەیەنن کە ئایینی مەسیحی هەر هەمان ئەو پرسیارانە ئەخاتەڕوو کە فەلسەفەی یۆنانی "بت پەرستی" خستبویەڕوو، بەڵام ئایین وەرامی کامڵتری داوەتەوە.

لەسـەدەی دووەمـدا لـەنێوان ئایـینی مەسـیحی و گنۆسـتیزم Gnosticism کەلەسـەدەی یەکەمـدا دەرکـەوت و لەسـەر بنچـینەی تێکـەڵکردنی بـاوەڕی مەسـیحی و ئایـینی جولەکەو ئایـینی کۆنـەکانی ڕۆژهـەڵات، دروسـت بـوو، کـە لەدوایـیدا پەرەیسـەند بـۆ دوو ڕێبـاز: مەسـیحی و بـت پەرسـتی.. زۆرانبـازی لەبەینیانـدا توندوتیـژ بـوو. لەئیدیۆلۆگـە بەناوبانگەکانی "باوکـانی کڵێسـە" ئۆگەسـتین بـوو ٣٥٤ ـ ٤٣٠ بیرەکـانی ئـەم کـارێکی گـەورەیان کـردە سـەر پەرەسـەندنی فەلسەفەی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی. بیروڕاکـانی ئۆگەسـتین ناکۆکییـە قوڵەکانی کۆمەڵگەی کۆیلەیـەتی دەرنەخسـت کەبـەرەو نـەمان ئەچوو، هەروەها کۆسپەکانی ڕێگەی کۆمەڵگەی دەرەبەگێتی نوێی نەخستەڕوو کە ئەبێتە جێگرەوەی کۆمەڵگەی پێشوو.

سـکولانیزم لەوشـەی لاتینـی Sehola ـ قوتابخانـەوە هـاتووە، ڕێبـازێکی سـەرەکییە لەفەلسـەفەی کۆمەڵگـەی دەرەبەگایەتیـدا.. ئـەم فەلسـەفەیە لەپێشـەوە لـە قوتابخانـەکان و لەسـەرەتای سـەدەی دوانزدەیەمیشەوە لە زانکۆکاندا دەخوێندرا.. لەسەدەکانی دوایشدا ئـەم وشـەیە بـووە هاومانـای زانسـتی لـەژیان دابـڕاوو نـەزۆك لـەڕووی پراکتیکـەوەو دوور لـە تێوردبوونـەوەو ئـەزمون و بەسـتراوە بەملکەچـی کوێرانە بۆ ڕووناکبیرانی پێشوو. ئەم فەلسەفەیە بەسێ پلەدا تێپـەڕبوو: سکولانیزمی سەرەتایی، پلەی پێگەیشتن، پلەی داتەپان.. کەلەسەدەی نۆوە تاسەدەی پانزدەیەمی خایاند. مەسەلەی پێوەندی نێوان زانـین و

ئيمان تەوەری سەرەکی ئەم فەلسەفەیە بوو. زۆربەی سکولانییەکان لە لایەنگرانی "ریالیزم"بوون ـ سەدەی دوانزدە ـ بەلام لە سەدەی یانزدەوە بۆ یەکەم جار دژەکانی ریالیزم دەرکەوتن کەلایان وابوو توخم و جۆرەکان شت نین (Res نین) بەلکو دەنگ و وشەو ناون (Nomina).
رۆسلان (دەوروبەری ١٥٥٠ لەدایك بووە) رابەری ئەم رێبازەبوو کە بە "ناویی" ناوبراو. لەناو ریالیستەکانی سەدەی یانزدەیەمدا، ئیدیۆلۆگی ئیتالی ئانسلم ـ ١٠٣٣ ـ ١١٠٩ ـ دەرکەوت، ناوبراو ریالیستێکی لاتنگیر بوو، لای وابوو کەتێگەیشتەکانی خێر، ماف، رەوا، بۆ خۆیان هەن، ریالیستن، لەدەری کردەوەی سەلتن کەخەلك وەکو کردەوەی خێرومەند هەلیاندەسەنگێنن و لەدەری تێگەیشتەکانن کە خەلك وەك تێگەیشتەی رەوا ئەیاننرخێنن، لەدەری کردارەکانن کە خەلك بەکرداری رەوا پێناسیان ئەکەن. لەگەل ئەم لاتنگیریەشدا، تێندینسی "ئانسلم" لەسەلماندنی هەبوونی یەزداندا، پەنابردنە بەر ئەقل بوو.

لەناودارانی سکولانیزمی خۆرئاوا لەسەدەی دوانزدەیەمدا، پێتر ئەبلیار ـ ١٠٧٩ ـ ١١٤٢ ـ ناوبانگی دەرکرد، لەدژی هەردوو فەلسەفەی ناوێتی لاتنگرتەو ریالیزم وەستاو لای وابوو کەئەبێت ریالیستیی تێگەیشتە گشتییەکان یان ماناکان بسەلمێنرێ بەلام لەزەینی یەزاندا. هاوبەشی ئەو هەولدانەی کرد تا، تێندێنسی ریالیستیی مامناوەندی بخرێتە ناو سکولانیزمەوە، بەلام بەرەی کونەپەرستی سکولانیزم، بەربەرەکانییەکی بەهێزی بیروراکانی کرد.

سۆفیزم مەزهەبی باوەڕ بوونە بەتوانستی مرۆڤ کەراستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ یەزداندا هەبێت. سۆفییەکان ئەم هەستە خۆییەی (واهیمەیە) پەیوەندی مرۆڤ بەیەزدان ـ یان ئەخستە سەروو هەموو باوەڕێکەوە، بەهی کڵێسەش خۆیەوە. سۆفیزم هەندێ جار شێوەیەکی بەربەرەکانی ئایدیۆلۆجی ئایینی بوو لەکۆمەڵگەی دەرەبەگایەتیدا.. ئینگلس ئەڵێت: "بەربەرەکانی شۆڕشگێڕانەی دژ بەدەرەبەگایەتی، هەموو سەدەکانی ناوەڕاستی گرتەوە، بەپێی دۆخی هەر سەدەیەك یان بەشێوەی سۆفیزم یان هەرتەقەی ئاشکرا یان بەشێوەی راپەڕینی چەکدارانە دەرئەکەوت (١٥) ". دیارە باڵە کۆنەپەرستانەکەی ئەم رێبازەش نوێنەرانی خۆی هەبووە، بەناو بانگەکانیان "بیرنار ئۆف کلێرفۆ" (دەوروبەری ١٠٩١ ـ ١١٥٣) بوو. سکولانیزمی خۆرئاویی، لەسەدەی سیانزدەیەمدا. گەیشتە ترۆپکی گەشەکردن. سەبارەت بە پەرەسەندنی ژیانی کۆمەڵایەتی و.. بەرین بوونی چوار چێوەی فەلسەفەو بڵاوکراوە زانستییەکان، پاڵپێوەنەرێکی گەورەبوون بۆ پەرەسەندنی فەلسەفەی سکولانیزم. لەمەدا دانراوەکانی ئەرستۆو ئەفلاتونی نوێ رۆڵێکی گەورەیان بینی لەدژی هەموو جوڵانەوەیەکی هەرتەقی دژ بەکڵێسەو بۆ ململانێی لەدژی بیرە نوێیەکانی فەلسەفە کە پێدزەیان کردبووە ناو لاهووتەوە. بۆ چەسپاندنی جێگەی کڵێسەی کاسولیکی.. لەساڵی ١٢١٥دا دومینیکانی دروست بوو.. کە خاوەنەکانی ناوی خۆیان نا Dominicanes ـ راهیب ـ جگە لەدۆمینیکانی و

فەرەنسیسکانی، پاپایەتی پەنای بردە بەر دادگای پشکنین بۆ بەهێزکردنی ئایدیۆلۆژی و سیاسەتەکەی خۆی...

بڵاوبوونەوەی بیروڕا خوانەناسییەکان لەسەدەی سیانزدەیەمدا، بایەخێکی گەورەیان هەبوو بۆ پەرەپێدانی بەریەرەکانی ئەنتی سکولانیزم Antischolastic، بۆ دژایەتی کردنی ئەم بەریەرەکانییە کڵێسە گەلێك دامودەستگاو فەیلەسوفی دڵسۆزی خستە مەیدانەوە.. لەوانە "تۆمای ئەکوینی" بوو.. ئەم زانایە لای وابوو کە ئەقڵ و ئیمان یەك یەکێتی گونجاو پێك ئەهێنن و هیچ جیاوازییان نییە... بەڵام ئەقڵ لەکۆڵینەوەیدا بەدوای ڕاستیدا لەوانەیە لەگەڵ باوەڕە ئایینییەکاندا بکەوێتە ناکۆکییەوە.. لێرەدا ئەکوینی ئەڵێت بەبێ گومان هەر ئەبێت یەکێکیان ڕاست نەبێت، لەبەر ئەوەی ئیلهامی یەزدانی هیچ شتێکی هەڵەی تیا نییە، بۆیە سەرەنجامی ناکۆکییەکە ئەوە ئەگەیەنێت کە ئەقڵ ناڕاستە نەك ئیمان، فەلسەفە نەك لاهوت. هەروەها ڕیالیستی لەگەڵ شوێندا جیا ئەکردەوەو ئەیووت: هەموو شتێك یەکگرتنی "مەتریال" و "وێنە"یە. "مەتریال" توانستی قبولکردنی وێنەیەو "وێنەکە"ش "ریالیستە" بەنیسبەت مەتریالەوە کە ئەو وێنەیەی وەرگرتووە. لای وابو: کە مەتریال دابڕاو نابێت لەوێنە، بەڵام بەبێ مەتریال هەیە بەوە دەیەوێ بڵێ، مەتریال لەیەزدان سەربەخۆ نییەو نابێت.. لەو تێگەیشتنانەوە ئەکوینی دەستی کرد بەپەرەپێسەندنی "سەلماندنەکان" لەسەر بوونی یەزدان. جیهان لای ئەم لەگەڵ کڵێسە

گونجاوە، جیهانێکی کۆتایی و سنووردارو داخراوە، ئەستێرەکانی ناگۆڕێن و لەناو ناچن. لەژێر کاری جوڵێنەرە ئەقڵییەکاندا دەبزوێن. دیسان ئەیووت لەبەر ئەوەی ئەقڵ بەستراوە بەهەستەوە بۆیە زانین لەبارنەی جیهانی هەستی دەرناچێت، بەڵام جیهانی سەروو هەستی نایگێرێتەوەو دیسان مەزەنەکردنیش نایگێرێتەوە. تۆمای ئەکوینی بەو پێیە لەلایەنگرانی ریالیستی مامناوەندی بووە، حاشای ئەکرد لەبوونی هاووێنەیی یان بەرامبەری تەواو لەنێوان بیرەکانمان و واقیعدا.

ئەم زانایە لای وابوو کە دەسەڵاتی دەوڵەت لەیەزدانەوە دێت، بەڵام ئەبێت شێوەکانی بەپێی گۆڕانی دۆخەکان بێت. لای ئەم پاشایەتی لەهەموو شێوەکانی تر باشتر بوو... هەروەها دەیگوت ژیانی جیهانی ناوە دەوڵەت تەنها پلەیەکی خۆ ئامادەکردنە بۆ ژیانی گیانیی پاشە رۆژ.....

لە زانا بەناوبانگەکانی تری سکولانیزم: "دونس سکۆت" دەورووبەری ١٢٦٥ ـ ١٣٠٨ ـ بوو. مەسەلەی سەرەکی لای ئەم پەیوەندی لاهوتە بەفەلسەفەوە.. فەلسەفەکەی لەبنچێنەدا ئیدیالیستی بوو.. یەزدان لای ئەم تەنها وێنەیە. بەڵام هەبوون و شتەکانی تر هەمووی لەوێنەو مەتریال پێکەوە دروستبوون. ئەمەش مانای وایە کەشت هەمووی مەتریالە، بەگیان و فریشتەکانیشەوە.. گیان لای "سکۆت" وێنەی لەشی مرۆڤە کەیەزدان هەر لە لەدایك بوونەوە لەلەشدا خوڵقاندوویەتی و

بەدرێژایی ژیانی لێی جیا نابێتەوە. گیان یەکەو نەمرە. ڕەخنەکانیشی لەسکولانیزم لەخزمەتی لاهوتدا بووە.

شان بەشانی سکولانیزم.. ژمارەیەك زانا لەسەدەی سێنزدەیەمدا هەڵکەوت.. لەدەرکەوتوترینیان "رۆجەر بیکۆن" (دەوروبەری ١٢١٤ ـ ١٢٩٤) زانکۆی ئۆکسفۆردی خوێندو لەپاریس بوو بە ئەندامی فەرەنسیکانی.

فەلسەفەکەی "بیکۆن" بێزاری بوو لەدژی پایەگا کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی دەرەبەگێتی. لەکەس نەئەترساو بەپرکێشییەوە ڕەخنەی لەرەوشتی سەردەمی خۆی گرتووەو ڕەحمی بەکەس نەکردووە تەنانەت بەخودی پاپاش. ئەم ڕەخنانەی بوونە هۆی توڕەیی کڵێسەو لەزیندان توندکردنی لەساڵانی ١٢٧٨ ـ ١٢٩٢ لە دوای ئەوەش زۆری نەخایاند کە مرد.

نرخی مێژوویی بیرە زانست و فەلسەفەییەکانی "بیکۆن" یەك لایی نەبووە. لەزانست و دەستپێکردنی زانستدا نوێخوازو داهێنەرێکی وابوو کەزۆر پێش سەردەمی خۆی کەوتبوو.. بۆ فەلسەفەش نەك هەر کەمتەرخەمی لەرا زانستییەکانی نەکردووەو بەس، بەڵکو هەر بەو جۆرەش بووە بەفەلسەفەی سەردەمی خۆی، بەڵام ڕاکانی دەربارەی زانین شوێنەواری سۆفیزم و لاهوتیان پێوەلکاوە.. لەگەڵ ئەوەشدا تێگەیشتنێکی ڕەخنەگرانەی بۆ سکولانیزم خستەڕوو، هەروەها تێگەیشتنێکی نوێی بۆ زانست و ئەرکی سەرشانی دەرخست.

تێگەیشتەی مەتریالی لە تێگەیشتەی یەزدان جیا کردۆتەوەو گەڵێ بیری هاوپێوەند بەشێوەی تەنەکان و گێتی و جولآن و زمان و ئەزەلی و بۆشایی پەرەپێدا..

ئەزمون و بیری لۆجێکی و ڕای پێشینان، سەرچاوەی سەرەکی هەموو زانیارییەکانمانن: هەتا دروستترین بیر (بەمانا لۆجیکییەکەی) نەبێت یەقینەکەی بەتاقیکردنەوە بنجبەست بکرێت.. ئینجا ئەیووت: لەگەڵ ئەوەشدا بەتەنها ئەزموون بەس نییە بۆ بەیەقین گەیشتن... بەڵکو شێوە بەرزەکانی زانین کەلاهوت و فەلسەفەیە، پارمەتیدەرن. بەو جۆرە بیکۆن ـ لەخستنەڕووی پلەکانی زانیندا ـ مەڵبەندی زانست بەجێ ئەهێڵێ و بەرنگەی سۆفیتی و غەیبێتیدا ئەڕوات.

لەسەدەی چوارەیەمیشدا مەزەبی "ناویی" Nominalism بەرەوڕووی بوژاندنەوەیەکی گەورە بوو، "ولیەم ئۆکان" ـ دوروبەری ١٣٠٠ ـ دەوروبەری ١٣٥٠ ـ ڕابەری ئەم بوژاندنەوەیە بوو، قوتابخانەی ئۆکامی دامەزراند، ئەمیش ئەندامی فەرەنسیسکانی بوو.. لەدژی چاو نەزیرە سیاسییەکانی کلێسە بوو.. زانست ئەکات بەدوو بەشەوە: ڕیالیستی و نەقلیی.. سیمای ڕێبازی ئۆکامی "دوانەیی" بووە. لەلایەك ئەو ڕایانەی پەرەپێدەدا کەدەیووت ئەزموون سەرچاوەی زانینە، لەلایەکی تریش ئامرازەکانی زانین بە "نیشانەکانەوە ـ ڕەمز" ئەبەستێتەوە. تێندێنسی "ناویی" لەرا سایکۆلۆجییەکاندا ڕەنگی

ئەدایەوە. ئەم فەلسەفەیە نەك هەر لەئینگلستان بەڵکو لەدەوڵەتەکانی تری ئەورووپاش بڵاوبووەوە.

لەلایەنگرەکانی ئەم فەلسەفەیە "نیکۆلای دوترکور" بوو کە ئەنجامی لاتنگیری لەراکانی "ئۆکام"دا هەڵهێنجا. حاشای لەوە ئەکرد کە بتوانرێ دروستیی سەرەتاکانی ئایینی بەسەلماندنی فەلسەفی بکرێ. ئەم فەیلەسوفە لەرا سرەشتییەکانیدا ڕادیکاڵتر بوو،چونکە ڕووی خۆی لە ئەرستۆتالی وەرگێراوە ڕووی کردە گەردیلەیی ئەبیقوری وە لەسەر دەستی ئەمدا بوو کەسکولانیزم بە هەندێ بیری مەتریالیستانە موتوربە کرا.

سکولانیزم شێوەیەکی تایبەتی بوو لەشێوەیەکانی فەلسەفە کە ژیانی گیانی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی پێ جیاواز ئەکرد.فەلسەفە یا زانستی ناو ژیانی زیاتر لە هەزار ساڵی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی ئەنجامێکی وای نەبوو کەشیاوی باسکردن بێت،چونکە ڕۆناکبیران،هەتا دەرکەوتووەکانیشیان،چاویان نەبرییە کۆڵینەوە لەراستیی،بەڵکو بیریان لای ڕێگەو شوێنی سەلماندنی دروستی باوەڕە ئایینییەکان بوو. بۆیە فەلسەفەیەك لەسەر ئەو بناغانە وەستا بێت ئەبوو هەر بەرەو داروخان بچێ،بەتایبەتی لەبارودوخێکدا کەزانست جێگەکانی خۆی بەهێز ئەکرد و ڕووی کردبووە مەیدانی کۆلینەوەی تا ڕادەیەك سەربەخۆ.. ئەوەبوو لەکاتێکا کە شێوەی بەرهەمهێنانی نوێ لەناو هەناوی دەرەبەگایەتیدا دەستی پێکرد و پەیوەندییە کۆمەلایەتییە سەرمایەدارەکان دروست

نــەبوون کەرنگــەی خۆشــکردن بــوو بــۆ هاتنــە رووی کۆمەڵگــەی سەرمایەداری،لە هەمان کاتدا ئەو دیاردەیەش هاتە ئاراوە.

## ٣-بیری فەلسەفی لە ڕوسیادا( یەدەی نۆیەم-سەدەی حەڤدەیەم )

بەدرێــژایی چــەندین ســەدە گەلــە ســلاڤییەکان ناچــار بــوون کــە خەباتێکی توندو تیژ بکەن لەدژی خێلەکانی هون و خێلە شوانکارەکانی ئاڤاری و هازاری و بتشنگی و بولوڤی و خێلەکانی تر، کە هــەولیان ئــەدا بیانخەنــە ژێــر ڕکێفــی خۆیانــەوە.بەدرێــژایی ماوەکــانی نێــوان ســەدەی شەشەم و هەشتەم پروسەی پێکهاتنی قەومی*روسی بەردەوام بوو، کە ئەمەش بووە هۆی یەکخستنی خێلە سلاڤییەکانی ڕۆژهەلات لە ناو چــوار چێوەی دەولەتی یەکگرتووی ڕوسیای کۆن لــە نێــوان ســەدەی نۆیــەم و دەیەمدا،بەلام پێشەکییە کۆمەڵایەتییە–مێژووییەکانی دروست بوونی ئەم دەولەتە دەرەبەگایەتییــەی ڕوســیا بــەکورتی ئەمانــە بــوون:دەرکــەوتنی پاشایەتی دەرەبەگێتی تایبەت بەزەوی و بوونــە هــۆی گەنــدەڵ بــوونی سستێمی خێلەکی–هاوبەشێتی و پەیدابوونی جیاوازی کۆمەڵایەتــی ولــە گەیشدا توندو تیــژبوونی نــاکوکی و دەســتپێکردنی ســەرەتای ململانێــی چینایەتی لەنێوان دەولەمەندو هەژار،تێرو تەسەل و بــێ بەشــەکانداو لــە دواییشــدا بەرپابوونی ڕاپەرین ویاخیبونی عەفەوی جوتیاران لە دێهات و لەناو پیشەگەرەکانی شارەکاندا.

گەلانی سلاڤی کۆن چەند خوایەکیان ئەپەرست.نووسینی ڕوسیش لە نێوان سەدەی هەشتەم و نۆیەمــدا دەرکــەوت و کــارێکی گــەورەی کــردە ســەر پەرەپێــدانی کولتــوری ڕوســی.لەســەدەی دەیەمیشــدا ڕووداوێکــی

گەورد لە ژیانی کولتوریی و گیانیی ڕوسدا هاتەڕوو،ئەوەبوو کە ئایینی مەسیحی بوو بەرەسمی،ئەمەش کارێکی پێشکەوتوانە بوو،چونکە شارستانێتی بیزەنتەی کۆنی بەگەلی ڕوسیا ناساند و هەروەها لە ناو ئەوەشدا شارستانێتی یۆنان و ڕۆمانیشی پێناساند.زیاتر لەوەش یارمەتی جێگیرکردنی پایەگاکانی دەولەتی دەرەبەگێتی ڕوسی داو پەیوەندییەکانیشی لەگەلّ دەولەتانی ئەورووپای خورئاواو خۆرهەلاتی ناوەراستدا پتەو کرد.

---

*قەوم پلەیەکی ناوەڕاستە لە شێوەکانی کۆبوونەوەی خەلك لەرووی مێژوییەوە،کە لە نێوان خێلّ و نەتەوەدایە.

پەرەسەندنی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانیش بوونە هۆی زیاتر دەولەمەندیی و زیاتر چەسپاندنی دەسەلاتی دەرەبەگ و میریی ناوچەکان،

کە ئەوەش تێندێنسی جیابوونەوەی زیاتر لەبەهێز ئەکرد.سەر ئەنجامیش بەوە دوایی هات کەئەم دەولەتە لەسەدەکانی یانزدەو دوانزەدا دابەش بوو بە میرنشینی بچوکی لەیەك جیا..کە تا سەدەکانی سێنزدە و چواردە درێژەی کێشا و کارێکی خراپی کردە سەر چارەنووسی مێژویی ڕوسیا..چونکە ولاّتەکە کەوتە زۆر دەستی دوژمنە بیانییەکانەوە،مەغول و پاشاکانی سویدو ئەلەمان و تورك..هتد کە ئەیانەویست سامانی تالاّن کەن و عەرزی زەوت کەن وگەلی ڕوسی بچەوسێننەوە..لێرەوە بایەخی زیاتر گرنگی پێدانی ئیدیۆلۆگ و

سیاسییەکانی ڕوس بە مەسەلەی یەکخستنەوەی ئەرزی ڕوسیا لەیەك دەولەتـــــدا کەســـــــەربەخۆیی و ئـــــارامی ولات مســـــــوگەر بکات،دەرئەکەوێت.سەبارەت بەوەی کەفەلسەفە لە مەیدانەکانی تری زانین جیا نەبوو بووەوە..بۆیە پەیوەندییەکی توندی بەلاهوتەوە هەبووەووە مەسەلە فەلسەفییەکان کەدەربارەی گێتی و مروڤ لە سروشت و کۆمەڵداو مەسەلەکانی سایکۆلۆجی و ڕەوشت لە ئەفسانەو سەر گوزەشتەو پەندو ئاموژگاری دوعاو نزای کۆندا خرابونە ڕوو کە زانیارییە مێژوییە جۆریە جۆرەکاندا تیکچرەژا بوون و–بەشێوەیەکی ئاسایی–بەروخساری ئاینانە نەخشیان کێشرابوو.لە سەدەی یانزدەو دوازنزدەیەمیشدا زاراوەی"فەلسەفە"یان "خۆشەویستی زانین"لەسەر لاپەرەکانی کتێب و نوسراوەکان،چ هی کلێسەو چ هی تر،بەکار ئەهێنران.لەنێوان سەدەکانی یانزەو پانزدەشدا ڕوسیا بەنووسین ە بەرهەمی زاناو فەیلەسوفەکانی یۆنان و ڕۆماو سەدەی ناونجیی ئەورووپای خۆرئاوا.. بەباشی ئاشنا بووبو.

بەدرێژایی سالانی سەدەکانی یانزەو سێنزدە..ئیدیولوگە پێشکەوتنخوازەکانی ڕوس،لەبەرامبەری مەترسی پارچە پارچە بوونی ولات بەدەولەتۆکەی دژ بەیەك بێئارام بوون بۆیە ئەوان گرنگییان ئەدا بە مەسەلەی یەکێتی گیانیی میرنیشینەکان و پاراستنی سەربەخۆیی زەوی ڕوسیا و بەهێز کردنی..لە سەرەتای سەدەی پانزدەدا"وتارێك لە پاساو بەختەوەریدا" بلاو بوودوە کەدەربارەی بیرێکی سەرەکی بوو

ئـەوەش بـانگکردن بوویـۆ یـەکگرتنی گـەلانی سـلاڤی ڕوژھـەلات لـە دەولـەتێکی یەکگرتوودا،لەگـەل سـتایش و سـرود ووتـن بـۆ ئـەرزی ڕوسیا..نووسراوەکەش"ئیلاریۆن"دایناوبوو."ئاموژگاریـیـەکانی ڤیلادیمێر مونـاخ"و زور دانـراوی تـر..سـەرەتا وێنـەکانی ڕەوشـتی سـەردەمی دەرەبەگێتی سەرەتاییمان ئەخاتە پێش چاو..

داگیر کردنی ڕوسیا لە لایەن مەغولـە-تەتارەکانـەوە-سـەدەی ١٢-١٥ کارەسات و وێرانکارییەکی بێسنوری دروست کردو بەسـەدان سـاڵ پەرەسـەندنی ئـابوری و رامیـاری و گیـانیی ولاتـی دواخسـت کـە شوێنەوارێکی خراپی لەسەر پەرەسەندنی فەلسەفە وبیری کۆمەلایەتی-رامیـــاری بەجێ‌هێشـــت.لـــەو ســـەردەمانەو ســـەدەی شازدەیەمیشـدا..ململانێیـەکی تونـدو تیـژ لـە بـەینی لایـەنگیرانی دروستکردنی دەولـەتێکی ناوەندی و لایـەنگیرانی خواستی جیابونـەوە دروسـت بـوو..لـەو کاتانـەدا میرنیشـینی مۆسـکۆ دروسـت بـوو..ئـەو ململانێیـــە لـــە ئـــەدەبیاتی سیاســـی و هونەریـــدا ڕەنگـــی ئەدایـەوە.."فیلـوفی"تیـوری"مۆسـکۆ -ڕۆمـای سـێیەم"ی هێنایـە گۆرێ..کـەدوای کـەوتنی ڕۆمـای کـۆن و ڕۆمـای نـوێ-قوسـتەنتینییە-،موسکوی بە جێگیری ئەمینی ئایینی مەسیحی ئەزانی و وای دانابووکـە هەردوو ڕۆمای پێشوو خیانـەتیان لـە ئـاینی ڕاسـتەقینەی مەسـیحی-ئەرسۆزوکسـی- کـردوە،زۆر لـە فەیلەسـوف و ئیدوئۆلۆگـەکان لـەدژی جیابوونـەوە خوازەکـان بـوون، لەوانـە"ئیڤـان بیریسـفیتون" کـە هـاو

سەردەمی "ئیڤانی تۆقێنەر"بوو..راکانی "بیریسفیتون" بۆسەردەمی خۆی پێشکەوتوانە بوو.

سەدەی پانزدەو سەرەتای سەدەی شازدەیەمیش مشتومڕی نێوان"یوسفییەکان"و"نستیجییەکان"ی بینی..یەکەمیان دوسەلاتی گیانیان خستە سەروو دەسەلاتی جیهانی..بەلام دووەمیان هەندێ ڕای ئازادانەیان هەبوو،داوایان ئەکرد سەرنجی ڕەخنەگرانە بدرێت لەئینجیل و لەدژی لەسێدارەدانی هەرتەقەکان بوو...سەرەنجام تاقمی یەکەم سەرکەوتن..چونکە نستیجییەکان بە لایەنگرانی هەرتەقە تاوانبار کران و کەوتنە بەردەم پەلەماری کلێسەی ڕەسمی.

بەلام لەنێوان سەدەی چواردەو شانزدەدا بیری هەرتەقی ڕا ئازادە دژ بەئایدیۆلۆجییە بلاوبووەوە.خاوەنی ئەوبیرانە گومانیان لەرێگەو شوێن و نهێنییەکان ئاین ئەکرد، بێزارییان دەرئەبری لە دژی پیاوانی لاهوت و تەماع و پۆخلێ بوونی ڕەوشتییان..هەلۆێستێکی ڕەخنە گرانەیان لەتەورات وئینجیل وەرگرت.لە سەدەی شانزدەیەمدا بیری هەرتەقی لەسەر دەستی"ماتفی باشکین"و فیوروسی کوسوی"پەرەیان سەند،کوسوی لە ڕوناکبیرە هەر ناودارەکانی ڕوسیای سەردەمی سەدەی شانزدەیەم بوو،هیچ شتێك لە دانراوەکانی نەگەیشتوونە دەستمان،ئەوانە نەبێ کە لە ناو نووسینی نەیارەکانیدا هاتوون..لە ناو یەکسانی هەموو ئادەمیزادەوە بەرامبەر بەیەزدان،"کوسوی"داوای لابردنی جیاوازی و زولمی کۆمەلایەتی و نەهێشتنی باجی ئەکرد،داوای

دانانی یاسای ڕەواو دروستی ئەکرد،کە خەڵك یەکتربیان خۆش بوێت و دەستی یارمەتی بۆ یەمتری درێژ بکەن..بۆیە لەترسی کڵێسەوە ڕای کردە دەرەوەی وڵات.

بیروڕا ئازادەکانی ئەو فەیلەیوف و زانایە بەتێندێنسی ئەقڵی چەند ساتێکی پۆسەتیف بوو لە مێژوی بیری فەلسەفەی ڕوسیدا..لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کامێکیان نەگەیشتە پلەی نکولی کردن لە یەزدان.

لە سەدەی حەڤدەیەمدا نووسەرو ڕوناکبیری بەناو بانگ"سیمون پۆلۆتسکی"١٦٢٩-١٦٨٠لەکتێبەکەیدا(فیرتۆگراد)ی ڕەنگاو ڕەنگ داوای لە بازرگان و فرمانرەواو پیاوانی ئایینی ئەکرد کە خەڵکیان خۆش بوێت،بەهێمنی بریارەکانیان بدەن،لەڕەفتاریاندا سادەو ساکار بن،ستایشی ڕوناکبیری و هەڤالیتیو خۆشەویستی ئەکرد،دژی زۆرداری و توندو تیژی بوو،ئەیووت جیهانی مەتریالی و گیانی بۆ خوا دروست کراون..کاری فەلسەفەش ڕێ پیشاندانی خەڵکەو چاککردنی ڕەوشتیانەو چارەسەری نەخۆشییەکان و فێرکردنی زانین و ئاراستەکردنیانە بۆ ژیانی ڕاست.لە سەدەی حەڤدەیەمدا تیوریەکەی کۆپەرنیکۆس:دەربارەی ناوەندێتی خۆر Heliocentrieism لەهەموو ڕوسیادا بڵاوبووەوە...

کەوابێ لە ڕێگەی بیزەنتەوە بۆ یەکەم جار بیری فەلسەفی و هەندێ دانراوی یونانی کۆن بیزەنتەو لە ئەوروپای سەدەی ناوەڕاست گەیشتنە ڕوسیا.. گۆڕان و چاکردنیان لە سەرکرا کەنرخێکی گەورەیان هەبوو،

ئیدیۆلۆگـەکان سـەرنجێکی تایبـەتییان  ئـەدا لـە ڕێگـەو شـوێنەکانی ڕەوشت دا کـە لەگـەل دۆخـی ڕوسـیای دەرەبەگایەتیـدا ئـەگونجا.شـان بەشانی ئەوانە.. لـەنێوان سـەدەکانی نۆیـەم و حەڤدەیەمـدا ئیدیۆلۆگـە پێشـکەوتنخوازەکان سـەرنجی پرۆسـەی مێـژوییان ئـەداو بایـەخیان بەپاشەڕۆژی نیشتمان دا.بۆ بـەگژکردنی لەگـەڵی چەوساوە هـەندێکیان ڕاپەڕین و نارەزاییـان بەرامبـەر کۆیلـەتی و ڕەتاندنـەوەی دەربڕی..ئالەوانەشدا نرخی مێـژوویی و بیری فەلسـەفی و کۆمەڵایـەتی ڕوسیای نێوان سەدەی نۆو حەڤدە دەرئەکەوێت.

# بەشی سێیەم

-فەلسەفە لە وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوا لە قوناغی گواستنەوەدا لە دەرەبەگایەتییەوە بۆ سەرمایەداری

-کولتوری مروڤایەتی و سەردەمی بوژاندنەوە-رینیسانس.

-سوسیالیزمی یۆتۆبی

## فەلسەفە لەوڵاتانی ئەوروپای خۆرئاوادا لە قۆناغی گواستنەوەلە دەرەبەگێتییەوە بۆ سەرمایەداری

### -سەدەی ١٥تا سەرەتای سەدەی ١٧

لەسەردەمەکانی هەردوو سەدەی چواردەو پانزدەدا سەرەتای شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لە هەندێ شاری حەوزی دەریای سپی ناوەراستدا سەریهەڵدا.لەئیتالیادا هەر لە سەدەی چواردەیەمەوە سەرەتای مانیفاکتۆرە دەرکەوت، ئەمەش وای ئەگەیاند کە پیشەگەری دەستکردو شێوازی بەرهەمهێنانی دەرەبەگیی بەرەوپێش رۆشتووە.دیسان لە گەشەکردن و گەورەبوونی شارەکانیشدا پێش ولاتانیترکەوت،ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو کەرێگەکانی بازرگانی بەدەریای ناوەراستدا ئەڕۆیشت.

ئەو بازرگانییەو پەیدابوونی سووسەلەم و چەوساندنەوەو بەکرێگرتەیی کرێکارو وردە پیشەکارد دەستکردەکان بوونە هۆی پەیدابوونی تاقمێك لەخاوەن بانك و بازرگانی پێشەسازی کە دەسەڵاتی سیاسییان لە شارەکانی ڤینیسیاو جەنەوەو زۆر شاری ترا گرتە دەست.

پێشکەوتنی هێزی بەرهەمهێن لە دۆزینەوەی تەکنیکە گەورەکاندا بەرووونی دەرکەوت.بۆ پێشەوە چوونی گەورە لە تەشی و لە ماشینەکانی تری چنیندا ڕوویدا،دۆلابی ئاو وئاشی هەوا گۆڕانی گەورەیان بەسەر بەرهەمدا هێنا کە تا ئەو کاتە ئەرکی گەورەی کوتبووە سەر هێزی بازووی مرۆڤ و ئاژەڵ..ئەم گۆرانانەش تەوژمێکی باش بوو بۆ پێشەوەچوونی پیشەسازی بەتایبەتی چەك،چونکە گۆڕانێکی گەورەی بەسەر هونەری شەڕدا هێنا، دروستکردنی چەکی گڕدار لە نرخی جەنگی دەستگای سوار چاکی هانیە خوارێ.. هەروەها داهێنانی قیبلەنما زۆر گرنگ بوو.. مارکس بەکارهێنانی باروت و قیبلەنما و چاپخانە لە ئەورووپا لە ناوەڕاستی سەدەی پانزدەدا، بە پێشەکیەکانی دەسپێکردنی بەرهەمهێنانی بورژوایی داناو(١٦).

بەڵام سەرکەوتنەکەی دوایی بۆرژوا لە وڵاتانی ئەورووپای خورئاوادا بەدۆزینەوە مەزنە جوگرافییەکانەوە بەسترابوونەوە- کۆتایی سەدەی پانزدەو سەرەتای سەدەی شانزدە- دۆزینەوەی ئەمەریکاو ڕێگەی دەریایی ڕودو هیندیستان و گەشتەکەی ماجەلان بەدەوری زەویدا..بوونە هۆی شکاندنی سنووری کۆنی زەوی،بەڕادەیەك کە ئەنگلس ئەڵێت:"ئێستاکە و تەنها بۆ یەکەم جار جیهان بەڕاستی دۆزرایەوە و بنچینەی بازرگانیی ئاینددەی جیهانی دانراوو پیشەسازی دەستکرد گواسترایەوە بۆ مانیفاکتورە،هەر ئەوە گواستنەوەیەش بووە هۆی ناوکی پیشەسازییە مەزنەکەی سەردەم(١٧)".

ئەم گۆڕانە ئابورییانە کە لەکوتایی سەردەم ١٥ و سەرەتا سەدەی ١٦دا ڕوویاندا و تارادەیەکی زۆر بەوەچەرخانی ڕێگەو بانی بازرگانییەوە بەسترا بوونەوە..بوونە هۆی پەیدابوونی مەڵبەندی نوێی پەرەسەندنی ئابوری و پەرەسەندنی سەرمایەداری لە ئیسپانیا و خوارووی ئەڵەمانیاو سەرووی فەرەنسا،بەتایبەتی پەرەسەندنێکی سەرمایەداریی بە تەوژم لە هۆڵەندەو ئینگلستاندا خولقا،کە هێڵی مۆلبوونی سەرمایەداریی سەرەتاییان،بە ڕادەیەکی زور بەرز، بەبەراورد لەگەل ولاتانی تری ئەورووپادا،تیا بڵند بوبو.سەرکەوتنەکانی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا، بوونە هوی بەرپابوونی هەوەڵین شۆرشە بورژوازییەکان لە ئەورووپای ڕوژئاوادا ،یەکەمیان لە ئەلمانیا لەساڵی ١٥٢٥دا ڕووی داو شێوەی ڕیفۆرم و شەری جوتیاریی وەرگرت،بەڵام سەرنەکەوتنی بووە هۆی ملکەچی بورژوای ئەلمانی بۆ دەسەلاتی ئابوری سیاسی دەرەبەگەکان..دووەمیش لە هۆلەندە ڕووی دا–کوتابی سەدەی شانزدە– کە شێوەی جەنگی نیشتیمانیی و ئایینی دژ بە ئیسپانیای دەرەبەگایەتی– زۆردارو کاسولیکی بوو. ئەنجامەکەشی کۆماری بورژوای سەربەخوی هۆلەندە دامەزرا.

گۆڕانە کۆمەڵایەتی و ئابوری و تەکنیکییە ڕادیکالەکان لە پشت ئەو گۆڕانە بنەرەتیانەوە بوون کە ژیانی گیانیی گەلانی ئەورووپای گرتەوە. دەرکەوتنی شێوە نوێیەکانی ڕێکخستنی ڕامیاری چینی دەسەڵاتدار–سستێمی پاشایەتی موتڵەق لە ئیسپانیاو فەرەنساو ئینگلستان و

هتد..پاڵپشتیکردنی دەسەڵاتی سەرەکی میری بەگشتی کارێکی گەورەیان کردە بەر لاواز کردنی نفوزی ئابوری و سیاسی کڵێسەی کاسولیکی ڕۆمانی کە بە درێژایی سەدە ناونجییەکان هەمووی،هێزی ئایدیۆلۆژی زاڵ وبەرزترین یاسا Sanchion دەرەبەگایەتی بوولەئەوروپادا.هەروەها نفوزی ئایدیۆلۆژی کڵێسەش شلۆق بوو بەهۆی بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی شانزدە،بە تایبەتی لۆسەری و زونگلی و کالڤینی..کە تەقەلای بورژوای گەورەیان دەرئەخست بۆ ڕزگار بوون لە دەست پێسپێریەکانی کڵێسەی کاسولیکی ڕۆمانی پاڵپشت بەدەرەبەگاییەتی و بۆ دامەزراندنی سستێمێکی نوێی بورژوازی بۆ کڵێسە.

سەرکەوتنی بزوتنەوە ڕیفۆرمخوازەکان بووە هۆی تەسك بوونەوەی دەسەڵاتی کڵێسەی کاسولیکی ڕۆمانی لە هەندێ وڵاتی ئەوروپادا..هەرچەندە بزوتنەوەکان بە شێوەی دوژمن بەدەرەبەگایەتی بوون،چونکە هەر لەناو چوار چێوەی ئاییندا ئەجوڵانەوە..شورشە بونژواکانی سەرەتاش هەر دروشمی ئاینیان بەرز کردبووەوە و ڕوخساری ئاینی ئاشکرایان هەبووە..ئەمەش هەر وەکو مارکس سەرنجی دا..سەبارەت بەوە بووە کە "ئەم چینە نوێیە ماوەیەکی دوورو درێژ بەکوتو زنجیری زۆر قایم بەلاهوتەو بەسترابووەوە (١٨)".

## کولتوری مرۆڤایەتی و سەردەمی بوژاندنەوە-رینیسانس-

ئەو گۆڕانە کۆمەلایەتییە-ئابوریانە بوونە هۆی دەرکەوتنی ژمارەیەکی زۆر لە رۆشەنبیری بورژوازی کەزیاتر بەهونەرو زانستەوە خۆیان بەستبوەوە..لەو سەردەمەدا کولتورێکی نویّ هاتە ئاراوەو بە تێندێنسی مرۆڤایەتی Humanism ناسرا..ئەومرۆڤ پەروەرانە Humanists بەربەرەکانیی زانستی سکولانیزمی کلێسەیان بە زانستی جیهانی ئەکرد.ئەم رێبازە زیاتر کەلەپوری کولتوری کۆنی بەکار دەهێنا. چونکە ئەو کولتورە بتپەرستانەیە زیاتر لە سروشتی بۆرژوای نەشونما کردووە نزیك بوو وەك لەکولتوری کۆمەلگەی دەرەبەگیی و ئیدیۆلۆژە کەی.. سەبارەت بەوەی کاری رۆشنبیری کۆن لەرادە بەدەر مەزن بوو بۆیە ئەم سەردەمەیان ناو نا سەدەی بوژاندنەوە Renaissance،سەدەی بوژاندنەوەی زۆر لایەنی کولتوری کۆنینی دەولەمەند لە دوای بیرچوونەوەی زیاتر لە هەزار سالّ.

کولتوری بۆرژوای تازە پێگەیشتوو سەرکەوتنی نایابی لە مەیدانەکانی ئەدەب و وێنەکێشان و پەیکەرتاشی و هونەری بیناکردن و زانست و فەلسەفەدا بەدەست هێنا...ئیدیۆلۆگەکان بۆرژوای بالا کردوو داوای پەرەپێدانی چەندلایی پێرسونالییان ئەکرد، چونکە پەرەسەندنی گونجاو لەو سەردەمەدا هەر بۆکەسانی دیار ژمێر دەرەخساو بۆ هەموو گەل نەدەلوا. هەر لەو کاتەشەوە یەکێك لە شەقلە سەرەکییەکانی

کولتوری بۆرژوا دەرکەوت کەسەڵتایەتی Individualism بوو.بەڵام ئەو تێندێنسە سەڵتایەتییە لە دۆخی ئەو سەردەمەدا دیاردەیەکی پێشکەوتووانە بوو،چونکە ڕۆخساری پێویستی ڕزگاربوونی مرۆڤی دەرئەخست لەکۆتو و پەیوەندی سەدەکانی ناوەڕاست– لە تایەفەگەری پلەی جیاجیاو دەسەڵاتی کڵێسە.

ئەم سەردەمە تۆێیە بووە هۆی پەیدابوونی دیدی نوێ دەربارەی ماهییەتی کۆمەڵ و سروشتی مرۆڤ ...هتد...گرنگترین شەقلەکانی ئەم دیدە کومەڵایەتییە نوێیە،تێگەیشتنی کۆمەڵ بوو کە کۆیەکی حیسابیی خەڵکانی لەیەك دابڕاوە.

"**نیکۆلای میکیاڤیلی**"(١٤٦٩–١٥٢٧) لەسیاسییە بورژواکانی سەرەتا بوو،لە دانراوەکانیدا(تیوردبوونەوەیەك لە یەکەمین دە وتار لە مێژوی تیتولیڤیو)و(ئەمیر) دا هەوڵیدا بیسەلمێنێت کە هۆی بزوێنەری چالاکی مرۆڤ–خۆپەرستیی و بەرژەوەندی مادییە، میکیاڤیلی ئەڵێت:خەڵك مردنی باوکیان زوتر لە بیر ئەچێتەوە وەك لەکیسچونی موڵکو مالیان.بەو جۆرە میکیاڤیلی شەقل بنچینەییەکانی سەڵتایەتی کە لەم سەردەمەدا دەرکەوتن، ئەکاتە شەقلی بنچینەیی بۆ سروشتی مرۆڤایەتی بەگشتی.ئەم ئیدیۆلۆگە فلۆرەنساویە،تیوری تیوکرات:کە دەولەت بەکلێسەوە دەبەستێتەوە،رەت ئەکاتەوە، هەروەها تێگەیشتەی لاهوتیی بەربەرەکانی کرد. مارکس ئەڵێت:ئیدیۆلۆگەکانی سییەکانی سەدەی نوێ،لە میکاڤیلییەوە، "وا هێزیان ئەبینی کە

بنچینەی مافە،بەوەش لێکولینەوەی تیۆری سیاسەت لە ڕەوشت سەرفراز بوو(١٨)". سەبارەت بەوەی گەسەکردن و شکلۆداری دەولەت-لای میکیافیلی- بەرزترین یاسایە بۆ سیاسەت، بۆیە هەموو ئەو ڕێگەو شوێنانەی بەرەو ئەو ئامانجە ئەچێ،سروشتی و ڕەوایە،بەرێگە بێ ڕەوشتیانەی وەك-بەرتیل ،کوشتن، ژهر دەرخواردان،خیانەت،غەدریشەوە...ئەیوت ئەو فرمانرەوایەی کە ئەیەوێت دەولەتێکی ناوەندی بەهێز دابمەزرێنێت،ئەبێت خەسلەتەکانی شێرو هی ڕێویشی تیا بێت...لێرەوە ئەو تێندێنسەی میکیافیلی هاتە پێشەوە کە ئەڵێ:هەموو ڕێگەو شوێنێکی گەیەنەر بە ئامانجە سیاسییەکان ڕەوایە..(١٩)".

**-سوسیالیزمی یۆتۆپی١:**

لەولاتانی ئەوروپادا جەماوەری گەل لە جوتیارو پیشەگەرو پێشەنگە دەرکەوتووەکانی پۆلیتاریا..بێ ئیدیۆلۆگ نەمایەوە،بەلکو نوێنەرەکانیان هاتنە مەیدانەوە تا پێشبینییەکانیان دەربخەن،لەوانە:تۆماس مونزر(دەوروبەری ١٤٩٠-١٥٢٥)رووی دەرکەوتووی بزوتنەوەی"ریفورمی گەل"بوو بەلام هەرزوو لە ریفورمی بۆرژوازیانە Burgher کەمارتن لۆسەر ئیدیۆلۆگی بوو، جیابووەوە، بۆئەوەی بەرنامەیەکی سیاسی ڕادیکالانەدابنێت وداوای لابردنی موڵکداریتی تایبەتی بکات وبکرێتەمولکداریتی گشتیی،جیاوازی پلە وپایەو دەسەڵاتدارێتی نامۆ بەگەل لابرێن و یەکسانی تەواوەتی بلاو

بکرێتەوە...ئنگلس ئەو نمونە کۆمەڵایەتییەی مونزر چاوی تیَ بڕیبوو، بەوەی دائەنا کە"دەسپێشخەری بوو بۆ کۆمۆنیزم بەخەیاڵ١". دوای ئەمیش "توماس مۆر"١٤٧٨-١٥٢٥ قوولتر گۆڕانەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بۆ بەرژەوەندی گەل خستە بەر چاو،کتێبەکەشی"یۆتۆپیا"کە خاوەنەکەی کردە پێشەنگی سوسیالیزمی یۆتۆپی،داوای سستێمیکی کۆمەڵایەتی باشتری ئەکرد...نرخی مێژوویی یتۆپیا هەر لەوەدا نەبوو کەپەردەی لەسەر شێوەی دەوڵەمەند بوونی چینە دەسەڵاتدارەکان لادا، بەڵکو لەوەش زیاتر ئاشکرای کرد هۆی سەرەکی ڕووتو ڕەجالی گەڵ و هەموو کارەساتە کۆمەڵایەتییەکان موڵکدارێتی تایبەتی بووە،بۆیە داوای لابردنی ئەکرد.((کار))ی بە ئەرکی سەر شانی هەموو ئەندامانی کۆمەڵ دائەنا ئەبووت دانیشتوانی یۆتۆپیا بە گونجاوی لە ناو سروشتاندا ئەژین... دەولەت کەڵ وپەلی بەرهەمی دانیشتوان بە سەر هەمواندا دابەش ئەکات.

"**تۆمازۆ کامپانیلا**"١٥٦٨-١٦٣٩ی فەیلەسوف و زانای زانستی کۆمەڵایەتی ...بیر کارێکی تری ئەم ڕێبازە بوو.بزوتنەوەی ڕزگاریکردنی خوارووی ئیتالیای لەچنگ ئیسپانیەکان سەرکردایەتی کرد.بە هۆی سەرنەکەوتنیەوە گیراو (٢٧) ساڵ بەند کرا. "شاری خۆر" بەرهەمی سەرەکی بوو کە لە بەندیخانە داینا،لێرەشدا هەروەکو دوورگەکەی یۆتۆپیا موڵکدارێتی تایبەتی نییە... خەڵك ژیانێکی کۆمەڵ و

هاوبەشییان هەیە، بەڵام ئەمیش وەکو مۆنزر دیدی پانتیزمی بووە... کە ژیانیی میشاعەی بەیاسای یەزدان و سروشتیی دائەنا.

بیری سەردەمی بوژاندنەوە، بەتایبەتی فەلسەفەی "مرۆڤ پەروەران"لە دژی سکولانیزم بوو...تیۆری "دوو ڕاستی"("ڕاستی دوانەیی "TwofoldTruth")کە مەیدانی زانست(کۆڵینەوە لە سروشت)و مەیدانی ئایین (سەرفرازیی گیان)لێك جیا ئەکاتەوە... ئەم تیۆرییە ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە جیابوونەوەی فەلسەفە لە لاهوت... یارمەتی پێکهاتنی هۆشیاریی زانستانەی داو بە باشی بڵاو بووەوە. پەیدا بوونی "فەلسەفی سروشتی Natural philosophi") کەدوور لە دیدی لاهوتانە، لە سروشت ئەکوڵێتەوە،بایەخێکی گەورەی هەبوو لە سەر پێشخستنی فەلسەفە ...بەگشتی ئەم فەلسەفە زانستییە،تێندێنسی پانتزیمی هەبوو کە بەئاشکرا نکوڵی لە هەبوونی یەزدان ناکات بەڵکو یەزدان و سروشت هەردووکیان یەك ئەخات.

"**نیکۆلای ئۆف گۆزا** "(١٤٠١-١٤٦٤)یەکەم بەناوبانگی پانتیزمی بوو.یەکەم مەسەلەی سەرەکی فەلسەفە ئیدیالیستانە چارە ئەکات، سروشت، بە مرۆڤیشەوە لە یەزدانەوەیە-کە بەرزترین هەبووی موتڵەقە-بەڵام هەروەکو فەیلەسوفێکی پانتیزم- لە ڕاستیدا نکۆڵی لەوە دەکات کە یەزدان گێتی دروست کردبێت. یەزدان و سروشت لەیەك نزیك ئەکاتەوە سیفتی یەزدانی بەسروشتەوە ئەلکێنێ. لەتیوری زانیندا"گوزا"چەند بیرێکی قوڵ ئەخاتەروو.بڕوابوونی بەبێ سنورێتی

گێتی وای لێکردکە تێگەشتنێکی نوێی لەدەربارەی خودی پرۆسەی نوێی زانین هەبێت... جیاوازی ئەم فەیلەسوفەو سکولانییەکان بەدووبارەکردنەوەی ئەقڵ وەك توانستێکی ز زانینی...فولتر بو،تاگەیشتە دەرککردن بەوڕاستییە دیالیکتیکییەی کەئەلێت"هەمووشتێك لەناکوکەکان پێك هاتوودبەلام بەپلەی جیاجیا"...لەدوایشدا تیورییە دیالیکتیکییەکەی لە سەر"جوتبوونی دژەکان"پەرەپێدا.پێشکەوتنە مەزنەکانی زانستی سروشت لە نوزینەوە-ئیکتیشافات-زور گرنگەکاندا ڕەنگی دایەوە...بەتایبەتی پێشکەوتنی ماتماتیك زور فراوان بوو...ئیتر دامەزراوە مەزنەکان...پێشکەوتنی پیشەسازیی پاپۆرو ئەو گۆڕانەگرنگانەی بەسەرشێوەوئامرازی بەرهەمهێناندا‌هات، ئەمانە، بۆ بەرهەمهێنان، بەکارخستنی زانستیانکردەپێویست...هەر لەوماوانەدا زانستی سروشتە ئەزمونیەکان دەرکەوت کەئەمەش پالپێوەنەرێکی گەوردی پەرەسەندنی ڕێبازە مەتریالیستەکانی فەلسەفەبوو.لەزانستی فەلەکدا پێشکەوتنی گەورە بەدەست هێنرا، ئەوپێشکەوتنەش-بەشێوەیەکی سەرەکی - پەیوەندی بەپێویستییەکانی ڕێگەوبانی دەریاو پێویستی چاککردنی سالنامەو هەبوو،ئەوەش دەسکەوتی زۆر گەورەی لێ بە ئەنجام هات،ئایدیۆلۆژی لاهوتیی سکولانیزمی،کەلە سەر چەقێتی زەوی لە کەوندا Geo centricsm دامەزرابوو،داتەپاند.هەرە گرنگترینی ئەو دوزینەوانەش تیوری چەقێتی خۆرHelio centricism بوو کە زانای

گەورەی پۆلۆنی "کۆپەرنیکۆس"(١٤٧٣-١٥٤٣)دایناو لەسەر بناغەی ئەمەش زانستی نوێی فەلەك بیناکرا...ئەم تیۆریەش لەسەر ئەم دوو پرنسیپە دامەزرا:١)زەوی‌لە چەقی کەوندا وەستاونییە...بەڵکو بەدوری تایبەتی خویدا ئەخولێتەوە.٢)زەوی بەدەوری ڕۆژدا، کە چەقی کەونە، ئەخولێتەوە.کەبەوانەش شەوو ڕۆژ لە دوایەك هاتن وبەڕواڵەت بزوتنەوەی ئاسمان و ئەستێرەکان و بزوتنەوەی بە ڕواڵەتی خۆرو ئەستێرەکانی لە کاتی نیشانگەریدا ڕوون کردەوە،سەرەڕای ئەوەش هەروەك ئنگلس ئەڵێت "لەمەسەلە سروشتییەکاندا سنووری هەیبەتی کڵێسەی شکاند کە لێرەشەوە مێژووی ڕزگارکردنی زانستەکانی سروشت لە لاهوت دەست پێئەکات [١]"ئەم تیورییەی"کۆپەرنیك"کارێکی گەورەی کردە سەر پەرەسەندنی بیری فەلسەفی وقوڵکردنی مەتریالیزمی دیالیکتیکی...بڕوای بە توانای ئەقڵی مرۆڤ بە هێزو قوڵ کردو ڕوناکبیری زانینی بەرین کرد تا گەیشتە زانست و فەلسەفەش...کەبوونە هۆی دەرکەوتنی چەندین بیری مەتریالیستانەی شۆڕشگێر...بەڵام هەرچەندە زانیاریەکی زۆری دربارەی فەلەك هەبوو...دیسان هاوبەشیی ئەو دیدەی کرد کەدانی بە سنورداریێتی کەوندا ئەنا،جگە لەوەش،هەرچەندە بەپێی تیورییەکەی کۆپەرنیك زەوی بە چەقی کەوندا نەما،سەر لەنوێ بە هەڵە چەقێکی تری بۆ کەون دانا کە ڕۆژە...لە لایەکی تر هەمان بیروراکانی ئەرستو

درەبارەی ڕێرەوی بازنەی ئیدیالیستانەی جوڵانەوەی ئەستێرەکان بەدەوری ڕۆژدا– ی پارێزگاری کرد.

بەڵام"گوردانۆ بۆنۆ"١٥٤٨–١٦٠٠هات و بەرەنگاری ئەو هەڵانە بوو.ئەم فەیلەسوفە قەشەی ناو برایانی دۆمەنیکان بوو،بەڵام بە هۆی تێندێنسی مرۆڤ پەروەری و فەلسەفەی سروشتیی ئیتالیاو تیۆری کۆپەرنیک لە کلێسە جیابوەوە قەشەیەتی بەجێ هێشت و ڕایکردە دەرەوەی ئیتالیا...بەگشتی فەلسەفەکەی"برۆنۆ"ناوەڕۆک مەتریالیست و شێوەی پانتیزم بوو،یەزدان لای ئەم بەیەکجاری لەناو سروشتدایە کە هەر وەکو خۆی ئەڵێت"یەزدان لە شتەکاندا"یە.بڕوای بە بێ سنوریی سروشت و بێ سنوریی شوێن و بێ سنوریی ژمارەی گێتییەکانی کەون هەبووە...ئەم ڕایانەی پەرەپێداو کردی بە بناغەی باوەڕە مەتریالیستەکەی کە دژ بە غەیبی بوو...لەسەر ئەو ڕێگەیە ئەم فەیلەسوفە تیورییەکەی کۆپەرنیکی لە خلتەی کوسمۆلۆگیا ڕزگار کرد...چەقێتی خۆری ڕوون کردەوە و ئەیوت ڕۆژ تەنها چەقی ئەم سستێمی ڕۆژەی ئێمەیە کە تەنها سستێم نییە.. ڕۆژ، هەروەکو ئەستێرەکان هەموویان،ئەستێرەی ئاسایی ناو ژمارەی بێ شومارو بێ سنوری ئەم کەونە بێ کوتاییەن.

لە تیورییەکەیدا دەربارەی گێتی،ئەم فەیلەسوفە بیرێکی گرنگی تری خستەڕوو،ئەوەش سەلماندنی لە یەکچوونی فیزیکی هەموو گێتییەکانە...

لـەتیوری زانـین و دیالیکتیکـدا"برونـۆ"لـەو ڕوانگەیـەوە کـە مـرۆڤ بەشێکی سروشـتەو لێـی جیانابێتەوە،سـەبارەت بـەوەی کـە جیهـانێکی بچـوکە و ئاوێنـەی جیهانـە گەورەکەیـە ...بـەو هاوبەشـیی فەیلەسـوفە سروشـتییەکانی ئـەو سـەردەمەی کـرد...ئـەیووت ناتوانرێـت پشـت بەدەرەکـــە هەســـتییەکان ببەســـترێت چـــونکە هەنـــدێ جـــار هەلمانئەخەڵــەتێنن...وەکـــو دەرخســـتنی وەســـتاوی زەمـــین و ڕۆژ جـولان...بۆیـە لای ئـەم ئـەقلّ خـاوەنی بڕیـارە...بـەلام دیـدی ئـەم فەیلەسـوفە بـۆ بـێ کوتـایی جیهان،بـەرەو دیـالیکتیکی جـووتکردنی دژەکانی برد لە بێ سنوریی لە گەورەییدا و بێ سنوریی لە بچوکیدا.

شـان بــە شـانی دانراوەکـانی فەیلەسـوفە سروشـتیەکان...بـیری فەلسەفی لـەم سـەردەمەدا لـە سـەر دەسـتی زانـا مەزنـە سروشـتیەکان پـــەرەی ســـەند...لەوانـــە:"لیۆنـــاردۆ دافنشـــی"و"گـــالیلۆ"و گـــەلێکی تر...بەلام جیاوازی ئەم زاناو بیرکارانە لەگەڵ فەیلەسوفە سروشتییەکان ئەمانە بوو:

١ــ زیـاتر خۆیـان بەریالیسـتەوە،بە پێویسـتییە پراکتیکییـەکانی بەرهەمهێنانی سەردەمەوە بەستبووەوە...

٢ـ هـەولی ئـەوەیان ئـەدا ڕێبـازو مـەزەبی گشـتیی بهێننەکایـەوە کـە سروشتیش بگرێتەوە، کە بـەو پێیـە ئـەبێ ئـەو سـاش هەندێ ڕەگـەزی خەیالیشیان تیابێ.

٣ــ بــیری میتودۆلــۆگی بــەنرخیان دارِشــت و بیروبــاوەری نــوێی هاسانکردنی تێگەیشتنی سروشتیان داناو سەرەتای پلەیەکی نوێیان بۆ پەرەسەندنی مەتریالیزم دارشت.

لــە ســەردەمی ڕێنسانســدرا هونــەر گەیشــتەپلەیەکی بەرز،هونــەری وێنەکێشــی وبینــاو پەیکەرتاشــی پــەرەیان ســەندوپەیوەندییەکی تونــدوتۆڵیان لەگــەڵ:ماتماتیــك و میکانیــك و توێکــاریی و پزیشــکی و سەرەتایی کیمیاوە هــەبوو..ئــەنگلس ئــەڵێت:"زاناکانی ئــەو ســەردەمە لەرووی گشتی و زانستەوە پیاوانی زۆر مەزنی ئەو سەردەمەبوون[١].

**لیۆناردۆ دافنشی ١٤٥٢-١٥١٩:**

لوتکەیــەکی نــاو لوتکــە بــەرزەکانی هونــەری جیهــانی وزانایــاکی ئینســکلۆپیدی هەڵکــەوتوو هونەرمەنــدێکی گــەورەو ڕابــەری زانســتە سروشتییەکانی سەردەم و یەکەم ئیۆیۆلۆگ بوو کە بەرنامەی ئەزمونی– ماتماتیکی لەلێکۆلینــەوەی سروشــتدا بــەکار هێنــا.زانایــەکی بــەرزی نــاو زاناکــانی بیرجــوانیی ســەردەمی خــۆی بــوو دژی ئەســتێرەگەری و جادوبــازی بــووە ...یەکخســتنی ئــەزموونی پراکتیکــی و لێکدانــەوەی زانســتیانەی ســەلماند وەك ڕێگــەی ســەرەکی دۆزینــەوەی ڕاســتییە نوێییەکان...ئەیووت ماتماتیك لە هــەموو زانستێکی تــر یــەقینی تــرەوە پێویستترە بۆ تێگەیشتنی تاقیکردنەوەو گشتی کردنی.

**"لیۆنــاردۆ"** هاوبەشــییەکی گەورەشــی کــرد لەپەرەپێــدانی بــیری هونــەرو–جــوانیی لەســەردەمی ڕێنسانســدا کەهونــەری ریــالیزمی لــە

ڕادەربەدەر تیا گەشایەوە... " شێوەی خواوەند"و"مۆنا لیزا" و هونەرە جوانەکانی تر کارێکی گەورەیان کردە سەربزوتنەوەی هونەر لە ناوەوە و لە دەرەوەی ئیتالیادا...هەروەها لیۆناردو وەك تیوریستێکی مەزنی هونەر دەرکەوت. بڕوای بەوە بوو کە هونەر و کو زانست ئامانجی تێگەیشتنی جیهانی ڕیالیستەو هەر یەکەشیان تایبەتە بەلایەنێکی دیاری جیهان...زانست ئەچێتە ناو قوڵایی شتەوە کەسروشت دروستی کردووەو لەیاسا چەندایەتییەکانیش ئەکۆڵێتەوە،بەڵام هونەر بایەخ بە خەسڵەتە چۆنایەتییەکانی ئەو شتانە ئەدات بەو جۆرە جوانیی سروشت ئاشکرا ئەبێت کە "مرۆڤ پەروەرەکانی"سەردەمی ڕێنیسانسی کرد بە پێچەوانەی سۆفییەکانی سەدەکانی ناونجی ...چونکە لەزەت وەرگرتن لەجوانیی سروشتیان کردە یەکێك لە ئامانجە سەرەکیەکانی ژیانی مرۆڤ هەر وەك زاناو هونەرمەند تایبەتمەندی و جوانیی گیان و لەشی مرۆڤ وەرئەگرێ...لەتابلۆ و کرداره هونەرییە بەرزەکانیدا وەك زانایەکی توێژەری بلیمەتەو لە پیشاندانی ڕووی ڕاستەقینەی لەشی مرۆڤ هونەر مەندێکی تیپی یەکەم و سایکولۆژیکی نایاب و وێنە کێشێکی خاوەن بەهرە بووە لەدەرخستنی جوانیی دەروونی مرۆڤدا...

### گالیلۆ گالیلی ١٥٦٤-١٦٤٢:

ئەم زانا ئیتالییە مەزنە پێشەنگی بەرنامەی ئەزمونیی ماتماتیکی بوو،لە لێکوڵینەوەی سورشتدا...لەکاتێکدا کە لیۆناردۆ دافینشی تەنها

هێڵــه گشــتییه تەقریبییــەکانی ئــەم برنامەییــەی بــۆ بــەجێ هێشـتین،"گـالیلۆ"باسـێکی دوورودرێـژی خسـتە بـەردەممان پرنسـیپە سەرەکییەکانی تێگەیشتەی میکانیکی جیهانی دارشت.

لە شاری بیزا،نزیك فلۆرەنسا لـە دایك بـووە... بـوو بـە مامۆسـتای ماتماتیك...چالاکییەکانی زانستی فراوانـی نوانـد بەتایبـەتی لـە بـواری میکانیــك و فەلەکــدا.بەتەلەســکۆپەکەی نۆڵ و چــیاکانی مــانگی بینــی،کۆمەڵەئەســتێرە بــێ شــومارەکانی بینــی کەرێگـەی کاکێشــان پێکدەهێنن.هـەروەها چـوار مانگەکـەی موشـتەری و گـەلێ شـتی تـری بینی.بەهۆی ئەمانەوە بوو کەناویانگی دەرکردو ناویان نا"کۆلۆمپسی ئاسمان".ئەو دۆزینەوانەش ڕاستی تیۆرییەکـەی کۆپـەرنیکی سـەلماندو گـەلێ بـۆ چـوونی "برۆنـۆ"ی چەسـپاند،بەتایبـەتی دۆزینـەوەی جـۆری پێکهاتنی ئەستێرەیی ڕێگەی کاکێشان سـەلمانێکی ناڕاستەوخۆی بـێ سنووریی گێتییـەکانی نـاو گەردوونـە.بـە ئەزموونـە زانستییەکانی نیدی نادروسـتی هەڵتەکانـد و زانسـتێکی نـوێ لـە زانسـتەکانی میکانیـك- دینامیکــ، یــان زانســتی بزوتنــەوەی تەنــەکانی دانــاوە.بــەهۆی کوڵینەوەکانی،گەیشــتە گــەلێ یاســای بنچــینەیی لەزانســتی میکانیکــــدا...دوای ئــــەوەی گــــالیلۆ یاســــاکانی میکــــانیکی دۆزییـەوە"کێپلـەر"یاسـای جوڵانـەوەی ئەسـتێرەکانی دۆزینـەوە و ئـەو یاسـایانە لـە شـێوەی وردی ماتماتیکانـەدا دارێـژران...ئیـتر تـوانرا ئـەو تێگەیشتنانە لە سەر زەمینەیەکی پتەوی فیزیکی دابمـەزرێنرێن...ئـەوە

بوو بۆ یەکەم جار تێگەیشتەی یاسای سروشت ناوەڕۆکێکی زانستیانە وردو سنورداری وەرگرت...

"**گالیلو**"یاسا میکانیکییەکانی بۆ سەلماندنی تیۆرییەکەی کۆپەرنیکۆس-ی بەکارهێنا،دانراوەکەشی"مشتومڕێك دەربارەی هەردوو سستێمە بنچینەییەکەی جیهان-بەتلیمۆسی و کۆپەرنیکی"(١٦٣٢)بوو بەهۆی ئەوی کڵێسە ئەوە بەدەرچوون لە"پەرتوکی پیرۆز"تاوانباری بکات و بیدات بە"دادگای پشکنین"و لە ١٣شوباتی ١٦٣٢دا لە بەردەم "دادگا پشکنین"دا ناچار بوو بەروکەش پاکانە لە"واهیمەو سەرلێتێکچونەکانی"بکات.راستە کڵێسە توانی بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی گالیلۆ قەدەغە بکات...بەڵام ئیتر لە توانایدا نەبوو کە بیروڕاکانی کۆپەرنیك و برۆنۆو گالیلۆ لەبڵاوبوونەوەو سەرکەوتن پەك بخات...گالیلۆ ئەیووت بابەتی زانست- سروشت و مرۆڤە،بەڵام بابەتی ئاین ژیانی ڕەوشتە.وەلەبەر پرشنگی ئیدیەی بێ کوتایی کەون ئەم ئیدیەۆلۆگە مەزنە ئیدیەی زانینی قوڵی:

دەر کپێکردنی حەقیقەت پروسەیەکی بێ کۆیتاییە -ی خستەڕوو. ئەم ڕوانگەدژیەسکولانیزمە ئاراستەی دانانی بەرنامەیەکی نوێی زانینی کرد.لەڕێرەوی دامەزراندنی میتۆدۆلۆگیدا گالیلۆ ئاشکرای کرد کەتاقیکردنەوەتەنیا ڕێگەی گەیشتنەبەڕاستی... پرنسیپەکانی لێکۆڵینەوەی زانستانە سروشتی فورمەلە کردو ڕۆڵی برینەرەوەی ئەزمونی سەلماند.دەریخست کەلەکۆلینەوەیسروشتدا

ئەبێت بەرنامەیەکی دوانە بەکاربهێنرێ: شیکاری Analytical ئاوێتەیی synthetical.

بەڵام میتۆدۆلۆگیای زانستی کە گالیلۆداینا سروشتی شیکاریی یەک لایەنەی هەبوو،ئەم سروشتەش لەگەڵ سەرەتای دەرکەوتنی بەرهەمی مەنیفاکتورەو دابەشکردنی پروسەی بەرهەمهێنان بۆچەندپروسەیەک ئەگونجا...هەروەها دەرکەوتنی ئەم میتۆدولۆگە بەسترابووەوە بەجۆرێ زانیاریی زانستییەکە خۆیەوە.

دیدی ئەم زانایە بۆ مەتریال ئەوە بوو کەلەژمارەیەکی بێ سنور لەتەنی وردیلە پەیدا بووەو هەریەکەیان فورمێکی دیاریکراووژمارەوجێگەیەکی سنوردار لەبۆشاییدا داگیرئەکات، ئەجولێ و جێگیرئەبێت بەڵام ڕەنگ وتام و بونی نییە...لەدیدی میکانیکی گالیلۆدا بۆ گێتی سروشت ئەمرێ.

سروشتی میکانیکی ڕاکانی ئەم فەیلەسوفەوپێنە گەیشتوویی ئایدۆلۆژی چینی بورژوا کەگالیلۆ ئەینواند... نەیهێشت بەتەواوی لەدیدی لاهوتیی دەربارەی یەزدان قورتاری ببێ... سەبارەت بەمیتافیز یکییە کەشی نەیتوانی ئەوهەنگاوە بنێ... تێندێنسی ئیدیالیستانەی گالیلۆلە ڕوانینی بۆ ئەسڵی ڕۆژ ئاشکرا ئەبێت...

دیسان گالیلۆ لەپێشەوەی ئیدیۆلۆگەکانی سەردەمی نوێوە بووەکە دیدی دایزمی deism بۆ سروشت دارشت.بەو جۆرە گالیلۆ ئیدیۆلۆگی پێشەنگی سەردەمی نوێ بوو...ژیانیزانستی و فەلسەفی ئەم زانایە

سـەرەتای پلەیـەکی نـوێی بـوو بـۆ پەرەسـەندنی بـیری فەلسـەفی لەئـەوروپادا... مـەتریالیزمی میکـانیکی ومیتـافیزیکی هـەردوو چـەرخی حەڤدەو هەژدە...

# بەشی چوارەم

– پەرەسەندنی فەلسەفەو لەسەردەمی شورشە بورژوازییە کاندا کوتایی سەدەی ١٦–کوتایی سەدەیی ١٨–

ـ زاناو ئیدیۆلۆگەکانی فەلسەفەوی بورژاوی: لۆك دیکارت –هوبس– سپینۆزا–

ـ فەلسەفە لەئینگلیستاندا کوتایی سەدەی ١٧–١٨.

ـ فەلسەفەی ئەڵمانی لەسەدەی حەڤدەهەمدا...

ـ روناکبیریی فەرەنساوی لەڤوڵتێرو–کوندیاك–رۆسۆ.

ـ مەتریالیستەفەرەنساویەکان لەسەدەی هەژدەمدا:دیدرولامتری– هولباخ–

ـ دانانی ئینسکلۆپیدیا.

## پەرەسەندنی فەلسەفە لە سەردەمی شۆڕشە بورژوازییەکاندا

### کۆتایی سەدەی ١٦-کۆتایی سەدەی ١٨-

لەناو هەناوی سستێمی دەرەبەگایەتی گەندەڵبودا، بەدرێژایی هەردوو سەدەی شانزدەو حەڤدە،لە پێشکەوتووترین وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوادا،شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری بە هێواشی ئەشونمای ئەکرد تابورژوا بو بەچینێکی سەربەخۆو سەرکردەی خەباتی جەماوەری فراوان لە دژی دەسەڵاتی دەرەبەگێتی.ژمارەیەکیش لەمیرو پاشا دەرەبەگەکان،ناوچەکانیان لەگەڵ ئەو دۆخە و ئەو پەیوەندییە بورژوا نوێیانەدا ساز کردو لە ئینگلستاندا کەوتنە تەلبەند کردنی ناوچەکان و گۆڕیانن بە لەوەڕگا...بەو جۆرە تاقمێك لە نوبەلا نوێ هاتە سەر شانۆ کە لە گوزەران و بەرژەوەندیدا لە بورژوازی بالاکردوو نزیك بوو...بەوەش زەمینەی لەباری سازش لە نێوان چینی نوبەلاو چینی بورژوازیدا ڕەخسا،ئەوش لە دامەزراندنی سستێمی مۆنارشیدا (پاشایەتی)دەرئەکەوت...مارکس ئەڵێت:مۆنارشی لە سەدەکانی گواستنەوەدا پەیدا بوو،لەو کاتەنادا بوو کە بەشە کومەڵایەتییەکانی سستێمی کومەڵگەی دەرەبەگایەتی لەیەك ئەترازان و بەرەو نەمان ئەچوون،چینی بورژوازی نوێش لە ڕیزی دانیشتوانی شارەکانا

ئەشــــونمای ئەکرد،بـــەلام جـــاریَ هـــیچ کـــام لـــەم دوو هێــزە لژ بەیەکە،سەرکەوتنی بە سەر ئەوی تردا بەدەست ئەهێنا بوو١.

تەلبەندو شورەکردن مانای زەوتکردنی موڵکی بەرهەمهێنە گچکەکان بوو بە زۆری هێز.ئینجا دەرکەوتنی چینی کارگەرو بە کرێگرتنی ،بووە شێوەی ئاسایی گردبوونەوەی سەرەتای سەرمایە لە ئینگلستان. هەمان دیاردەش لەولاتانی تری ئەورووپا روی دا، بەلام بەشێوەیەکی کەمتر ئاشکرا.لەسەر ئەم زەمینەیە ململانێی چینایەتی لە نێوان بەشەکانی...خـــوارەوەی کومەڵ وچینی دەرەبەگی خاوەن دەسەلاتدا...توندو تیژ دەبوو،کە ئەمەش هاوبەشیکردن بوو لە داتەپانی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان،داریەردووی پێویستیشی بۆ شورشەکانی چینی بۆرژوا رەخساند.بەتایبەتی لە هۆلەندەو ئینگلستان و فەرەنسا.. جەنگی جوتیاران لە ئەلەمانیاو ئەو راپەرینەی کە"رۆبەرت کێت"لەئینگلستان سەرکردایەتی کردو راپەرینی "پێخاوسەکان" لە فەرەنساو گەلێ راپەرینی تری چەوساوەکانی ئەو سەردەمانە سەرەتای شۆرشە بورژوازییەکانی ئەورووپای خۆرئاوا بوو.

گەنیو بوونی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان بووە هۆی گۆرانێکی ، گەورەلەو رۆلەی کە ئایین لە کەمەڵدا وازی ئەکرد...پایەگەکانی دیکتاتورییەتی گیانی کە بەدرێژایی هەموو سەدەکانی ناوەنجی بەدەستی کلێسەوە بو،شلوق بوو.لەگەل ئەوەشدا ئایین جێگەیەکی وای لە دڵی خەڵکیدا گرتبوو کە چاوپۆشی لێ نە ئەکرا...لە بەرئەوە شتێکی

سەیر نەبوو کە شۆڕشە بورژوازییەکانی سەرەتا لە ژێر ئالآی ئێندێنسی ریفورمی ئاینی پروستانتیدا بەرپا ببن... بەڵام وەستانی ڕاستەوخۆی بورژوا لە دژی ئاین لە سەدەی هەژدەیەمدا، لەو کاتەدا بوو کە فەرەنسا رێبازی رامیاری تایبەتی خۆی ئاشکرا کرد...خۆ ئەگەر ئاین،بۆ تێکری خەلك،لە کۆمەلگەی سەرمایەداریدا وەك سەرچاوەی واهیمەی سیاسی و رەوشتیی مابووبێتەوە—وا لە مەیدانی زانست و فەلسەفەدا بە یەکجار دەسەلاتکەی لەناو چوو...فەلسەفەی مەتریالیزم و رێبازی ئیمپریالیستی عەفەوی کە فەلسەفەی ئایدیۆلۆژیی بورژوا پێشەنگەکان بوو...لە سەرەتادا ئەو دوو شێوەیەی مەتریالیزم لەتەك یەکدا یەك رێرەویان هەبووە، دیسان روانگە لە بەرامبەر کاری زانست و فەلسەفەدا گۆڕا ،دروشمی مەیریالیستەکان بە فەیلەسوف و زاناکانیشەوە،لە" زانست لە پێناوی زانست" دا نەما بەلکو بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی مرۆڤ بە سەر سروشتدا بوو...بۆ بەرزکردنەوەی توانستەکانی بوو...بۆ ئەوەبوو کەزیاتر تەندروست و جوان بێ..ئەم تێگەیشتنە نوێیە ئامانجی زانین و ئەرکانی بۆ فەیلەسوفەکانی سەردەمی نوێ:"بیکون"لە ئینگلستان و"دیکارت"لەفەرەنساو"سپینۆزا"لەهۆلەندا،سەرەڕای هەموو جیاوازییەکانی نێوان فەلسەفەکانیشیان،بو بەرێکخەرێکی هاوبەشی نێ ´نیان.

ئیتر زانستی نویێ بە شێوەیەکی بنچینەیی پشتی بە واقیعی بەرهەمی مەتریالی ئەبەست،دۆزینەوەی گەلێ ئامرازو ماشێن و بەکارهێنانیان"بوونە کۆلەکەی ئەزمونە بنچینەییەکان و ھاندەرێکی گەورە بۆ دانانی زانستی میکانیکی هاوچەرخ"١هەروەك مارکس دیاردەی بۆ د."تۆرشیللی"قوتابییەکەی گالیلۆ بە تاقیکردنەوە زانستی پالەپەستۆی هەوای سەلماندو گەرما پێوەری جیوەیی داهێنا.

زانای بلیمەتی ئینگلیزیش"ئیسحاق نیوتن"یاسا بنچینەییەکانی میکانیکی کلاسیکی دارشت بە یاسای(راقرێن) پشەوە Gravition."بۆیل"یش یاسا میکانیکییەکان لە کیمیادا بە کارهێنا و تێگەیشتی رەگەزی کیمیاوی دیارد کرد.لە سالی ١٦٠٠دا کتێبەکەی زانا فیزیکی ئینگلیزی" جیلبرێت" لە"موگناتیزدا"بلاو بووبوەوە ،گەلێ باسی تایبەتی فیزیکی و بیری بەنرخی دەربارەی رۆلی ئەزموون وپێوانەی چەندایەتی لە هەموو زانستە سروشتیەکانا تیا بوو.

"هارفی"خولی هاتۆچۆی خوێنی دەرك پێکردو بەپراکتیك رۆلی لە لەشدا دەرخست..."دیکارت"و"لیپنتز" رۆلێکی گرنگیان لە پەرەپێسەندنی زانستەکانی ماتماتیك و فیزیك و زیندەوەرزانیدا بینی...ئیتر ئەزموون بو بە شێوەی سەرەکی لێکۆلینەوەی زانستییە پراکتیکییەکان،کە ئەمەش یارمەتی دەرکەوتنی شێوەیەکی نویێ لە شێوەکانی فەلسەفەی مەتریالیزم –مەتریالیزمی میتافیزیکی سەدەی حەڤدەو هەژدەهەم بوو،ئەم ئەزمونیەش توانستی سەلماندنی تیۆری لە

سەر دروستیی پرنسیپی "هۆیی"رەخساند،ئەوەش شوێنەوارێکی دەرکەوتووی فەلسەفەی مەتریالیزمە لەوسەدەیەدا.

**زانا ئیدیۆلۆگەکانی فەلسەفەی بورژوا:**

"**بیکۆن**"-دامەزرێنەری زانستی ئەزمونی و پێشەنگی فەلسەفی مەتریالیزمی نوێ بوو.فەرەنسیس بیکۆن ١٥٦١-١٦٢٦...لەلەندەن هاتۆتە دنیاوە...یەکەم فەیلەسوف بوو کە ئەرکی پێکهێنانی بەرنامەیەکی زانستانەی نوێی لە بەرچاو گرت..."ئۆراگونونی‌نۆی"-١٦٢٠-دانراوی سەرەکی بوو. "ئەتلەنتسی"نوێش دانراوێکی گرنگی تری بوودەربارەی سیاسەت .

بیکۆن هەمان ڕێبازی ئیدیۆلۆگە پێشڕەوەکانی سەردەمی خۆی گرت،لە تێگەیشتنی ئەرکی زانست کەدەست بەسەرا گرتنی سروشتە لەلایەن مرۆڤەوە.لای وا بوو زانین شۆرشێکی مەزنە بەڵام نابێتە شۆڕشێکی دەست پێکردو ئەگەر یەقینیی نەبێت ئەمەش لەسەر زانینی هۆیە ڕاستەقینە ماتدراوەکانی پشت دیاردەکانی سروشت دەوەستێ...بەم جۆرە زانینی مرۆڤ ئەتوانێ دەست بەسەر سروشتدا بگرێ و بەو لایەدا بیبات کەلەگەڵ خۆیدا دەگونجێت...بیکۆن لەو تێگەیشتنە نوێیەی زانست و لە ڕەخنە گرتن لە ئایدیۆلۆژی سکولانیزمی پێشووەوە دەست پێ ئەکات ،هەروەها لە گومان کردن لە هەموو ئەو شتانەی وانەزانرا یەقینێکی هەقە،بەڵام خودی ئەم گومانە لای بیکون ئامانج نەبووە بەڵکو ئامرازێك بووە بۆ پەیبردن بەئاسوێ ڕێگەی بەرەو

ڕاستی،بڕوای تەواوو بێ سنوری بە توانستی گەیشتن بە زانین هەبووە.بیکۆن لای وابوو کە پەیدا بوونی هەڵە لە پرۆسەی زانین دا لە ئەنجامی هەڵەی پەنا بردنە بەر دیدی ئەقلییە لەکاتی سەرەنجام هەڵێنجان و سەلماندنا.بیکۆن بە پێچەوانەی فەلسەفەکانی پێش خۆی . لەبری بایەخدان بەو حاڵەتە و ڕوداوانەی یارمەتیدەرن بۆ سەلماندنی مەبەستێك یان پرنسیپێك کە ئەویسترا گشتی بکرێ...ئەم ،ئەو ڕووداوو فاکتۆرانەی وەرئەگرت کە ئەو گشتیکردنە بەدرۆ ئەخەنەوەو پێچەوانەی بن.. ئەمەش ناونا"نمونەی نێگەتیڤ"لای وابوو کەلاخستنی ئەو نمونە نێگەتیڤانە هۆی سەرەکی هەموو واهیمە و بە هەڵە چوون و لادانێکی بووە...مەرجی دووەمی چاککردنی زانست پاکژکردنی مێشکە لە واهیمەو پێویستی خۆرزگارکردنە لە هەموو جورەکانی،ئەمەش هەر بەبەرنامەیەکی نوێی لێکولینەوە ئەکرێ...لەئەمەشدا ئاوڕلەمێژو ئەداتەوە و دوو جۆر بەرنامەی لە یەك جیا دیاری ئەکات..دۆگماتیك Dogmaticوە ئەزمونی Empiric...ئەو زانایەی پەیڕەوی یەکەم بەرنامە ئەکات بەکۆڵینەوە لەپرنسیپە گشتییەکان دەست پێ ئەکات ئینجا هەوڵ ئەدات هەموو حاڵەتە بەشۆلکەو تایبەتییەکان هەڵبهێنجێ...هەر وەکو جاڵجاڵۆکە چۆن داوەکانی خۆی لەخۆدی خۆیەوە ئەیچنێ.بەڵام زانای ئەزمونیی هەوڵ ئەدات زۆرترین ژمارەی واقیعەکان کۆ بکاتەوە...هەروەك چۆن مێرولە چی بتوانێ چو هەرچییەکی پێ بگات بو لانەکەی کێش ئەکات ...بەڵام بەرنامەی

دروست لە سەر چارەسەری تیۆری مەتریالیزم دائەمەزریٚ،کە لە ئەزمونەوە وەرئەگیریٚ...لەمەدا بیکۆن هەنگ بەنمونەی هاوچەشن ئەهێنێتەوە کە چۆن شیلەی گول ئەمژیٚ بەلام وەك خۆی نایهێڵێتەوە،بەڵکو ئەیگۆریٚ بۆ هەنگوین ...بۆیە لای وابوو کە هەر ئەزموونە زانست بەرەو پێشەوە ئەبات و ئەگەر هەر لەسەرەتاوە بەرنامەیەکی دروست بۆ کۆڵینەوە هەبایە وا دۆزینەوەو داهێنانە زانستییەکان بەرێکەت نەئەبوون و زۆر زیاتر و گرنگتریش ئەبوون.دیسان لای وابوو کەکۆلینەوەی لەوێنەی "شێوە-Forms-کەپابەندە بەناوەوەی مەتریال،ئەرکی گرنگی ئیستیقرا-Induction-ی راستەقینەیە.وێنە جەوهەرێکی مەتریالیی سیفەتێکە لە سیفەتەکانی شت،بونمونە ،دیاردەی گەرما،شێوەیەکی دیاریکراوی جوڵەیە،بەلام وێنەی هەر سیفەتێك لە سیفەتەکانی تر دابڕاو نییە...بۆیە بۆ پەیداکردنی وێنەی سیفەتیٚ،ئەبیٚ هەموو ئەو سیفەتە سانەوییانەی بەرواڵەت بەو تایبەتە لێکولراوەوە بەستراونەتەو،لە بازنەی بایەخپێدانمان بکەینە دەرەوە...بەلام ئەم لە ئاسا بەدەرکردنە ناتوانیٚ ریالیستی بیٚ،چونکە هەموو روخسارو ئەدگارەکان لەناو یەکدان و لەهەمان شتەوە ئاڵاون،ئەوە لە ئاسا بەدەرکردنێکی زەینی لوجیکییە،پروسەیەکی جەرد کردنە.مەتریال لای بیکون هەموو چونایەتییە هەستیارییەکانی گرتوتە خۆی، بە دەولەمەندی جۆراو جۆرە بیٚ سنورییەکانیشیانەوە...مارکس ئەڵێت:"مەتریالیزم لای بیکۆن

سەرەتای پزەو تێگەیشتنێکی سەرەتایی پرۆسەندنی گشتی تیایە.لە سەر دەستی ئەمدا مەتریال بە هەستیاری شاعێرانەیەوە بۆ مرۆڤ پێ ئەکەنێ...

شان بەشانی ئەوانە سستێمێکی نوێی بۆ جۆرکردن و ڕێکخستنی زانستەکان دانا کە لەسەر بناغەی توانستی زانینی مرۆڤ ئینجا سێ دانراوە،توانستی مرۆڤ دەستنیشان ئەکات: زاکیرە ...بابەتەکەشی مێژوە بە هەردوو بەشەکەیەوە:سروشتی و مەدەنی،مێشکۆلە:بابەتەکەشی شیعرە،·تێگەیشتن یان بیر کە فەلسەفەو ماتماتیک و زانستە سروشتیەکانی لە سەر بەندە.کاری ڕاستەوخۆی زانینیش کۆڵینەوەیە لە هۆی شتەکان.

لە ئەتلەنتسی نوێدا:بیکۆن داوای گۆڕینی بنکەی بەرهەمهێنانی کۆمەڵ ئەکات،بە هۆی زانست و تەکنیکەوە،لێرەدا ڕۆڵی دەرکەوتووی زانست لە پەرەپێسەندنی خێرایی ڕادەی بەرهەمدا:دووپات ئەکاتەوە.

بیکۆن تا سەر فەیلەسوفێکی مەتریالیستی گونجاونەبوو...ملکەچ کردنیشی بۆ بیری ئیدیالیستی لەوەدا دەرئەکەوێت،ئەگەر بەروکەشیش بێت،کەبوونی زانستێکی تایبەت بە یەزدانی (زانستی لاهوت Theology)سەلماند،دانی نا بەبوونی دوو دیاردە بۆ ڕاستی:یەکێکیان زانستییەو ئەوەکەی تریشیان ئاینییە،دیسان نەیویست هیچ جۆرە ڕەخنەیەکی ڕاستەوخۆ لە باوەڕە ئاینیە غەیبییەکان بگرێ.

دیکارت:فەرەنساش، ئەگەر لەگەڵ ئینگلستاندا بەراورد بکرایە،وا لە پەرەسەندنی دەرەبەگێتیدا دواکەوتوو بوو...بەلام هەر لەنیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەیەمەوە سەرمایەداری تیا پەرەی سەند...پێشەکییەکانی ئەو پەرەسەندنەش لە سەدەی شانزدەدا بوو نەهێشتنی پارچە پارچەیی وڵات و بەدروست کردنی چەند دەوڵەتۆکەیەکی دەرەبەگی جیاجیاو بە پەرەسەندنی پیشەسازی وپیشەگەری و ڕێگەو بان و بە سەرکەوتنەکانی بازرگانی دەرەوە هاتە کایەوە–مۆنارشی–یش شێوەی سیاسی بوو کە لەگەڵ چینی نوبەلادا هەموو هەوڵ و تەقەلای هێزی دەرەبەگەکانیان پەك خست کە ئەیانویست پەرەسەندنی بورژوا بوەستێنن و لە جوڵەی بخەن.

بەلام لەگەڵ ئەەشدا دەرەبەگایەتی تا ئەو سەردەمانەش،پارێزگاری نفوزی ئابوری و ئایدیۆلۆژی خۆی کردبوو...بۆیە زانست و تەکنیك لە بارێکی زۆر خراپدا بوون،بەبەراورد لەگەڵ هۆلەندەو ئینگلستاندا...ئیتر زۆر نوبەلای لاو پسپۆر لەهونەری سەربازیدا چوون بۆ هۆڵەندا کەخاوەنی سوپایەکی پەرەسەندوو بوو لەڕووی تەکنیکییەوە...ئا لەوبارەدۆخە ئابوری و بیرییەدا بوو"ڕینێە دیکارت" لەساڵی١٥٩٦– هاتوتە دونیاوە لەساڵی ١٦٥٠دا لەستۆکهۆڵم کۆچی کردووە.

دیکارت لەفەلسەفەکەیدا بە"دووانەیی Dualism" گیان ولەش،دەست پێ ئەکات.بوونی دوو جەوهەری لەیەك سەربەخۆیی ئەسەلماند:مەتریالی ونامەتریالی.هەروەکو مارکس ئەلێت:"بەتەواوی

فیزیکەکـــەی‌و میتافیزیـــك لەیـــەك جـــودا ئەکاتـــەوە. لەچوارچـــێوەی فیزیکدا،مەتریال جەوهەرو تاکە بوون و هوش پێك ئەهێنێ"٢٧

دیکـــــارت بناغـــــەی لـــــەکۆسمۆلۆگی‌و کۆسمۆگـــــۆنی‌و فیزیـــــك وزیندەوەرزانیدا مەتریالیست بوو.بەرامبەر ئەوە دیکارت لە سایکولۆجی و تیـۆری زانـین و لـە بۆچـوون و ڕاکانیـدا لـە سـەر بوون،ئیدیالیسـت بـوو.ئـەمیش وەکـو"بیکـۆن". لـە گومـان کـردن لـە یـەقینی هـەموو زانیارییەکانەوە دەست پێ ئەکات...کە ڕەخنەی لە زانین ئەگرت هەر بۆ ئـەوە بـووە کـە بـەزانینێکی زیـاتر یـەقینی بگـات...ئـیتر ئـەم بازنـەی گومانییە گەیاندییە:من بیر ئەکەمەوە:کەوابو من هـەم...ئـەم لای وابـوو بوونی بیر زیاتر یەقینییـە لـە بـوونی لەش،هـەروەها زیـاتر لەلـەش و لـە مـەتریالیش ئەسـڵی ترە،بەواتایـەکی تـر دیکـارت ئەیـەوێ ئیـدیالیزمی کۆسۆلۆگی بەهێز بکات،نەك ئەنتۆلۆگی...هەر بەوەشەوە ناوەستێ کە ئەڵێ،ماهییـەتی گیانیی،شـان بـە شـانی مـەتریال هەیـە، بـەڵکو ئـەوە دووپات ئەکاتەوە کە یەك هەبووی یەقینی هەیە...بەرزتر و پیرۆزترە لە هەردووکیان ئەویش یەزدانە.

ڕافیزیکییەکانی دیکارت بونە پالپێوەنەریکی گەورە بـۆ مـەتریالیزمی ســـەردەمی نوێ،چـــونکە ڕووخســـتنی پرنســـیپی پەرەســـەندنێکی گێتی،یارمـــەتی بەدەســـت هێنـــانی گـــەلێ ســـەرکەوتنی دا،لـــە کۆسمۆلۆگیدا،پەرەسەندن،هـەروەك پەرەسـەندنێکی میکـانیکی پوخـت تێ ئەگەیشت...لەکۆسمۆگۆنیدا،بیری پەرەسەندنی سروشـتی سسـتێمی

خۆر ئەخاتە ڕوو،کە بەندە بەخاسییەتەکانی مەتریال و جوڵەی ئەو وردیلانەی مەتریال پێك ئەهێنن...لەدانەرانی ئەندازیاری شیکاریی بوو...سستێمی ڕەمزی جەبری بەکارهێنا-کە ئێستا کە بەکەمێ دەسکاری سادەوە لە هەموو ماتماتیکی سەردەمدا بەکار ئەهێنرێ...لە میکانیکدا..نیسبییەتی جۆلەو وەستاویی دیارد بۆ کردو یاسای گشتیی کارو کاردانەوەی دارشت،هەروەها،یاسای پارێزگارکردنی چەندایەتی جوڵەی سەرجەمیی،لەکاتی پێکدادانی دوو تەنی جیردا،دانـاو لەژێر کـارتێکردنی بـیرە فیزیکییەکانیـدا فەلسەفەکەی لـە سـەر مـەتریال یا،جەوهەری تەنی،دائەرێژێ. مـارکس ئـەڵێت:"دیکـارت هێزێکی خۆیی داهێنەری فراوانی دا بە مەتریاڵ"(٢٨).لەدواییدا دیکارت ڕا سروشتی و گەردوونییـەکانی،بەتیورییەکـەی دەربـارەی مـرۆڤ،کۆتـایی پـێ ئەهێنێ..مرۆڤ لای ئـەم پەیوەندییـەکی ڕیالیستییە لەتـەن،بەو پێیـەی گیـانی تیانییـە،گیـان کـە ئـاقڵ و بیرکەرەوەیـە،پێکهاتووە.ئـەزموون پێشانمان ئەدات کە دەروون و تەن هاوکاران و یەك بوون پێك ئەهێنن و حاڵەتەکانی لەش بەندە بە گیانەوە،دیسان پێچەوانەکەشی ڕاستە.

دیکارت،هەروەك بیکۆن،لای وابوو کە ئەرکی سەرەکی زانین مسۆگەر کردنی بەختیاریی مرۆڤ و دەست بە سەرا گرتنی سروشت و بەکارهێنانی هێزەکـانێتی بـۆ بەرژەوەنـدی خـۆی...بـەڵام پێوانـەی یـەقین لای ئـەم پراکتیـك نییـە بـەڵکو هۆشـی مرۆڤـە...ئـەقڵ نـەك هەسـتەکان ڕۆڵـی سەرەکی لە پروسەی زانیندا وازی ئەکات و لای وابو کـە ئـەقلی چـەکدار

بەدوو هێزە یەقینییە بە ناوبانگەکە:خەملاندن و هەڵهێنجان–ئەتوانیّ لە هەموو بوارێکا بگاتە زانینی یەقینی بە مەرجێك لە سەر بەرنامەیەکی دروست بڕوات...ئەم بیرانەی دیکارت شوێنەوارێکی گەورەیان بۆ پەرەسەندنی فەلسەفەی دوای خۆی بە جێهێشت.

**فەلسەفەی مەتریالیستی هۆبس:**

تۆماس هۆبس ١٥٨٨–١٦٧٩فەیلەسوفی گەورەی ئینگلیزو هاوسەردەمی شۆڕشی بورژوازی ئینگلیزی بوو...هەرچەندە شۆڕشەکە سەرنەکەوت بەڵام پایەگەکانی بورژوا بە هێز بوو...ئایدیۆلۆژییەکی نەێی دژ بە دەرەبەگایەتی دەستی کرد بە پەرەسەندن...هۆبس لەو سەردەمەدا ژیاوە کە خەباتی شۆڕشگێری لە ژێر ئالای تیندینسی پرۆتستانتیندا دەستی پیّ کردو بەشە پێشەنگەکەی ئەرستوکرات ڕۆڵی گرنگی لە ژیانی ڕۆشنبیریدا ئەبینی،چارەنووسی خۆشی بە بۆرژوای تازە پێگەیشتووەوە بەستەوە...لە ناو ململانێی دژ بە ئایدیۆلۆژی دەرەبەگێتیدا ئیدۆلۆگەکانی بورژوا کەوتنە خستنەرووی بیرو ڕێبازیان لە سەر:مەسەلە ئاینیەکان و لێبوردنی ئایینی و یاساو هەق...هەوڵیان دا کە پەیدا بوونی کۆمەڵگەو دەولەت لە بە پرشنگی یاسای سروشتی مرۆڤایەتی و خەسلەتەکانی لێك بدەنەوە. ئەمانە لایان وابو کە سروشتی مرۆڤایەتی بەرهەمی جیهانی دەرەوەیە...تێگەیشتنیان بۆ دیاردە سروشتییەکان لە میکانیکی تێپەریکردو ژیانی کۆمەڵایەتیشی

گرتـەوە...ئـەو ڕێبـازو تێندێنسـانە بـە ڕوونـی لـە فەلسـەفەی هوبسـدا ڕەنگیان ئەدایەوە.

بیروڕاکـانی ئـەم زانایـە لـە ژێـر کـارتێکردنی بیرەکـانی کۆپـەرنیك و کیپلـەرو گـالیلۆو هارڤیـدا پێك هـاتن...لـە کـاتی شۆڕشـی بـورژوازی ئینگلیـزدا بەناچـاری ئینگلسـتانی بـەجێ هێشـت،لە پـاریس دانـراوە سـەرەکیەکانی نووسـی..بایـەخێکی تایبـەتی دا بـە تیـوری کۆمەڵگـەو دەوڵـــەت.مــارکس لەبـــەر تیشـــکی ڕاکـــانی کڵێســـە...بۆیـــە ڕا کۆمەڵایەتییەکانی دریژەپێدانی ڕا مەتریالیستەکانی بووە لـەدەربارەی سروشت و یاساکانی"١.

دیسـان مـارکس ئـەڵێت:"هـۆبس ڕا مەتریالیسـتییەکانی بیکـۆنی لـە مەزەبێکی فەلسەفی تەواودا داڕشت.ئەیووت قەت نـاتوانرێ بیرکردنـەوە لەمـــەتریالی بیرکـــەرەوە جیـــا بکرێتـــەوە،لـــە ڕێبـــازە سروشتییەکەشـیدا...لـەناو مـەتریال و جوڵـەو،تـەن و گـۆران و،یاسـا میکانیکییەکان و شێوەی گواستنەوەی جۆلان لـە تەنێکـەوەبۆ تـەنێکی ترو ژیانی دەرونیی مرۆڤ و ئاژەڵ وهەستدا ئەگاتە ئەم ئەنجامانە:

١ـ گیان و دەروون وەك جەوهەری جیاواز لە ئارادا نین...

٢ـ تەنەکان تاکە جەوهەرەکانن کە لەگێتیدا هەن.

٣ـ باوەڕکردن بەیەزدان تەنها ئەنجامی خەیاڵی مرۆڤە...

بـەڵام مـەزەبی زانـین لای هـوبس،سروشـتەکەی هـەر لـەو پرنسـیپە مەتریالیســـتە خوانەناســـیانەوە داڕێـــژراوە...زانـــین لـــەناو بـــیر

ئیدیایەکانەوەدروست ئەبێت،هەستەکانیش تاکە سەرچاوەن بۆ بیرەکانمان...لێرەدا پرنسیپی...من بیرئەکەمەوە،کەوابوو من هەم،رەت ئەکاتەوە،دەربارەی بیرو سەرچاوەکەی،گەیشتە ئەم ئەنجامە...هەستەکانی دەرەوەمان هەر سەرچاوەی بیرەکانمان نین وبەس،بەڵکو بە گشتی هی زانینیشن...تەنە دەرەکییەکان کار ئەکەنە سەر هەموو گۆشەکانی هەست...بەوە بیرە سەرەتاییەکان لای مرۆڤ دروست ئەبن.لە راننەوەکانی ئەسیر بیری ڕوناکیی ئەخولقێنن...لەراننەوەکانی هەوا بیری دەنگ ئەخولقێنن.مەزەبەکەشی دەربارەی دەوڵەت و هەق،ناوبانگێکی زۆر فراوانی دەرکرد...دیاردەی ئالۆزی دەوڵەت ئەگێڕێتەوە بۆ ڕەگەزە سادە پێك هێنەرەکانی..ئینجا ئەو ڕەگەزانە بە هۆی یاسا سروشتییەکانەوە لێکئەداتەوە...تا ئەگاتە:دەست نیشانکردنی دوو حاڵەتی کۆمەڵی مرۆڤایەتی:سروشتی،وە شارستانی...لەناو ژیانی کۆمەڵگەی سروشتیدا...خەڵك بەپێی یاساکانی مانەوە ڕەفتار ئەکەن...لێرەدا هەق مانای هێزە...بۆیە ئەوە حاڵەتی جەنگی هەمووانە لەدژ هەمووان... ئەمەش لە دژی تێندێسی پاراستنی مانە...بۆیە خەڵك داوای ئاشتی ئەکەن...بەڵام هەر یەکە واز لە بەشێك لە مافی خۆی ئەهێنێ،ئەم وازهێنانەش بە هۆی"پێکاتنەوە"ئەبێ.ئەمەش مانای وایە کە کۆمەڵگە لە حالەتی سروشتییەوە گۆڕرایەوە بۆ حاڵەتی شارستانیی...بۆ ئەوەی نەهێلرێ کردەوەی وا بکرێ کە ئاشتی تێك بدات، ئەبێت دەسەڵاتێکی

ناوەندیی هەبێت...تا خواستی خەڵك دەربخات...بەو جۆرە دەوڵەت پەیدا ئەبێت...نرخی مێژویی ڕا كۆمەڵایەتییەكانی هۆبس لە ڕادەبەدەر مەزن بوون...سەبارەت بەوەی لەدژی دیدی ئایینی دەرەبەگی بوون بۆ دەوڵەت،چونكە ئەیوت پەیدابوونی دەوڵەن وەرامدانەوەیەكی سروشتیی پەرەسەندنی كۆمەڵ خۆی بووە، نەك ویستێكی یەزدانی بێ لە سەر ئەرز...هەروەها لای وابو كە دەوڵەت دەستگایەكی زۆرەملێیە،بەڵام سەرنجی بۆ ئەوە نەدا كە ئەو زۆرەملێیە دەست بە سەراگرتنی چینێكە لەلایەن چینێكی ترەوە...

ڕاكانی هۆبس لە بارودوخی سەدەی حەڤدەدا پێشكەوتوانە بوون...هەروەك ماركس دیاردی بۆ كردووە.هۆبس هەوڵی دا كە مەتریالیزمەكەی بیكۆن لە كەموكورتییە ئایینییەكان پاك بكاتەوە...فەلسەفەكەی هاوبەشییەك بوو لەرزگار كردنی ئەقڵی خەڵك لەیەخسیری واهیمە ئایینییەكان.سەرەتا پزەییەكانی تێگەیشتەی بیری مەتریالیستی دیاردە كۆمەڵایەتییەكانی تیابوو.

**فەلسەفەی مەتریالیستی سپینۆزا:**

لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەمدا هۆڵەندا،وەكو ئینگلستان، یەكێك بووە لە پێشكەوتووترین وڵاتانی كیشوەری ئەورووپا...هەر لەنیوەی دووەمی سەدەی شانزدەوە شۆڕشی بورژوازی تیا سەركەوت،گەل بە

خەباتی خوێناوی خۆی توانی زۆرداریی دەرەبەگێتی ئیسپانیا لەسەر شانی خۆی لاببات و یەکەم کۆماری بورژوازی لە ئەوروپادا دابمەزرێنێ.

پەرەسەندنی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری،پالپێوەنەرێکی بە هێزی کوڵینەوەی زانستی بوو،بەتایبەتی میکانیك و فیزیك و تەکنیکی سەربازی و مەدەنی و ماتماتیك وفەلەك و هونەری ڕیالیستی...ئەمانەش هاوبەشییەکی گەورەی پەرەپێسەندنی فەلسەفەیان کردو بەرەو پێشەوە تەکانیان پێدا...لەم باروبوخەدا ئیدیۆلۆگی مەزن"بارۆخ سپیۆزا"١٦٣٢-١٦٧٧-ژیاوە...فەلسەفەکەی ڕێبازێکی سەرەکی مەتریالیزمی سەدەی حەڤدەیەم پێك ئەهێنێ...لە خێزانێکی جولەکە لە ئەمستردام لە دایك بووە:باوکی خواستی ئەوەبوو ببێت بەمالوم...بەلام سەبارەت بەوەی کە سپینۆزا ئاشنای بیری پێشکەوتوانەی زانست بوبو،بە تایبەتی فەلسەفەی دیکارت...بۆیە ئایینی"جوی"واز لێهێنا.لەبەر نەخۆشی و زوو مردنی،تەنیا دوو دانراوی تەواو کرد"پەیامی لاهوتی-سیاسی"١٦٧٠-و ڕەوشت-١٦٧٥-.

ئەم زانایەش هەر وەك دیکارت هەوڵی دا فەلسەفە لە سەر پایەگای پرنسیپی دڵنیایی تەواوەتی دابمەزرێنێت...لای وابوو کە فەلسەفە ئەبێت دەسەلاتی مرۆڤ بەسەر سروشتدا بە هێز بکات...لەناو بیری پێشکەوتووانەی پێش خۆیدا مەسەلەی ئازادی ئەخاتە ڕوو...

لە مەزەبی سروشتیدا سپینۆزا ڕا مەتریالیستە خوانەناسییەکانی لەسەر ئەو بناغەیە بینا ئەکات کە لەگێتیدا یەك مەتریال Substance

هەیە ئەویش سروشتەو لە بونیدا پێویستی بە بوونی هیچ شتێکی تر نییە،ئەم سروشتە...لە لایەك سروشتێکی خوڵقاوە،وە لەلایەکی تر سروشتێکی خوڵقێنەرە...بەمە تێگەیشتەی مەتریالی و ئیلحادی لە شێوەی پانتیزمیی پشتگیری لێ دەکات.دیسان بیری جودایی ماهییەت و بوون پەرە پێئەسەنێ،کاتێ ئەگاتە سەر جەوهەری بێ سنوورو بێ کۆتایی...ئەو جوداییە نامێنێ...مرۆڤ،سەبارەت بەوە بابەتێکی زانینە،لەم یاسا گشتییە دەرناچێت کە هەموو گێتی ئەبات بەرێوە...لە هەموو حاڵەتێکیشدا بەشێکە لە سروشت...

سپینۆزا هەوڵی دا ڕەوشت بکاتە زانستێك، بەڵام پێوانەکانی لە خەملاندنوئارەزووی خۆیی خەڵکەوە هەڵنەهێنجرێ، بەڵکو لەو یاسا بابەتییانەوە بێ کە فرمان بەسەر ڕەوشتو کردارەکاندا ئەکەن...لە هەمان سوچی سروشتەوە... سەیری ڕەوشت ئەکا.بەرنامەی زانستی دەروون لە بەرنامەی میکانیكو فیزیك نزیك ئەکاتەوە،ژیانی دەرونیی، بە هەموو دەوڵەمەنیو جۆرەکانییەوە ئەگێڕێتەوە بۆ دووپرنسیپی ئاسان:بۆ

١ـ ئەقڵو بۆ

٢ـ هەستدانەوە AfTeets...لە سەر ئەم بناغە سروشتیانە ڕێبازی ئازادی دائەنێو دوو مەسەلە لەیەك جودا ئەکاتەوە:

یەکەم:ئایا ئازادی بۆ مرۆڤ ئەگونجێ؟.

دووەم:ئایا ویستی مرۆڤ ئازادە؟.

ئەم فەیلەسوفەمان هەموو تێگەیشتەیەکی ئیدیاتیستانە بۆ ویستی ئازادانە ڕەت ئەکاتەوە...بەڵام ئەوەش ڕوون ئەکاتەوە کە ئازادی پێچەوانەی پێویستی نییە...شتی هەبووی پێویست،لەهەمان کاتدا ئەتوانێ ئازاد بێ ئەگەر پێویستی بوونی،تەنها لە سروشتی خۆیی خۆیەوە هەڵقوڵابێ...

لەسەرئەنجاما ئەڵێ:ئازادیی هۆشی پێویستییە واتە دیدێکی ئاشکراو ڕوونە بۆ ئەو پێویستییە،ئەم ئیدیە دیالیکتیکیانەی سپینۆزا بەرهەمێکی بەرزی فەلسەفەی مەتریالیزم بوو...بەڵام تێگەیشتەکەی دەربارەی ئازادی تەنها قسەو ،نامێژوییش بوو...

تیۆری زانین لای ئەم فەیلەسوفە ، وەك مەزەبەکەی گشتی ، سروشت مەتریالو ئەقڵی بووە، نزمترین شێوەی زانین لای ئەم ئیدیۆلۆگە ئەو زانینەیە کە لەسەر خەیاڵ وەستاوە لەنرخی زانینی هەستیی کەم ئەکاتەوەو لایەنی ئەقڵ بەرز ئەکاتەوەو نکۆڵی لەئەزموون و ئەکات کەسەرچاوەی زانینی تەواوی بێ...ئەگەر سپینۆزا ڕۆڵی ئەزموون و پراکتیك لە پروسەی زانیندا تێبگەیشتایە وا لە جیاکردنەوەی هەردوو شێوەکەی زانیندا–هەستیی و ئەقڵی،زیاد نەئەرویشت و دەرکی بەوە ئەکرد ئەزموون و پراکتیك خۆیان چەند هەبوونێکن ڕاستەوخۆ بە ئەقڵ دەرك ئەکرێن.

تێندێنسی خوانەناسی سپینۆزا ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە پەرەسەندنی ئیلحادو بیری ڕزگار بوو لە ئایین لە سەردەمی

نوێـدا..ئـەیووت ئـەبێ کلێسـە سەربەسـتی لێکۆڵینـەوە بـەزاناکان بدات...فەلسەفەو ئاین لێك جیان و پرنسیپە فەلسـەفی و زانستییەکان دژی ئاین نین مەترسی لەسەر پاکژیی ئاین و ڕەوشتی کۆمەڵ دروست ناکـەن...مەترسـی گـەورە لـە ئـازادی بـیرەوە نییـە بـەڵکو لـە هـەوڵ وتەقـەلای کلێسـە و دەوڵەتەوەیـە کـە ئەیانـەوێ لـەم ئازادییـە کـەم بکەنەوە...کۆنیی تەورات و خواکردی ڕەگەزەکەی بەدرۆ خستەوە...بـە ئاشکرا داوای سەرفراز بوون لە تـەوقی کۆیلەیـەتی ئـاین ئـەکرد، بـەلام سـپینۆزا لـەرا کۆمەلایـەتی و سیاسـییەکانیدا کـەمتر سـەربەخۆ بـووە...داوای دەسـەلاتی تـەواوی بـۆ دەوڵـەت ئـەکرد،کـە هـەموان بەکلێسەشەوە ملکەچی بن،سستێمی دیموکراسی بەبـەرزترین شـێوەی فەرمانرەوایـەتی دائـەنا...ئـەیووت هـەر دەسـەلاتێك بەتوقانـدن خـەڵك بەڕێوە بەرێ...فەرمانرەوایەتییەکی باش نابێ...

**فەلسەفەی مەتریالیستی لۆك:**

**جۆن لۆك** ١٦٣٢-١٧٠٤ لە نوێنەرە مەزنەکانی مەتریالیزمی ئینگلیـزی بوو،پەرەی بەفەلسەفەی بیکۆن و هۆبسی دا،دروستی مـەزەبی هەسـتیی Sensualism مـەتریالیزمی سـەلماند..سـەردەمی دووەم شۆڕشـی بورژوازی ئینگلیزی بینی..-١٦٨٨ – کـە بەسازشـکاری نێـوان بـورژواو نوبولا نوێیـەکان تـەوا بـوو. ڕێگـەی بـۆ پـەرەسـەندنی سـەرمایەداری لـە ئینگلسـتاندا کـردەوە...ئـیتر بـورژوا لـە ولاتـەدا خـەباتی خـۆی لـەدژی

دەرەبەگایەتی بۆ لەناوبردنی پاشماوەکەی فراوان کرد.جۆن لۆک وەك فەیلەسوف و زانای ئابوری و نووسەرێکی سیاسی هاوبەشی ئەو خەباتەی کرد.

بەرنامەی نوێی زانین ڕێگەیەکی سەرەکی ئەو خەباتە بوو...ئەزموون لای ئەم تاکە سەرچاوەی هەموو بیرەکانە...ئەبووت دوو جۆرە ئەزموون هەیە:ئاشکراو، شاردراوە.بەو پێیەش دیارد بۆ دوو سەرچاوەی ئەزموونی پراکتیکی بیرەکانمان ئەکات: هەستو بیرکردنەوە...بیری هەستیش ئەنجامی کارتێکردنی شتە دەرەکییەکان لە سەر گۆشەکانی هەست دەرئەکەوێ.

لەدانانی بەرنامەی میتافیزیکیدا،لۆك ڕۆلێکی بەرزی وازی کرد...پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنەر لە کۆمەڵگەی بورژوازیداو ئەرکی شیکردنەوەی دیاردەکانی سروشت و جیاکردنەوەی جۆرجۆرکردنیان و توێژینەوەی هەریەکەیانی بەجیا خستە بەردەم زانست.بیرە وەرگیراوەکان،بەهەست بێ یا بیرکردنەوە،تاکە مەتریالی سەرەتایی زانینن،نەك زانین خۆی .بۆ دەستکەوتنی زانین ئەبێت ئەم مەتریالە سەرەتاییە بخرێتە ژێر چارەکردنەوە،ئەوەش بە هۆی سێ توانستە دەروونییەکەوە:بەراوردکردن،ڕۆنان جەرد کردن،بە هۆی ئەمەوە بیرە ساکارەکان–هەستیی و بیریی– ئەبنە بیری ئاوێتە.مەسەلەی زمانیش لە تیوری زانینی ئەم فەیلەسوفەماندا شوێنێکی گرنگی گرتووە...تیۆری جەردکردن Abstraction یش

بەستراوەتەوەبەو مەسەلەیەوە...وشەکان ڕەمزی هەستیین و ئامرازی لەیەك گەیشتنی نێوان مرۆڤن،زۆربەشیان تاك نین بەڵکو زاراوەی گشتیین...لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش ئەگەر شت تەنها بە تاك هەبێ،ئەبێ ئەو ماهییەتە گشتییانە کە بەرەمزی زاراوەی گشتی دیاردیان بۆ ئەکرێ لە کوێوەبێن؟...وشە کاتێك ئەبێتە گشتی کە ئێمە ئەیکەین بە ڕەمزی بیری گشتی...کەپرسیاری ئەوەش بکرێ ئایا ئەم بیرە گشتییانە چون دروست ئەبن...واتیۆرییەکەی لۆك لەجەرد کردنا وەرامی تەواو ئەداتەوە.کە لە تاقیکردنەوەمانا زۆر شت لە هەندێ حاڵەت و خەسلەتا لە یەك ئەچن،ئینجا بە هۆی جەرد کردنەوە خەسلەتە لەیەك چووەکانی بە شۆلکەکان دەرئەهێنن و دەرکەوتە خۆیی و سانەوییەکانی لائەبەین...بەو جۆرە بیرە سەرجەمییەکان دروست ئەبن کە بەیەك واتە نیشانەی بۆ ئەکەین، بەو چەشنە بیرە گشتییەکان،وەك بیری "مرۆڤ" و "ئاژەڵ" و "رووەك"...دروست ئەبن.

لەبواری کۆلینەوە لە یەقینیی بیرەکان،لۆك دوو شێوەی زانین لە یەك جیا ئەکاتەوە:زانینی دروست،یەقینی،وورد.ئەوی تر:مەزەنیی،–ئیحتیمالی–یە.

لەبیرە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیدا...لۆك تیۆری لە سەر دەوڵەت و دەسەڵات و یاسا دانا کە لە گرنگترین تیۆرییەکانی سەدەی حەڤدەیەم ئەژمێردری لەسەر "مافی سروشتی".ڕا سیاسییەکانی،بە گشتی بەڵگەو پالپشتی تیۆری بوون بۆ پرۆژەی پارتی لیبراڵەکان –ویگ–داوای لەیەك

جیاکردنەوەی تەواوی هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێ کردنی ئەکرد...لە بیروڕا گرنگەکانی تری لۆك...بەڕەوا زانینی شۆڕشی بورژوازی بوو،ئەگەر سستێمی کۆمەڵایەتی و سیاسی کەرەسە وبیری پێویست بۆ پەروەدەکردنی خەڵك نەڕەخسێنێت...وا بۆیان هەیە ئەو سستێمە بگۆڕن.

**فەلسەفە لە ئینگلستاندا کۆتایی سەدەی ١٧-١٨:**

فەلسەفەی لۆك ڕۆڵێکی گرنگی وازی کرد لە پەیدابوون و پەرەسەندنی ڕوناکبیری ئینگلیزی لە سەدەی حەڤدەو هەژدەدا...لایەنگرانی ئەم ڕێبازە فەلسەفییە فراوانە دژ بە ئایدیۆلۆژی دەرەبەگێتییە داوایان ئەکرد،باوەڕ بۆ سنوری بەرژەوەندی ئەقڵ و ئاینیش بۆ سنوری بەرژەوەندی زانست دەستنیشان بکرێ.دیسان ئەیانووت:ئەبێ لە سەرپەرشتی کڵێسە ڕزگار بکرێ..لایان وابوو ڕۆشنبیری و زانست هێزی جوڵێنەری پەرەسەندنی مێژوو مەرجی بناغەی دامەزراندنی دەسەڵاتی ئەقڵن...بۆیە داوای بڵاوکردنەوەیان ئەکرد.روناکبیری سەدەی هەژدەیەم،ئامرازی دەستی چینی بورژوازی ساوا بوو لە خەباتدا لە دژی پایەگاکانی ژیانی بیریی،کەلە کۆمەڵگەی دەرەبەگێتیدا چەسپیو بوبو،ببوە کۆسپێکی گەورە لە بەردەم پێشکەوتنی زانست و باوەڕە زانستییەکان،بەبەڵگەو بیانوی تیۆری دەسەڵاتی سیاسی چینی کاربەدەستیشی پاڵپشت ئەکرد.بەڵام نوێنەرانی ڕوناکبیر کردن هاتن لە دژی ئەم دەسەڵاتە

وەستان،سەرەنجام بە سەر کەوتنی بورژوا لە ولاتاننی ئەورووپای ڕۆژئاوادا بیری ڕوناکبیریی کەوتە بەردەم بلاوبونەوەیەکی بەربلاو لەئینگلستان و ئینجا لە پاریس و دواییش لە ئەلمانیادا.

لەو مەسەلە بنچینەییانەی کە بیری فەیلەسوفە ڕوناکبیرەکانی داگیر کردبوو،مەسەلەی پەیوەندی زانین بوو بە ئیمانەوە،پەیوەندیی دیدی نوێی زانستی بە ڕووداوو ئەفسانە خورافییەکانەوە کەلە ئینجیلدا هەن...بە گشتی بورژوازی ئینگلیزی ئارەزووە نە ئەکرد بە تەواوی خۆی لە وابەستەی ئاینی بپچڕێنێ...فەیلەسوفی واش هەبوو لە دژی زانست و فەلسەفەی پێشکەوتوانە وەستا،لەوانە:جۆرج بێرکلی ١٦٨٤-١٧٥٣ب ر کە ئەیویست لە سەرچاوەی بنچینەیی هەموو ڕێبازە مەتریالیستییەکان بدات..بەڵام هیوم ١٧١١-١٧٧٦-لای-گومانیی Skeptiesm و نازانم Agnosticism- ی گرت...بۆیە لە بەینی مەتریالیزم و ئیدیالیزمدا،هەروەك لینین ئەڵێ:لەمبەرو ئەوبەری کردندا بوو٢.

**فەلسەفەی ئەلمانی لە سەدەی حەڤدەهەمدا:**

لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەمدا ئەلمانیا،بەبەراورد لەگەڵ هۆلەندەو ئینگلستاندا،ولاتێکی دواکەوتوو بوو،دوای شکستی جەنگی خاچ(١٥٢٥)جەنگی سیی(٣٠)ساڵە لە سەدەی حەڤدەیەمدا بەرپا بوو کە بووە هۆی وێرانکاری و تێکدانی زۆر لەم ولاتەدا...هیچ چینێکی کۆمەلگەی ئەلمانیای ئەو کاتە نەیتوانی ببێتە ناوەندی یەکخستنی ولات

و رێکخستنی هێزە کۆمەڵایەتییە شۆڕشگێروپێشکەوتنخوازەکان ...بۆیە ئەبینین ئەڵمانیای ئەو سەردەمە لە ڕووی سیاسییەوە لە ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتۆکەو میرنشینی دەرەبەگیی بچوک بچوک و لە یەک دوورو دژ بەیەک پێکهاتبوو،هەر لەو بارودوخەشدا ئایدیۆلۆژی ئایینی پارێزگاری جێگەکانی خۆی کرد.بەڵام مەتریالیزم،هەرچەندە بە هۆی ئەو سەرکەوتنانەی زانستی فیزیك و زیندەوەرزانیی و زانستی سروشتی بەدەستیان هێنا بووگەشایەوە...بەڵام هەر زوو دامرکایەوە،بەبێ ئەوەی ببێتە هێزێکی بیریی گرنگ...هەر وەك لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی ئەورووپادا ڕووی دا...لە فەیلەسوفە بەناوبانگەکانی ئەم سەردەمەی ئەڵەمانیا لیپنتز-ە ١٦٤٦-١٧١٦ئەم...ئیدیالیستێکی بابەتی بوو...چالاکانە هەوڵی ئەدا تیۆری ببەستێتەوەبە پراکتیکەوە ...ئەمەش بەرەو تێگەیشتەیەکی نوێی جۆری ڕێکخستنی هەموو پروسەی زانستی برد...دیسان لیپنتز بایەخی دا بەمەسەلە کۆمەڵایەتییەکان.پەیامێکی لەسەر چاککردنی سستێمی سەرانەو نەهێشتنی بێکاریی و مافی دەرەبەگی و ڕەخساندنی کار بۆ هەژاران و چاککردنی کار گوزاری گشتی دانا...پەرەسەندن لای ئەم ئیدیۆلۆگە تێگەیشتەیەکی فراوانی هەیە و هەموو شتێك لە سروشتدا پەرەئەسەنێ،نکۆڵی ئەکا لەبوونی قەڵەمبازدان یا پچڕان لە پروسەی پەرەسەندنی بەردەواما...لە تیوری پەرەسەندنا باسی جۆری گواستنەوەی بێگیان بۆ زیندەوەر ئەکات.دیسان بایەخێکی زۆری بە مەسەلەکانی زانین و لۆجیك

دا...فەلسەفەکەی لیپنتز،هەرچەندە مەزەبە سروشتیکەی مۆرک میکانیکی بوو.بەلام سەرەتای تێگەیشتەی دیالیکتیکی سروشت و ناسینی مرۆڤایەتی تیا بوو...کۆلینەوەی قۆل لە بیرورا دیالیکتیکەکانی ئیفلاتۆن و تێگەیشتە دینامیکییەکانی بۆ پرسەی سروشت کرلو هەولیدا ئەزموونی ئەقلّیی لە-زانیندا تێکەلّ بکات...ئەوانە ئەم فەیلەسوفەیان گەیاندە بیرە دیالیکتیکییەکانی.بەلام دوای خۆی پەرەی پێنەدراو خامۆش کرا.

**روناکبیریی فەرەنساوی لە سەدەی هەژدەهەمدا:**

نیوەی دووەمی سەدەی هەژدە لە مێژوی فەرەنسەدا نمونەیەکی کلاسیکیمان ئەداتیّ کە بالاّکردن و پەرەسەندنی شێوەی بەرهەمهێنانی نویّ-شێوەی سەرمایەداری،لە هەناوی کۆمەلگەی دەرەبەگێتی و لە ناو چوارچێوە سیاسییەکەیدا دەبێت.پتەو بوونی دەسەلاتی مۆنارشی بە درێژایی هەردوو سەدەی حەڤدە و هەژدە لە فەرەنساو یارمەتی پەرەپێدانی هێزەکانی بەرهەمهێنانی کۆمەلگەی داو بەرەو پێشەوە بردی...لە دوایشدا ناکۆکییەکانی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری توندو تیژ ئەبوو،بەتایبەتی پەیوەندییە کۆمەلایەتییە دەرەبەگایەتییەکان ئەبونە کۆسپی بەردەمی پەیوەندییەکۆمەلایەتییە بورژوازییەکان و گەشەکردنیان،ئەو ناکۆکییە رونتر لە ژیانی بیریی کۆمەلگەی فەرەنسەدا دەرئەکەوت،لەگەلّ بیرە زانستییە نوێیەکاندا، بیری ماتماتیک و فیزیک و میکانیک و فیزۆلۆگی وپزیشکی،بیرە

فەلسەفییە مەتریالیستەکان خۆیان ئەگەیاندە مێشکی خەڵکی-بەڵام هێزە کۆنەپەرستەکان،بە تایبەتی پیاوانی کڵێسەی کاسۆلیکی بەرامبەری وەستان...لەگەڵ ئەوەشدا بیری پێشکەوتوانە هەر بەرەو پێشەوە ئەڕۆی...لەفەرەنسای پێش شۆڕشی بورژوا(١٧٨٩)بەچل ساڵێك بزوتنەوەیەکی ڕوشنبیری بە هێزو فراوانی تیا ڕویدا،کە بەبزوتنەوەی ڕوناکبیری ناو ئەبرێ...هەر وەك ئینگلیستان،لە سەر زەمینەی سەرکەوتنی زانستی نوێ دامەزراوە،بوە هێزێکی گەورەی تێکوشان و سەرخستنی بیری زانستی.بەڵام ئەم ڕوناکبیریە ڕێبازێکی تەباو هاوڕەگەز نەبوو،بەڵکو شان بە شانی مەتریالیزم،ئیدیالیزمیی تیابوو شان بەشانی خوانەناسی ڕێبازی ئاینیش لە ئارادا بوو،دیسان سەرچاوە بیرییەکانیش هەر یەك نەبوون.

روناکبیریی ئینگلستان یەکێك بوو لە سەرچاوە ڕوشنبیرییەکانی ڕوناکبیرانی فەرەنسا،لە سەر دەستی"ڤۆلتێر"و"مۆنتسکسۆ"دا ڕۆشنبیرەکانی فەرەنسا ئاشنای ئنگلیستانی نوێو کەلتورەکەی بوون..هەروەها کەلتوری پێشکەوتوانەی کۆنی فەرەنسا خۆشی سەرچاوەیەکی تر بوون..بۆ نمونە"گاسندی"و"دیکارت"زەمینە خۆشکەری ڕوناکبیریی فەرەنسا بوون لە سەدەی حەڤدەیەمدا.دیسان کردارەکانی:بیربیل"یارممەتیدەری گەشانەوەی ڕوناکیریی سەدەی حەڤدە وهەژدە بوون.

**شارل مۆنتسکو**( ١٦٨٩-١٧٥٥ ) لە ڕوناکبیرە بە ناوبانگەکانی فەرەنسا بوو...دانراوەکانی،بە تایەتی"گیانی یاساکان" خستیانە ڕیزی ئیدیۆلۆگە سیاسیی و یاسا نامە بەرزەکانەوە، نەك هەر لە فەرەنسا بەڵکو لە هەموو جیهانیشدا. بیری سەرەکی "گیانی یاساکان" تێندێنسی ئەقڵی و سروشتی بوو...

ئەو ئەرکەی ئەم ئیدیۆلۆگە لەبەرچاوی گرتبوو... ئەرکێکی یاسایی بوو، لەسەر بەراورد کردنی یاسادانان و ستێمی سیاسی لە ئینگلستان و فەرەنسە لەگەڵ ستێمی کۆماری و کۆلۆنیالی کە لە ڕۆمادا دامەزرابوو.. بۆیە ئەم، یەکەم زانا بوو کە بەرنامەی بەراوردیی Comparative لە کۆڵینەوە لەمەسەلە یاساییەکان و فەلسەفەی هەقدا بەکارهێنا... ئەمەش مەتریالێکی دەوڵەمەندی بۆ دانانی تیۆرییەکەی ڕەخساند، لەسەر شێوە سەرەکییەکانی فەرمانڕەوایی و مەرجەکانی گەشەکردن و ڕوخاندنی.. لەو هەموو شێوانەشدا، مۆنتسکیۆ ئەو مەرجانە لێئەکۆڵێتەوە کە ئەرکی مسۆگەر کردنی ئازادی سەڵتایەتی پێ سپێردراوە، هەروەها لەو باروذۆخە ئەکۆڵێتەوە کە فەرمانڕەوایەتی ئەبێت بەزۆرداریی... لەگەڵ ئەوانەشدا، مۆنتسکیۆ لەداواکردنی گۆڕانی شۆرشگێڕانەی کۆمەڵ دوور بووە... ئەم زانایە گاڵتەی بەزۆرداریی مۆنارشی فەرەنسا ئەکرد. وە بەشێوەیەکی دژ بەسروشتی مرۆڤ خۆی و دژ بەمافی پێرسونالی و پارێزگارکردنی و ئارامیی دائەنا... ئەبووت سزا بۆ کردارە نەك بۆ بیروڕا... لەدژی لاتنگیریی ئایینی و هەموو

شـــێوەیەکی ئەشـــکەنجەبوو... داوای قەدەغـــەکردنی کۆیلەیـــەتی و بەکۆیلـەکردنی ئـەکرد... زیـاد لـە پێویسـتیش پاشـایەتی دەسـتووریی پەسەند ئەکرد.

**ڤـۆلتێر** "١٦٩٤ـ١٧٧٨" . جێگەیـەکی تایبـەتی لـەژیانی بیریـی ئـەو سـەردەمەدا هـەبوو... نوسـەرێکی گـەورەو زانـای سـایکۆلۆجی و فەیلەسوفی شارستانیی و مێژوویی سەردەمی خۆی بوو، لە قسەو وتەی مشتومڕا ئەدیبێکی بلیمەتی وابو کەناوی ڕۆژنامەنوسی و ئەدیب و زانای گەیاندە پلەیەك کە کۆمەڵگەی دەرەبەگێتی پـەی پـێ نـەبردبوو، تـامرد تێکۆشەرێکی نەبەزی دژ بە کڵێسـەو ئـەکلیرۆس و دەمـارگیریی ئایـینی بوو...

را سـایکۆلۆجییەکانی فەلسـەفەی مـەتریالیزمی لـۆك کـاری خۆیـان کردبووە سەر ئەم ئیدیۆلۆگە... هەرچەندە لەفەلسـەفەکەیدا لەلایـەنگرە دڵسـۆزەکانی فیزیکـی نیـوتن بـوو... لەمەشـەوە دەسـتی کـرد بـە پەرەپێسەندنی بیری یاسایی گشتی لەسروشتدا. لەتیۆری زانیندا هەوڵی ئـەدا تـا ئـەزموونی هەستیی تێکـەڵ بەهەنـدێ ڕەگـەزی ئـەقڵی بکـات. لەڕەوشتدا دژی واتـەی زگمـاکی پرنسـیپە ڕەوشـتییەکان بـوو.. دیسـان ڕۆڵێکی گرنگی لە فەلسەفەی شارستانێتی و فەلسەفەی مێژوودا بینی.

"**کۆنـدیاك**" ١٧١٥ ـ ١٧٨٠؛ یەکێکـە لـە ئەقڵـە ڕونـاکبیرە هـەرە بـەرزەکانی فەرەنسـا لـەڕووی ڕەسـەنی و ڕێکخسـتنەوە.. ژیـانی ڕوونـاکبیریی بەسـێ پلـەدا تێپـەڕبوو... یەکـەم: لەسـەر زەمینـەی

فەلسەفەی لۆك وەستاوە، بەڵام تەنها وەك تەواوکەری. لەدووەمدا: ڕێبازێکی هەستیی تایبەت و ڕەسەن پەرەپێنەدات... بەڵام لەسێیەمدا: لەشێوەکانی بیرو پەیوەندییان لەگەڵ زەمان و حیسابدا ئەکۆڵێتەوە...
لەپلەی دووەمدا ئەم بەپێچەوانەی لۆك ئەوە ئەسەلمێنێ کە بیر، بنەچەی سەربەخۆی زانین نییە، بەڵکو لەهەستەکانەوە هەڵئەقوڵێ، بۆیە شێوەیەکی لابەلای وەرگیراوە لەشێوەکانی زانین... هەموو چالاکییەکی بیریی تەنها لەڕێگەی ئەزموونەوە وەرئەگیرێ... لەسەرئەنجاما مۆدیاك ڕەگەزی ئەقڵی Rationalism ئەخاتە سەر تێندێنسی ڕەسەنی هەستیی... ئەم ئەقڵییەش، تا بەرەو پلەی سێیەمی ژیانی بیری ئەم ئیدیۆلۆگە بڕۆین، ئاشکراتر ئەبێ. لەم سەردەمەی ژیانیدا شیکردنەوە ئەبێتە بابەتی کۆڵینەوە، لەمەوبەر بەرنامەی کۆڵینەوە بوو. لەدانراوەکانی ئەم پەلەیەدا "لۆجیك" ١٧٨٠" زمانی حیساب" کە دوای مردنی لە ١٧٩٨ بڵاوکرایەوەو ناویان دەرکرد... فەلسەفەی کۆندیاك دەری ئەخات کە ناکۆکی لەناو تیۆری زانینی ڕوناکبیریی فەرنساوی، لەنێوان تێندێنسی ڕەسەنی هەستی، لەگەڵ تێندێنسی لۆجیکی ـ ماتماتیکی شێوەییدا هەیە.

**جان جاك ڕۆسۆ** (١٧١٢ ـ ١٧٧٨) لە جنێڤ هاتۆتە جیهانەوە... لە دانراوە گرنگەکانی: وتارێك لەسەر سەرچاوەی جیاوازی لەنێوان خەڵکدا "١٧٥٥" و "پێکهێنانی کۆمەڵایەتی ـ العقد الاجتماعي ـ "١٧٦٢، وە "ئەمیل، یان لەپەروەردەدا "١٧٦٢ بووبایەخی ڕۆسۆ هەر لەبیرە

تیۆرییە فەلسەفییەکانیدا نەبوو. بەڵکو لەبیرە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕەوشتی و سایکۆلۆجی و پەروەردەییەکانیشدا بووە. بەبیرتیژو قوڵبیرکردنەوەو ڕەخنەگری نەترس لەستێمی کۆمەڵایەتی ناڕەوا ناوی دەرکردبوو...

فەلسەفەی فەرەنسی، بەفەلسەفەی کۆمەڵایەتیشەوە، لەسەدەی هەژدەدا، لەوە دەرنەئەچوو: کە ڕەخنە بێت لە دەرەبەگێتی و مۆنارشی لەدیدی بەرژەوەندی بورژواوەو ناکۆکیەکانی نێوان بەرژەوەندی چینەکان، کە لەناو ڕیزەکانی "چینی سێیەمدا" دەستیان کردبوو بەجیابوونەوەو ئاشکرابوون... سەرنجی لێ نەدرابوو یاخود، جارێ لێی تێنەگەیشتبوون... زۆر لە ڕوناکبیرە فەرەنساوییەکانی سەدەی هەژدە کەوتنە زۆرانبازی لەدژی ئایدۆلۆژی دەرەبەگایەتی ـ کڵێسەی ڕەسمی و دژی ستێمی مۆنارشی و ئایدۆلۆژییە سیاسییەکە ئەوانی گاڵتەشیان بەجەماوەری دیموکرات ئەکرد، ڤۆڵتێر بەچاوێکی سووک سەیری خەڵکی ڕەشو ڕووتی ئەکرد، لەوە ئەترسا کەهۆشی سیاسییان بەرز بێتەوە... بۆیە ڕوناکبیرەکان بەسالۆن و بەئەڵقەی بەستراوە بەنوبەلاو پیاوماقوڵانی کۆشکەوە بیری خۆیان پەخشان ئەکرد... بەڵام هەڵوێستی ڕۆسۆ زۆر جیاواز بوو لەگەڵ هاوسەردەمەکانی خۆی، کەس بەقەدەر ئەم لە ڕوانگەی پیتی بو ڕۆوا زۆر لێکراوەوە لەناکۆکییەکانی کۆمەڵگەی فەرەنسا نەگەیشتبوو، ئەمەش هۆی ئەو ناکۆکیانە بوو کە فەلسەفە کۆمەڵایەتییەکەیدا بوو... بۆ نموونە: ڕەخنەکانی دیموکراتی و

رادیکالانەو لەهەمان کاتدا کۆنەپەرستانەش بووە... داوای بۆ پێشەوە چوونی جەماوەری ئەکرد بۆ لەناوبردنی ئەوستێمە کۆمەڵایەتییانەی مرۆڤ ئەچەوسێننەوە، بەڵام ئەشیبەستەوە بەرابردووەوە... بەو بیرانەی کەئەبێ لەخانەی بیرە کۆنەپەرستە یۆتۆپییەکاندا دابنرێ.

تیۆریەکەشی دەربارەی هەست، خەسڵەت دوانەیی بوو... لەتێندێنسە چەوتەکانی: کە لەدوایدا لایەنگرانی فەلسەفەی کۆنەپەرست کەڵکیان لێ وەرگرت ئەمە بوو: لای وابوو دژایەتی لەنێوان هەست و ئەقڵ گوایە ئەویان بازنەیەکی باڵاو بەرزی ژیانی دەروونییە، ئەمیان نزم و کەم بایەختر. لەگەڵ ئەوانەشدا ئەم بیرانەی ڕۆسۆ بەگشتی دووربوون لە تێندێنسی نالۆجیکی کۆنەپەرستانەی چینی بورژوازیەوە.

ڕۆسۆ لای وابو کەیەکێك لەفاکتۆرە سەرەکییەکانی ئازاری مرۆڤایەتی لەجیاوازی نێوان گوزەرانمان و ئارەزوەکانمانەوەیە... لە جیاوازی نێوان گوزەرانمان و خواستەکانمان و لەجیاوازی نێوان سروشت لەگەڵ دامودەستگا کۆمەڵایەتییەکانەوەیە... لە جیاوازی نێوان مرۆڤ هاونیشتمانییەوەیە. هاوچەرخەکانی ڕۆسۆ ئەیانووت دژایەتی کردنی شارستانێتی لەلایەن ڕۆسۆوە داوایەکی گێلانەیە بۆ دواوە، بۆ سەردەمی پێش شارستانێتی... بۆ حاڵەتی سروشتی ... ڤۆڵتێر گاڵتەی بەهەڵوێستی ڕۆسۆ ئەکرد و ئەیووت: هەڵوێستە داواکردنە لەمرۆڤایەتی کە بەچوارپێ بگەڕێتەوە ناو جەنگەڵی دێرزەمان... بەڵام ڕۆسۆ ئەوەی ئەزانی کە هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ پاشەکشێ لەو پێشکەوتنەی

مرۆڤایەتی... نکوڵی کردن لەشارستانێتی مانای گەڕانەوەیە بۆ حاڵەتی دڕاندایەتی... ڕۆسۆ ئەسڵی ناکۆکیەکانی ناو شارستانێتی بەجیاوازی کۆمەڵایەتی لەقەڵەم ئەدا، کە هۆی ئەوەش جیاوازی مۆڵکایەتی و موڵکداری زەوی ئامرازی کارە... ئینجا ڕۆسۆ ئەنجامە خراپەکانی جیاوازی کۆمەڵایەتی و شێوەکانی دابەشکردنی کار... وردبین و خوێنگەرمانە دەرئەخات، بەڵام لەوە بێ هێزتربوو کە لەو ڕێگەو شوێنانە نزیك ببێتەوەو ئامۆژگاریی بکات و لەناکۆکییەکانی ناو شارستانێتی دەری بهێنێ، ڕۆسۆ لەدژی باوەڕە ڕەسمییەکانی ئایین بوو، بەڵام بەتوندتر هێرشی ئەکردەسەر خوانەناسی.

ڕۆسۆ، لە "پێکهاتنی کۆمەڵایەتی" "العقد الاجتماعی" دا ویستی ئەوە بسەلمێنێ کە جیاوازیی کۆمەڵایەتی بەهۆی جیاوازی لەملکداری و جیاوازی لە ئەرکەکاندا دروست بووەو هەر بەوەش ڕاست ئەکرێتەوە کە بەئازادی و یەکسانیی تەواو لەبەرامبەر یاسا بۆ هەمووان مسۆگەر بکرێ... ئەم بیرەش کەڕەنگدانەوەی سروشتی سۆسیۆلۆژی بورژوازیانەی ڕۆسۆیە... جێگەی ڕێزلێگرتنی سەرکردەکانی شۆڕشەکەی فەرەنسا بوو، بەتایبەتی یەعقوبییەکان.

ڕۆسۆ بەرنامەی پێکهاتنە کۆمەڵایەتییەکەی بەبیری دیموکراسی بورژواو ستێمی کۆماری بورژوازی ئەڕازێنێتەوەو ئەوە دووپات ئەکاتەوە کەژیانی سیاسیی کۆمەڵ ئەبێ لەسەر بناغەی سەرداریی تەواوەتی گەل بێ و هەرگیز بەش بەش ناکرێ. بۆیە ئەم دابەشکردنی دەسەلات

ئەباسادانان و حنبەجێ کردن ڕەت ئەکاتەوەو لەبری ئەوە پێشنیازی ڕای گشت وەرگرتن ئەکات بۆ هەموو کاروبارێکی سیاسی گرنگ.

کاری بیریی ڕۆسۆ زۆر مەزن بوو، هاوبەشییەکی کاریگەری ئامادەکردنی بیریی بۆ شۆڕشی بورژوازی فەڕەنسا کرد. هەرچەندە دوربو لەباوەڕهێنان بەحەتمیەتی ململانێی شۆڕشگێڕانە... بەڵام بەبیری تەدی و بەتیۆرینی خۆی و بەتیۆریەکەی توانی خۆی لەپرۆسەی مێژویی نزیک بکاتەوەو لەڕۆڵی ناکۆکییەکانی، وەکو هێزی بزوێنەری پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی، بگات... بۆیە لەگەڵ "دیدرۆ" دا شایەنی ئەوەبوون کە ئەنگلس نازناوی "پیاوانی دیالیکتیک"ی فەلسەفەی ڕوناکبیریی فەڕەنسەیان لێ بنێ.٣١

**روناکبیریی ئەڵمانی:**

ئەڵمانیای سەدەی هەژدەیەم وڵاتێك بوو بە ڕێکەوت پەرەسەندنی سەرمایەداریدا ئەڕویشت بەڵام لە ئنیگلستان و فەرەنسا هێواشتربوو، جگە لەوەش ئەبوو کۆسپی زۆر گەورەش تەخت بکات...

ڕوناکبیرەکانیشی کەمتر ڕەسەن بوون. پاش وەرگرتنی ئەو بیروڕایانەی لە ئینگلستان و هۆڵەندەو فەرەنسا دارێژابوون... دەستیان کرد بەگونجاندنیان لەگەڵ باروبۆخی وڵاتەکەیاندا... بەڵام ئەم ڕوناکبیرانەی ئەڵمان، وەك فەرەنساوییەکان شۆرشگێڕ نەبوون... خەباتیان لەدژی ئاین و بۆ بەرژەوەندی، ئەقڵ نەئەکرد... زیاتر کۆششیان بۆ هێنانەدی چارەیەکی ناوەنجی بو لەنێوان زانین و ئیمان و لەنێوان زانست و ئاییندا.

لـەرێبازە گرنگـەکانی بـیری ئـەو سـەردەمەی ئەڵـەمانیا قوتابخانـەی "کریسـتیان ڤـۆڵف (١٦٧٩ـ ١٧٥٤)"ـە... هـەوڵی دا فەلسـەفەی ئیدیالیزمی لیبینتـز لـەزانکۆکان و ریـزی ڕۆشـنبیراندا بـڵاو بکاتـەوە... بەڵام "ڤۆڵف" و لایەنگرانی بەدەست پێکردنیـان لـە تێندێنسـی ئـەقڵیی "لیبنتـز"و تەقـەلای دانـانی فەلسـەفەیەکی زانستانەی سـەرجەمی یـان ئینسکلۆپیدیەیەك تەنها بەو مەبەستە بوو کـە لەکۆششـی لیبنتـز کـەم بکەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا گیانی سازش کـە دووچـاری ئـەو فەلسـەفەیە بوبـوو جێگیرکـرا. مەزەبەکشـی دەربـارەی بـوون ـ مۆنـادۆلۆژی ـ Monodology ـ تا ڕادەی شێواندن تەسکیان کردەوە.

لـەناو ڕوناکبیرو پێشـەنگەکانی ئەڵەمانـدا "لیسـنگ" ١٧٢٩ ـ ١٧٨١ وەك نوسـەرێکی بـەناوبانگ و شـانۆگەرو ڕەخنـەگرو فەیەلوسـف نـاوی دەکرد. تێکۆشەرێکی نەبەز بو دژی کۆنە پەرستی و ئایدولوجی کڵێسەو دەمارگیری ئاین بوو، لـە پێنـاوی هونـەرێکی ڕالیسـتی پێشـکەوتوانەی شـانۆدا خـەباتی ئـەکرد... هـەوڵی ئـەدا بکاتـە هونـەرێك لـە کـردارە کلاسیکی و نمونە ڕاوەستاوەکان تێپەڕێ... هونەرێك بـێ کـە بـەئامرازە هونەریـیەکانی دینـامێکی سـەردەمی نـوێ و ململانێـی خـەڵك ڕەنـگ پێبداتەوە... لەدژی لاهوتی ڕەسمی کۆنەپەرست وەستاو... تەنها یـەك یەزدانی ئەسەلماند، ئەویش "گیانی جیهان"بوو.

لەناو ڕونـاکبیرە گـەورەکانی ئەڵەمانـدا شـاعیرو ئیـدیۆلۆگی بلیمـەت "گۆتە" بوو ـ ١٧٤٩ ـ ١٨٣٢ ـ ڕۆڵێکی گرنگی لەپەرەپێدانی ڕوناکبیریی

ئەڵمانیادا بینی... بەگشتی لەفەلسەکەیدا ئیدیالیست بوو... بەڵام دۆڕدۆنگ بوو، مەتریالیزم و دیدە دیالیکتیکیەکەی نەگەیاندە... کۆتاییە لۆجیکییەکەی.

**مەتریالیستە فەرەنساویەکان لەسەدەی هەژدەهەمدا:**

مەتریالیزمی سەدەی هەژدەی فەرەنسا پلەیەکی نوێ بوو لەمێژووی فەلسەفەی مەتریالیزمدا.. چونکە لەزۆر لایەنەوە لەوانەی پێشوو جیاوازبوو... هەرچەندە فەرمانڕەواو نوبەلاکانیان پشت گوێ نەخست، بەڵام زیاتر قەسەو نوسینیان ئاراستەی جەماوەری خوێندەواری چینی بورژوازی جۆربەجۆرەکانی جوڵەی تەن و وردیلە مەتریالییەکان کەسەرچەم سروشتی ئەزەلی و نەمر پێکنەهێنن... بەو جۆرە هەموو دیدە لاهوتی و غەیبی و ئیدیالیستیەکان بەدرۆ ئەخاتەوە... ئەیوت مەتریالی بزێو بنچینەی هەموو پرۆسە سروشتییەکانە... تێگەیشتەی مەتریالیستانەی سروشت، هەموو دیدێك دەربارەی هۆی لەیاسا بەدەر پوچ ئەکاتەوە... بڕوای بەکرداری بێ هۆو لەخۆوە ڕەخساو نەبووە... تا بۆ کردارو هەست و دیدی مرۆڤ و جوڵەی گەردی ناو هەواش هەر هەمان بۆچونی هەبوو، ئەمەش مەتریالیزمی میکانیکی هۆلباخ بوو... چونکە لای وابو کە ئەو کردارو کردەوانە ئەگەڕێتەوە بۆ پێویستی میکانیکی... هەر شتێك لەوانە هۆیەکی دیاری خۆی هەیە...

ئەو ڕایانە لەسەر دەستی دیدرۆ ۱۷۱۳ ـ ۱۷۸٤ دا پەرەی پێدرا، کە بــێ بەریــەرەکانی دیــارترین ڕووی مــەتریالیزمی فەرەنســی بــو. لــە دانراوەکانیــدا بــەجۆرێکی زیندوانــەو شــێوەیەکی ئەدەبییانــەی جــوان و توانایەکی بــەرزی ڕەتکردنــەوەو بەڵگــەی لــەباری ســەلماندنی زیرەکانــە مەتریالیزمی خستەڕوو... جگــە لــەوەی گەلــێ دانــراوی لەســەر هونــەرو جوانیی ڕەخنەی هونەریی دانا... لەدانراوە هونەرییەکانی و ـ لـە ڕۆمـان و شــانۆگەرییەکانیدا ـ هــەوڵی ئــەدا پرنســیپە تیۆرییــەکانی مەزەبــە نوێیەکەی لەسەر جوانیی بەرکار بخا.

دیــــدرۆ هەنــــدێ نیشـــانەی دیالیکتیکانــــەی خســــتە نــــاو ڕا سروشتییەکانییەوە... لەهەندێ مەسەلەدا تــوانیی لــەکۆتی میتــافیزیکی میکــانیکی تەســك خــۆی دەربــاز بکــات... ئــەیووت هــەموو شــتێك لــە گۆڕاندایە... ون ئەبێ نــامینی، تــەنها گشــتی ئــەمێنێ... ئــەم جیهانــەی ئێمە تێیدا ئەژین بەردەوام ئەزێ و ئەمرێ... تاکە جیهانیشەو جگە لــەم هــیچ یــەکێکی تــر نــەبووەو نییــەو نابــێ... ئــەم لایەنــە دیالیکتیکیانــە لەفەلسەفەی دیدرۆ جێگەی نرخاندنێکی بەرزی ئــنگلس بــوو۲۲. دیســان دیدرۆ بایەخێکی تایبەتی دا بە بەلێکدانەوەی مەتریالیستانەی هەست... دیدرۆ لەو زانایانە بوو کە ئەیووت مەتریال توانستی هەستی هەیــە.... و داڕشــتنێکی تیۆریانــەی وردیشــی بــۆ کــردو پــەرەی پێســەند تــا هێڵــە گشتییەکانی تیۆری مەتریالیزمی بۆ فرمانە دەروونییەکان کێشا...

لەسەر بناغەی ئەو تێگەیشتە مەتریالیستانەی سروشت..
مەتریالیستەکانی فەرەنسە تیۆرییەکەیان دائەڕێژن... ئەزموون سەرنج
دوو ڕێگەی زانینن لای "دیدرۆ"و هەموو مەتریالیستەکانی تری
فەرەنسا... هەوڵیان ئەدا ئەوە بسەلمێنن کەتوانستی زانینی ئەقڵ،
بەهۆی پشت بەستن بەوەی هەستە دەرەکییەکان ئەیدەن و
بەتاقیکردنەوەو سەرنج... کەم نابێتەوە، بەڵکو زانینیی بەدەست
هاوردە بەو ڕێگەیە ئەگەر نەمامگەیەنێتەوە سنووری یەقینی تەواو، وا
بەلایەنی کەمەوە ئەمانگەیەنێتە ڕادەیەکی بەرز لەیەقین
مەتریالیستەکانی فەرەنسا هەروەك هەموو فەیلەسوفەکانی پێش
مارکسیزم، لەتێگەیشتنیاندا بۆ کۆمەڵ ئیدیالیست بوون... لەگەڵ
ئەوەشدا لەدژی لێکدانەوەی ئیدیالیستانەی ـ لاهوتی مێژوی مرۆڤایەتی
بوون. بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئەقڵی مرۆڤ پێشکەوتنی زانست و
ڕۆشنبیریی هێزی جوڵێنەری مێژوی مرۆڤایەتین. لایان وابو کەئەبێ
مەزەبی ڕەوشتیی لەسەر تاقیکردنەوە دابمەزرێ، چونکە ئەوەی مرۆڤ
ئەبزوێنێ، هەروەك هەموو خاوەن هەستی تر، مەیلە بۆ لەزەت و
خۆدەربازکردنە لە ئازار... بۆیە ئەتوانێ دەرك بەبنچینەو
تێگەیشتنەکانی کردار بکا کە ئەمەش بناغەی ژیانی ڕەوشتییە...
سەبارەت بەوەی مرۆڤ ناتوانێ بەتەنها بژی، بۆیە کۆمەڵ پێك ئەهێنن
کە بەپەیوەندی و ئەرك و فرمانی نوێ ڕێك ئەخرێ. کاتێ مرۆڤ هەست
بەپێویستی یارمەتی خەڵك ئەکات، ناچار ئەبێ ئەمیش هەمان

کاربکات... بەو جۆرە بەرژەوەندیی گشتی دروست ئەبێ... ئیتر لەم ڕوانگەیەوە ئەرکی ڕەوشت و سستێمی کۆمەڵایەتی و پێکهاتنی کۆمەڵایەتی و سستێمی سیاسی فەرمانڕەوایەتی و سەربەخۆیی ڕەوشت لەئایین و... هتد سەرنجی لێ ئەدرا شی ئەکرانەوەو ئەخرانە بازنەی تیۆرییەوە.. لایان وابوو کە خۆپەرستی و دەسکەوتی تایبەتی، هێزی ڕاستەقینەی ئاراستەکەری کردەوەی مرۆڤە... بۆیە پێوانەی ڕەوشتی ئەقڵی هەر ئەو قازانجەیە کە دەستی ئەکەوێ... دیسان هەر ئەم پێوانەیەش بۆ هەموو کۆمەڵ و گەل وەرئەگیرێ.

**دانانی ئینسکلۆپیدیا:**

ڕوناکبیرەکانی فەرەنسا پێشنیازێکیان بۆ دیدۆر کرد کە نەخشەی دانانی ئەنسکلۆپیدیایەك دابڕێژێ و لەچەشنی ئەنسکلۆپیدیای ئینگلیزی بێ... کە "تشیبرز" داینا. ئەمیش پرۆژەیەکی زۆر گەورەی دانا بۆ ئەوەی ببێتە ئامرازێکی بەکار بۆ پەخشان کردنی بیری مەتریالیزمی فەلسەفی و ڕوناکبیریی... بەو جۆرەی کە هەموو بەرهەم و ئەنجامە باشەکانی لایەنەکانی ئەدەب و هونەرو زانست و فەلسەفەو تەکنیك و پیشەسازی و بەرهەمی پیشەسازی و پیشەگەری تیا بێ و لەدژی ڕاو ڕۆتین و درۆو دەلەسەو واهیمەو ئەفسانە بڵاوبووەکان بێ. هەرچەندە خۆی سەرپەرشتیکەری ڕاستەقینەی بوو، بەڵام "دالامپێر"ی دانا بۆ سەرپەرشتی بەشی زانستەکانی ماتماتیك و فیزك... جگە لە

هاوبەشیکردنی فۆلتێرو رۆسۆ... لەگەڵ ئەوەشا کە لەدواییدا ئەمان هەموویان پاشەکشەیان کرد... دیدرۆ کۆڵی نەداو سەرەڕای دەیان گیروگرفت و کۆسپ کارەکەی بەئەنجام گەیاند.*

مەتریالیزمی فەرەنسی تروپکی بیری فەلسەفی مەتریالیزمی سەدەی هەژدەیەم بوو کە جێگەیەکی بەرزی لای مارکسی - لینینییە کلاسیکییەکان هەبووە.

مارکس کورتەیەك لەمێژووی مەترالیزمی فەرەنسا ئەخاتە ڕوو، لەسەرچاوە بیرییەکانی وا ئەکات:

١- بیری مەتریالیزم لای لۆك و لایەنگرانی.

٢- بیری دیکارت لە فیزیك و زانستەکانی سروشت بەگشتی... هەروەها ئەڵێ مەتریالیستەکانی فەرەنسا هەر لە دژی دامودەستگا سیاسییەکان نەبوون و بەس، بەڵکو لەدژی ئایین و لاهوتیش بوون خەباتیان لەدژی مەزەبە میتافیزیکییەکانی سەدەی حەڤدەهەم کردووە.

دیسان لینین باسی ڕۆڵی گرنگی مەتریالیزمی فەرەنسیی ئەکات و دەری ئەخات چۆن کاری کردۆتە سەر مێژووی ڕوناکبیریی ئەورووپاو مێژووی بیری ئازادی دژ بەلاهوت٢٢...

---

*ئەم ئینسکلۆپیدیە لەحەڤدە بەرگ پێك هاتبوو یەکەم ژمارەی لەساڵی ١٧٥١دا بڵاوکرایەوەو تا ساڵی ١٧٧٢ هەموو بەرگەکانی چاپکراو بڵاوکرایەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا نەبوونی ئیدێکی مێژوویيان بۆ دیاردەکانی ژیـانی گیـانی، لەپشـتی سروشـتێتی ئـەو ڕووناکبیرییـەوە بـوو... مەتریالیستە فەرەنساوییەکان هەرچەندە بەتواناو بلیمەتانە واهیمەو ئەفسانە ئاینییەکانیان ڕیسوا ئەکرد... بەڵام نەیانتوانی ڕەگەکانیان لەبنچـینەی مـەتریالیی پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییەکانـدا دەربخـەن و بەبیریانـدا نەئـەهات کـە سـەرکەوتنی دوایـی لـەو جەنگـەدا تـەنها بەرەگۆڕیشە هەڵکێشانی ئەو پەیوەندییانەو ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکان ئەبێ.

بایەخی مێژوویی مەزنی مەتریالیزمی فەرەنسی لەسەدەی هەژدەیەمدا لەو خەباتەدا بوو کە لەدژی ئاین و ئیدیالیزم دەکراو لەبەرگریکردن و سەلماندن و پەرەپێدانی ئایندەی تێگەیشتنی مەتریالیستانەدا بوو بۆ جیهـان کـە لـەدانراوەکانی نوێنـەرانی ئـەم ئـەبیارە فەلسـەفییەدا شێوەیەکی مێژوویی نوێی وەرگرت کە ڕوخساری زیاتر ئاشکرا بوو.

# بەشی پێنجەم

- پەرەسەندنی بیری فەلسەفە لە ڕوسیای سەردەمی دەسەڵاتی دەرەبەگێتی.

- بەندەگێتی و سەرەتایی پێکهاتنی پەیوەندییە بورژوازییەکاندا.

- بیری فەلسەفی لە ڕوسیا. کۆتایی سەدەی ١٧و نیوەی یەکەمی سەدەی ١٨.

- ڕا فەلسەفی و سۆسیۆلۆجییەکانی ڕووناکبیرانی نیوەی دووەمی سەدەی ١٨.

- ڕوناکبیرو نا مەتریالیستەکان لە کۆتایی سەدەی١٨و سەرەتتا سەدەی ١٩دا.

- ڕا فەلسەفی و سۆسیۆلۆژییەکان.

## ـ بیری فەلسەفی لە ڕوسیا ـ کۆتایی سەدەی ١٧و نیوەی یەکەمی سەدەی ١٨:

هەر لە سەدەی حەڤدەیەمەوە لە ناو هەناوی سستێمی دەرەبەگایەتی ـ بەندەگێتی ڕوسیادا،وردە وردە پەیوەندییە نوێیە ئابورییەکان دروست ئەبوون،لە هەمان کاتیشدا ناوچە و میرنیشینەکان لەناو یەك قەوارەدا ئەتوانەوەو بازاڕە بچوکە ناوچەییەکانیش ئەچونە ناو یەك بازاری گشتی و سەرتا سەری بۆ هەموو ڕوسیا.لەگەڵ پرۆسەی گۆڕانە ئابورییە پلە بەپلەکانی شێوەی بەرهەمی دەرەبەگایەتی ـ بەندەگێتی ـ یشدا،دەوڵەتی فرەنەتەوەی ڕوسیا دامەزرا و مۆنارشی چەسپی." دروستبونی ئەم پەیوەندییە نەتەوایەتییانەش، مانای پێکهاتنی پەیوەندییە بورژوازییەکان بوو"(٣٤) هەروەك لینین باسی کردووە.چەسپینی مۆنارشی و جێگیربوونی دەسەلاتی دەرەبەگ و بازرگانەکان بونە هۆی زیاتر زۆرداری و ڕەتانەوەی جەماوەری گەڵ وتوندو تیژ بوونی ململانێی چینایەتی.ئەو ململانێیە مۆرکی دژایەتی بەندەگێتی پێوە بوو،هەروەك ڕاپەرینی جوتیاران لەپۆڤۆلگی (١٧٠٧ـ١٧٠٨)و لە ئوستراخان (١٧٠٥ـ١٧٠٦)و لە بشکیریا (١٧٠٥ـ١٧١١) ڕووە توندو تیژەکانی دەرخست.

پەرەسەندنی پەیوەندیەکانی شمەکی نەختێنەیی پەیوەستەکانی و بازاری ڕوسیا،ریفۆرم و فراوانکردنی پەیوەندییە ئابوری و ڕوشنبیرییەکان لەگەڵ ئەورووپای خورئاواو ولآتانی ئاسیای کردە پێویست.. ریفورمەکانی (پەترۆسی یەکەم) وەرامدانەوەیەکی ئەو پێویستییە مێژوییە بوو...کە هەر چەندە بە گشتیی سروشت پێشکەوتوانە بوون،بەلآم مەبەست لێیان چەسپاندنی دەوڵەتی نەتەوەیی دەرەبەگ و بازرگانی ڕوسەکان بوو...

ئیڤان بۆسۆشکۆڤ (١٦٥٢ـ١٧٢٦) یەکێك بوو لە نوێنەرانی بەشە هەرە پێشکەوتوەکەی ولآت کە پێشخواستی بازرگانەکانی دەرئەخست و داوای پەرەپێدانی مانیفاکتورەو پێشەسازی دەستکردو بازرگانی و ڕێگەو بانی دەریایی ئەکرد. لە دانراوەکەیدا"چروکیی دەوڵەمەندی"داوای ئەکرد باری سەرشانی بەندەکانی زەوی سوك کریَ و یاسا دابنریَ بۆ کەم کردنەوەی باج و زۆرەملێی دەرەبەگەکان لە سەر جوتیاران.بڕوای وابو.بۆ چاو پێخشاندنەوە بە یاسا کۆنەکان و یاسی نویَ دانان،ئەبیَ ئەنجومەن پێك بهێنریَ.

بۆسۆشکۆڤ و چەندین زاناو فەیلەسوفی تری وەك"کانتیمێر" و"تاتیشیف"بڕۆکۆبۆڤیچ" "هەڤالآنی زانست بوون... ئەمانە بەربەرەکانیی دوگماتیزمی سکولانی کلێسەیان ئەکردو بەرگرییان لە پەرەسەندنی سەربەخۆیی زانیاری زانستییە سروشتی و فەلسەفییەکان ئەکرد. واتە سەربەخۆ لە کلێسە بلآو کردنەوەی

خوێندەواری و فێرکردن و ڕیفۆرمی پێشکەوتوانەیان لە ڕوسیادا بە پێویست ئەزانی، بەمەش ڕێگەیان بۆ پەرەسەندنی زانست و فەلسەفە خۆش ئەکرد... دیسان دژی سەرکردایەتی (بایاری) خەباتیان ئەکرد... ئەم هەڤاڵانەی زانست لە بناغەی مەڵبەند ئیدیالیستی بوون بەڵام ڕا فەلسەفییەکانیان دەربارەی هەندێ شت لە چوار چێوەی دیدی ئایینی دەرچووبوو...جارجارەش،بەتایبەتی"کانتیمێر"و"تاتیشیف"ناراستەوخ ۆ دژی فرمانە لاهوتییەکان ئەوەستان.لەسەر ئەوە سوور بوون کە نابێت کڵێسە دەست وەرداتە ناو کاروباری زانستەوە و هەر بەتەنها ئەمیش ۆی هەیە بڕیار لە سەر ڕاستییە هەڵەللاوەکانی"ئەقلی سروشتی"بدات...بەو جۆرە ڕەواجیان دا بە ڕێبازی:"ڕاستیی دوانەیی Two fold truth ،کە بۆ سەردەمی خۆی پێشکەوتوانە بوو،چونکە بەرگری لە سەربەخۆیی زانست لە ئاین ئەکردو یارمەتیشی ئەدا تا لە ڕکێفی دیکتاتۆرییەتی کڵێسە سەرفراز بێ.

بە پێچەوانەی لاهوتییەکانەوە، هەڤاڵانی زانست لەگەڵ تیۆری چەقێتی خۆر بوون و بڕوایان بە بێ سنوری کەوون و بە بیری توانستی هەبوونی ژیان لە سەر ئەستێرەکانی تر بوە...لە دانراوەکانیاندا بڕیارە زانستی و فەلسەفییەکانی ناو دانراوەکانی کۆپەرنیك و دیکارت و بایڵ و نیوتن و بیکۆن و گالیلو و گاسیندی و سپینۆزا...هتد یان بە بەڵگەی ئەزۆك و پوچەڵ دائەنا...بەڵام نکولییان لە بوونی خوا نە ئەکردو بێگومان بوون لە هەبوونی.

"تاتیشیف" لە ئیدیۆلۆگە ڕوسەکانی سەرەتا بوو کە هەولیدا زانست بە پێی بایەخی کۆمەڵایەتی بپۆلێنێ بە:زانستی "پێویست"(زمان و ئابووری و پزیشکی و لۆجیك ویاسا و لاهوت).بە زانستی"بە کەلك".(ڕێزمان، ڕەوانبێژی و حیساب وئەندازەو میکانیك وبیناو فیزیك وکیمیاو توێژین و ڕووەك زانی و زانستی فەلەك وجوگرافیا و مێژوو کرۆنگرافیا وهتد). "کەمال": (شیعرو وێنەکێشی و مۆسیقا و سواریی)، زانستی "بێکەلك": (شیمیا ودەست گرتنەوە...)، "زیان بەخش": (جیومانتیا، ئیرۆمانتیا، هیدرۆمانتیا...) ئەم جۆێ کردنەوەیە،هەرچەندە سنوور تەسك بوو بەڵام نرخێکی دیارو هەست پێکراوی هەبوو بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاریە زانستیەکان وخەبات لە دژی ئەفسانەو زانستە درۆزنانەکان.

**مەتریالیستی لۆمۆنۆسۆڤ ۱۷۱۱ـ۱۷٦٥:**

زانای سروشت و ئیدۆلۆگێکی مەتریالیستی بو، شوێنەواری نەمری لە سەر پەرەسەندنی بیری زانستانەو سروشتی و فەلسەفی مرۆڤ بە جیهێشت.زانکوی مۆسکۆی دامەزراند کە هەر بە ناوی خۆشیەوە ناونرا...هەرچەندە لایەنگری پاشایەتی لا ڕووناك بوو، بەڵام دواکەوتوویی ڕوسیای تزاریی تتاوانبار کرد.بۆ چارەنووسی نیشتیمان بێ ئارام بوو... نەزانین و مشەخۆری و تەوەزەلی پیاوانی لاهوتی تاوانبار کرد...

بناغەی مەتریالیستی لە زانست و فەلسەفەی ڕوسیدا جێگیر کرد.لە دژی غەیبی و ئیدیالیزم بوو.. ئەیووت نابێ لاهوت دەست بخاتە ناو کاروباری زانست و فەلسەفەوە.پشت بەستنی زانست بە ڕاستییەکان و بە تێبینی و بە ئەزموونی دووپات ئەکردەوە نەك نووسنەکانی پەرتوکی پیرۆز.

لۆمۆنۆزسۆڤ لە دیدی مەتریالیستانەوە لە سروشت و یاساکانی گەیشت و ڕا موتریالیستییەکانی لە سەر سروشت دارشت و تیۆری تەنۆلکەیی لە پێکهاتنی مەتریال و تیۆری میکانیکی لە گەرمایی و یاسای پاراستنی مەتریال و جۆلەی دانا...لای ئەم زانایە یاساکانی سروشتیی سەرچاوەیەکی سروشتی هەیە کە هەموو تەنەکانی جیهان و دیسان وردیلە گچکەکان کە ئەو تەنانە دروست ئەکەن لەژێر ڕکێفیاندان.روناکی و ئەلەکتریك و موگناتیزو گەرمی وساردی و"جۆنایەتی سەرەتایی و سانەوی"بە مەتریالی دانا.

لۆمۆنۆسۆڤ هەموو ئەو گۆڕانانەی بە سەر تەنەکاندا دێن ئەیبەستێتەوە بە حاڵەتی وردیلکە فیزیکییەکان خۆیانەوە، یان بەو گەردیلانەوە کە بەسەر خۆیاندا دابەش نابێ،هەروەها ئەیبەستێتەوە بە سروشتی جولانەوەکانیشەوە. ئەم یەکەم کەس بوو کە ٤١ساڵ پێش لافوازیێ پاراستنی مەتریال و جولەی لە سروشتدا بە سەلماندنی تیۆری و ئەزموونیی دامەزراند،چونکە دوای ئەوەی پارچە کانێکی لە قاپێکی داخراودا سوتاند لە سەرەنجامدا دەری خست مەتریالەکە چەند بوو

بەبێ زیادو کەم ماوەتەوە. ئەم یاسایەشی بە سەر جۆلەدا گشتی کرد...هەر لەم یاسایەشەوە مەسەلەی سەرچاوەی جۆلەی خستەڕوو.ئەیووت یەکەم جۆلە بێ سەرەتایەو ئەبیت ئەوە بسەلمێنن کە ئەزەلییە."رافرێن" سیشی بە جۆلەیەکی وەرگیراوو بەستراوە بە تەنێکی جۆلێنەری تر دائەنا.تیۆری میکانیکی لە گەرمیدا سەلماندو ئەیوت:بەلگەی تەواوی گەرمی هەر ئەخول جوڵانەوەی وردیلکەکانی مەتریال خۆیدایە.دیسان تیۆری جۆلەی غازەکان و چەند تیورییەکی تریشی دانا.

هەر چەندە مەتریالیزمی لۆمۆنۆسۆڤ سەرجەم میکانیکی بوو، بەڵام ڕەگەزی دیالیکتیکی تیابوو...لە لێکولینەوەیتۆیژاڵ و چینەکانی زەویدا گەلێ بیری داهێنراو- ی لەسەر چیاو خۆڵ و نەوت و خەڵوزی بەردین وەی درەخت وئەلەکترلو- ی (کهرومانی)دانا،تا گەیشتە ئەو سەرەنجامەی بلێ:ئەم ئەرزەی ئێمە زۆر لەوە کۆنترە کە کلێسە ئەیلێ:

لە تیۆری زانینیشدا لەسەر زەمینەیەکی مەتریالانە وەستابوو...هەموو گۆرانێکی ناو ئەندامەکانی لەشی مرۆڤی بەکاری تەنەکانی دەوروپشتی دائەنا،بەڵام حاشای لە ڕۆلی خەیاڵ نە ئەکرد بۆ تێگەیشتنی واقیع،لەگەڵ ئەوەشدا ئامۆژگاریشی ئەکرد کە نابێت خۆی پێوە ببەستێتەوەو ئەبێ خەیاڵ و واقیع و ئەزموون پێکەوە بگونجێنرێن.

بەو جۆرە فەلسەفەی لۆمۆنۆسۆڤ ـ هەرچەندە میکانیکی بوو. بەلام بیری پەرەسەندنی تیا بوون بەرهەمێکی مەزنی فەلسەفی ڕوس و جیهانی سەدەی هەژدەیەم بوو،کارێکی گەورەی کردە سەر پەرەسەندنی ئایندەی فەلسەفەو زانستە سرۆشتییەکان.

**بیری فەلسەفی سۆسیۆلۆژی ڕوناکبیرانی نیوەی دووەمی سەدەی ١٨:**

را کۆمەلایەتییە ـ سیاسییەکانی ڕوناکبیرانی ڕوس،لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمدا،لە ژێر کارتێکردنی ئەو ڕاپەرینەی جوتیاران کە"بۆگاچۆڤ"سەرکردایەتی کرد دروست بوون،دیسان ڕوناکبیرە پێشکەوتووەکانی خۆرئاوا کارێکی گەورەیان لە سەر ئەو دروست بوونە کرد.ئەم ڕوناکبیرانە ڕەخنەی توندو تیژیان لە زۆر لایەنی ژیانی دەرەبەگایەتی ئەگرت...بەتایبەتی لە زۆرداریی و بێ بەزەیی دەرەبەگان و پۆخلی فەرمانبەرانی دادگای قەیسەرەکان و نەزانی و مشەخۆر پیاوانی لاهوت.بەلام نەگەیشتنە هەلهێنجانی سەرنجامی شۆرشگێرانەی ئەو ڕووداوانە...گەورەترین هیوایان بە ڕوناکبیریی و مرۆڤ پەروەریی نوبەلا و بە"فەیلەسوفی دانیشتووی سەر تەختیی پاشایەتی هەبووە،هەلیان ئەدا چنی فرمانڕەوا دلّ نەرم بکەن تا پرنسیپەکانی ڕوناکبیریی وەرگرن و"یاسای باش"دابنێن و مروڤیان خۆش بوێ...هتد.

"نۆڤیکۆڤ" ۱۷٤٤-۱۸۱۸، "ڤۆنڤیزین"۱۷٤٥-۱۷۹۲"بیسنیتسکی"-
له ۱۷۸۹دا کۆچی دوایی کردووه- له ئیدیۆلۆگه به نناوبانگه‌کانی ئه‌م سه‌رده‌مه بوون، ئه‌مان لایه‌نگریی پاشایه‌تی ده‌ستووریی بوون له ڕووی بابه‌تییه‌وه،ڕووی ئه‌وڕمی بورژوای دژ به به‌نده‌گێتی بوون که له‌ناو جه‌رگه‌ی سستێمی به‌نده‌گێتی‌دا دائه‌مه‌زرا. به‌شێك له فه‌یله‌سوفه‌کانی ئه‌و ڕۆژگاره هه‌ولیان ئه‌دا فه‌لسه‌فه له ده‌ست لاهوت سه‌رفراز بکه‌ن،چونکه به‌زانستێکی سه‌ربه‌خۆیان دائه‌نا ئه‌ویش"زانستی زانسته‌کان"ه. ئه‌م ڕوناکبیرانه،لۆجیك و سایکولۆجی و زانستی ڕه‌وشت و مان - یان به‌به‌شێك له فه‌لسه‌فه دائه‌نا،به‌لام لاهوتی و کابالی و ئه‌ستێره‌وانییان له‌وه به ده‌رکرد..

راکانی به شێکی تر له ڕوناکبیران ده‌رباره‌ی سروشت و یاساکانی و ده‌رباره‌ی مرۆڤ و سروشتی زانیاری مرۆڤ،به بناغه‌ی مه‌تریالیستی بوون به‌لام مه‌تریالیستێیه‌کی گومانیی بوون زۆر جاریش شێوه‌ی داینیزمی وه‌رئه‌گرت.پاشه‌کشێی ترسناکیان ﻗ لاهوت کردو ژماره‌یه‌کیشیان له مه‌تریالیزم دوورکه‌وتنه‌وه و به‌ره‌و لاهوت چون .نه‌مریی گیانیان سه‌لماندو نه‌گه‌یشتنه ڕاده‌ی نکۆلی کردن له یه‌زدان وه‌ك یه‌که‌م خولقێنه‌ر.روناکبیران له کۆسمۆلۆژیدا له‌گه‌ڵ تیوری چه‌قێتی خۆردا بوون و بروایان به بێ کۆتایی که‌ون و بوونی ژماره‌یه‌کی بێ شومار له جیهان بووه...هه‌ندێك له‌و ڕوناکبیرانه هه‌وڵیان دا بیسه‌لمێنن که هه‌موو

شتێك لە جیهاندا بە پێی یاساكانی سروشت بەرێوە ئەچن و لە ئەنجامی هاوپەیوەندی شتەكان لەگەڵ یەكدا پەیدا ئەبن.

"باتورین"ڕەخنەی لە وڕێنەی غەیبی ماسۆنییەكان وخۆ خەریككردنیان بە سیمیاو كابالی و ئەستێرەو دەست گرتنەوە و گەڕان بە دوای ئەكسیری ژیان و هتد...ئەگرت.

لـــــــە مەلبەنـــــــدی مـــــــەزەبی مـــــــەتریالیزمی هەســـتییەوە"بـــاتۆرین"و"كوزیۆلســـكی"و"ئەنتیشـــكۆڤ" كەوتنـــە چارەسەری مەسەلەكانی تیۆری زانین.لەگەڵ "لۆك" لەسـەر ئـەوە پێـك هـاتن كـە هـیچ شـتێك لـە ئـەقڵی مرۆڤـدا نییـە كـە لـەوەو پـێش لـە هەستەكاندا نەبووبێت.

لە بارودۆخی زاڵبوونی ئیدیۆلۆجی ئایینی دەرەبەگیدا،دانراوەكەی ئەنتیشكۆف"ونارێك لە لاهوتی سروشتیی دەربارەی سەرەتاو پەیدابوونی پاراستنی سروشتی"(١٧٦٩)و گەلێ دانراوەی تر نرخێكی زۆریان هەبوو...بیروڕای خوانەناسیی دژ بە ئەكلیرۆسیان خستەڕوو،دەركەوتنی باوەڕی ئایینیان بە ئەنجامی نەزانینی مرۆڤی كۆن و ترسی لە دیاردە ترسناك و نائاشكرا سروشتیەكان دائەنا.لە ڕووی بیری سۆسیۆلۆژییەوە،روناكبیرانی ڕوس مەسەلەی مافی سروشتی و پێكهاتنی كۆمەڵایەتییان خستەڕوو... ژمارەیەكیان لە تیۆری مافی سروشتییەوە... گەیشتنە ئەنجامی دژ بە دەرەبەگایەتی و بەرگرییان لە جوتیارە بەندەكان ئەكرد."دیسنیتسكی"ئەیووت

مرۆڤایەتی بە چوار قۆناغدا تێپەڕبووە:قۆناغی ڕاوشکارو بەرهەمی سروشت کۆکردنەوە ،قۆناغی دووەم شوانکاری و ماڵات بە خێوکردن،سێیەم قۆناغی کشتوکاڵ،چوارەم قۆناغی بازرگانی...دەریشی خست کە مۆلکداریی لە سەرەتاوە نەبووە. دیسان ئەیووت:تاك هاوسەریی و لە ژنو مێردیدا،لە پلەکانی سەرەتایی مێژویی مرۆڤدا نەبووە،بەڵکو هاوسەریی بە کۆمەڵ هەبووە،ئینجا بووە بە چەند هاوسەریی لە ژن یا مێرددا،لە دواییدا شێوەی جوتیی، واتە یەك ژن و مێردیی وەرگرتووە. ئەم گۆڕانەی دوایشی بە فاکتوری فیزیۆلۆگی دانەناوە،بەڵکو بەئەنجامی داخوازی زیاتری ئابوری،بە پێداویستی"سودی ئابوری"داناوە.

"تریتیکۆڤ"یش هۆی هەژاری و دەوڵەمەندیی ناو کۆمەڵی بە بوونی مۆلکداریەتی تایبەتی و کار دابەشکردنی داناوەو داوای ئەکرد کە کارو سامان بە شێوەیەکی ڕێك و پێك بە سەر ئەندامانی کۆمەڵدا دابەش بکرێ.

نوسینی ڕوناکبیران لە دژی بەندەگێتی و ئایدیۆلۆژی غەیبی ئایینی بە ڕوونی دەری ئەخات کە ململانێی ئیدیۆلۆژی لە نێوان ڕێبازی دژ بەبەندەگێتی لە دژی ڕێبازی دەرەبەگێتی ـ بەندەگێتی لە ڕوسیای نیوەی سەدەی هەژدەیەمدا بەرپابوە.

گریگۆری سکۆڤۆرۆدا(١٧٧٢ـ١٧٩٤) لە ڕوناکبیرە دەرکەوتووەکانی سەدەی هەژدەیەم بوو لە ئوکرانیا،هاوسۆزیی خۆی لەگەڵ گەلی

زۆرلێکراودا دەرخستوە...کاری زۆر لا پیرۆز بووەو بێ کاری و تەوەزەلی تاوانبار کردووە، داوای ڕوناکبیریی و هاوکاری نێوان گەلی ئۆکرانیاو گەلی ڕوسیای ئەکرد...بیرە فەلسەفییەکانی دوانەیی Dualismبوون، بەڵام هەندێ جار غەیبیێتیی پێوە دیار بووە..بڕوای بە توانستی بێ سنوری ناسینی کەون هەبووە،سروشتی بابەتیی سروشت و یاساکان و بوونی ژمارەیەکی بێ سنوور لە جیهانی نناو کەونی سەلماندووە...ڕەخنەی لە سکولانیزمی سەدەی ناونجی و هەندێ لایەنی ئاینی ڕەسمی گرتووە...بوونی خوای ئەسەلماند هەروەك دروستکەری جیهان و هەندێ جاریش لەگەڵ سروشتدا جوتی ئەکرد.

ئەلکساندەر ڕادیشیف(١٧٤٩ـ١٨٠٢) لە پێشەنگەکانی بیری شۆڕشگێری ڕوسیا و تێکۆشەرێکی دەرکەوتووی دژ بەبەندەگێتی و زورەملێ و ئیدیۆلۆگێکی مەتریالیستی قوڵ بووە،لە هەشتاکاندا هەڵبەستە شۆڕشگێرانەکەی"ئازادی"بڵاوردەوە... لەسەر دانراوەو نوسینەکانی،بڕیاری خنکاندنی دراوە،لە دواییدا کەم کراو بوو بە دە ساڵ دوورخستنەوە بۆ سیبریا، لەوێ پەیامە فەلسەفەییەکەی"دەربارەی مرۆڤ:مان ونەمانی"نوسی...کە گەڕاشەوە لەلێژنەی پۆلێنی یاساکاندا، گەلێ پرۆژەی لە بەرژەوەندی بەندەکانی زەوی بە گشتیش گەلی زەحمەتکێشدا داناو سەر لە نوێ کەوتەوە

بەردەم هەڕەشەی دوورخستنەوە بۆ سیبریا، لە ساڵی ١٨٠٢دا خۆی کوشت.

لەدانراوەکەیدا"گەشتێك لەپوترسپۆرگەوە بۆ مۆسکۆ"(١٧٩٠) بەتوندی سستێمی بەندەگێتی بەتاوانبار داناوە و بەرگری لەجوتیارە بەندکان کردووە... بڕوای وابو کەدوور بێ یا نزیك گەل لەدژی زۆرداران ڕا ئەپەڕێ و بە زۆری هێز دەسەڵاتی قەیسەر و دەرەبەگەکان ئەڕوخێنێ وهاوسانیی هاونیشتیمانان لە بەرامبەر یاسادا دەهێنێتە دی و یەکسانیش لە مافی مۆلکدارێتی بە ئەنجام دێنێ و مۆلکدارێتی تایبەتی گەورەو دابەشکردنی کۆمەڵ بە پلەی جیاجیاو مشەخۆری فرمانڕەواکان و تەوەزەلییان دوایی پێ دێنێ...بەڵام ڕیفورمیشی لا پەسەند بووەو داوای لە دەرەبەگەکان کردووە کە لە خۆیانەوە دەستبەرداری تەنگپێهەڵچنینی جوتیار ببن و بەندەکان سەرفراز بکەن ...بۆیە تیۆریستە بۆرژواو مێژونوسە کۆنەپەرەستە بورژواکانی ئەم سەردەمەش بەلیبرالیان لەقەلەم داوە...

مەتریالیزمی ڕادیشیف لەسەر بەرهومی زانستە سروشتییەکانی سەدەی هەژدەیەم دیسان لە سەر فرمانەکانی ئەنسکلۆپێدیستە فەرەنساوییەکان و نەریتی ئەو مەتریالیزمەی کە لۆمۆنۆسۆڤ بناغەی داڕشت، دامەزراوە... مەتریالیزمەکەی لە بنچینەدا میکانیك و میتافیزیکییە و تێکەڵ بەرای ئیدیالیستانەیەوە دەربارەی ژیانی کۆمەڵاتی بووە...تا ئەو کاتەش بە شێوەیەکی بنبڕ لەدالیزم ڕزگاری

نەبوبوو.فەلسەفەکەی لەدژی ئیدیۆلۆجیی ئیدیالیزم و ئاینە غەیبییەکەی خاوەن جوتیارە بەندەکان ئاراستە کردووە...رەخنەی لە فرمانی ماسۆنیی غەیبی و رێبازی ئیدیالیستی کۆنەپەرستانەی فەلسەفەو زانستە سروشتییەکان گرتووە...کڵێسەی تاوانبار کردووە چونکە لەگەڵ قەیسەردا لە دژی گەل بوون و پیاوانی لاهوت بەردەوام کۆتو زنجیری تۆێیا بۆ بەستنەوەی ئەقڵی مرۆڤ داهێناوە...

بروای بە مەتریالیستی سروشت بوو...ئەیووت:"بونی شت لە سەر ئەوە نەوەستاوە ئێمە چەندی لێ ئەزانین،بەڵکو هەر خۆی بو خۆی هەیە".

رادیشیف لای وابو کە ئاخاوتن(زمان)لای مرۆڤ بە بیرکردنەوەوە بەستراوە"ئامرازێکی کۆکردنەوەی بیرەکانە لە یەك تەیاردا، بیرکردنەوەو توانستی مرۆڤ بەرین و بالاَ ئەکات.

دەربارەی پەرەسەندنی جیهانی ئاژەلیش ، بە مرۆڤیشەوە، بروای بە تیۆری"دواپێکهاتن"ە Epigenesis - تیۆری"پێکهاتنی پێشین"یشی نکوڵی لێکرد.

رەخنەی لەو رایانە گرت کە لەلایان وابوو گیان نەمرەو ئەیووت ئەم بیری نەمرییە لە کاراسات و کوێرەوەری مرۆڤەوە داهاتووە.

لەرووی بیرە سۆسیۆلۆجییەکانیشیەوە:لای وابو ئەقڵی مرۆڤ و ڕوناکبیری هێزی بزوێنەری پێشکەوتنی کۆمەلایەتین. دیسان بایەخێکی گەورە ئەدات بە ڕۆڵی کار لەو پەرەسەندنەدا،داخی بۆ ئەوە ئەخوارد کە

بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دابەش نەکراوە...لەگرڵ ئەو ڕایەدا نەبوو کەئەیووت هەندێ گەل بەهرەی لە هی تر زیاترە و ئەیووت:"گەشانەوەی توانستی ئەقڵی گەل بەو هەلانەوە بەستراوەتەوە کە بۆی هەڵ ئەکەوێ".دیسان ئەیووت پێویستییە مێژووییەکان پیاوانی ناودار و هەڵکەوتوو دەخوڵقێنن. هێرشی ئەکردە سەر کۆلۆنیالیزمی ئینگلستان و ئەمریکاو وڵاتانی سەرمایەدارو بازرگانی کردنیان بە کۆیلەوە...

هەروەها ڕۆڵێکی دەرکەتووی لە خەباتی ڕزگاریخوازانەی ڕوسیاو پەرەپێدانی بیری کۆمەلایەتی پێشکەوتوی ڕوس وازی کرد...لینین ڕۆڵی نیشتیمانیی ڕادیشیڤ لە دژی زوڵموزۆرداریی قەیسەرو دەرەبەگ و سەرمایەدارە جەللادەکان باش ئەنرخێنێ(٣٥).

**ڕوناکبیر و زانا مەتریالیستەکان لە کۆتایی سەدەی ١٨او سەرەتای سەدەی نۆزدەدا:**

لە ژێر کارتێکردنی بیری ڕادیشیڤدا پۆپۆگایف و کاریسارزۆڤ و مالینزۆفسکی و گەلێ ڕوناکبیری تر لە کۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدەدا،کەوتنە بڵاوکردنەوەی بیری دژ بەبەندەگێتی لە ڕوسیا،پاشایەتی شێوە دەستوریی یا کۆمارییان لا پەسەند بوو،رەواجیان بە تێندێنسی مرۆڤایەتی ئەدا. دانراوەکانیان ڕۆڵێکی گرنگیان لە پەرەپێدانی فەلسەفەی کۆمەلایەتی ڕوسیدا وازی کرد...

لەناو بەرگریکردن لە تیوری مەتریالیستی لە زانینداو لە دیدی زانستیانەی سروشت، ڕەخنەیان لە ڕای ئیدیالیستی خۆیی دەربارەی زەمان و زەمین ودیسان تێندێنسی نازانمی و پێشبینی"کانت"گرت." لۆبکین" بەرامبەر دابەشکردنەوەکەی"کانت"وەستا کە تەنەکانی دەوروپشتمان دابەش ئەکات بەتەنی واوە کە ناسینیان زەحمەت بێت...هەروەك ڕوناکبیرانی سەدەی هەژدەیەم ئەیووت: وەرگرتنی زانین بە سێ پلەدا تێپەڕ ئەبێ.دیسان ئەیووت بابەتی تیۆری فەلسەفە: زانینی فەلسەفییە، ئەمیش زانینی بوون وپەیوەندی و پێك بەستراوەیی شتەکانەوە هی سەرجەم ئەم هۆیانەیە کە دۆخ و سیفەتی دیاری ئەداتێ...

**بیری فەلسەفیو سۆسیۆلۆژی دیسەمبەریەکان:**

چالاکی نوبەلا شۆرشگێرە دیسەمبەرییەکان، پلەیەکی گرنگ لەمێژوی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازانە بیری کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەلسەفی یەکەم چارەکە سەدەی نۆزدیەم لەڕوسیادا پێك ئەهێنی... لینین لەکاتی باسکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانە لەروسیادا ئەم بزوتنەوەیە بەسێ قوناغیگرنگدا تێپەڕ بووە کەلەگەڵ هەرەسی چینە سەرەکیەی کۆمەڵگەی ڕوسدا ڕێك ئەکەوێ و بزوتنەوەکەشی بەسروشتی خۆی مۆرك کرد:

١ـ قۆناغی نوبەلا ١٨٢٥ـ ١٨٦١.

٢ـ قۆناغی بورژوازی ـ دیموکراسی ١٨٦١ـ١٨٩٥.

٣ـ قۆناغی پرۆلیتاریا لەساڵی ١٨٩٥ـەوەتا ئیستاکە.(٣٦)

هەڵوێستی فەلسەفی دێسەمبەرییەکان تەباو هاوڕەگەز نەبووە، زۆربەیان ڕای خوانەناسی، یان ڕزگاریخوازانەو دیدی مەتریالیستانەیان بۆ سروست هەبووە..."ئیڤان یاکۆشکین"نیکولای کرۆکۆڤ"و" ئەلەکسەندەر باریانتسی"وگەلێکی تریا، مەتریالیستانە سروشت ویاساکانی ، یان ئەسڵی زانیاری مرۆڤ و شەقڵی ئەو زانیاریان لێکداوەتەوە... ژمارەیەکشیان بیر ئازادو بەگومان بوون، لەباوەڕە ئاینییەکان و گاڵتەیان بەپیاوانی کڵێسە ئەکرد، بەڵام بەئاشکرا بانگی مەتریالیزم و ئیلحادیان هەڵنەدابوو.

دێسەمبەرییەمان داوایان ئەکرد فەلسەفە زانستێکی سەرەخۆو ڕزگاربوبێ لەفرمانەکانی کڵێسەو لەپێوەندی سکولانیزم. بروایان بەیەکخستنی زانست و ئاین نەبووە.لای"یاکۆشکین" مرۆڤ لەجیهانی ئاژاڵەوە هاتووەهەر تەنها کۆمەڵش مرۆڤ ئەکاتە گەورەی سروشت.

هەندێکیان بڕوایان بەفرمانە ئاینەکان هەبوو."لۆنین" دانی بەنەمریی گیان و سەرپەرشتیی یەزدان بووە..."بۆبریشیڤ ـ پۆشکین" ئەیووت:جیهان بۆیەزدان دروستکراوە، گیانی یەزدانیی، بەهرەی قسەکردن و گیانی ئاقڵ و نەمری بەمرۆڤ بەخشیوە.

لەرووی ڕا سۆسیۆلۆژینەکانیشەوە... هەڵوێستی دێسەمبەرییەکان لەپرۆسەی کۆمەلایەتی ـ مێژویی دا، سروشت ڕۆناکبیریی بوون، چونکە ڕوناکبیرییان بەرەنگدانەوەی گیانی سەردەم و هێزی سەرەکی بەسنور

بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی دائەنا. بایەخێکی زۆریان ئەدا بەبیری سیاسی و ڕۆڵی لە پەرەپێدنی کۆمەڵدا... "ریلییێف" لای وابو کەنەزانین هۆی زۆردارییەو پێچەوانەی سرۆشتی کۆمەڵە، مرۆڤ بەهۆی ڕۆناکبیرییەوە ئەیەوێ "زۆرداریی بگۆڕێ بەئازادی"... دێسەمبەرییەکان لایەنگیریی تیۆری مافی سروشتی و پێکهاتنی کۆمەڵایەتی بوون کە لە بناغەدا ئیدیالیستی بوو.

"بیستیل" ئەیووت:خواستی" ڕازیکردنی پێویستییەکانی کۆمەڵ" پاڵی ناوە بە مرۆڤەوە تا لەکۆمەڵدا بژی... کۆیلەتی لای ئەم ڕوناکبیرە پێچەوانەی سروشتی مرۆڤایەتییەو لەئەنجامی بەزۆری هێزی پێشێلکردنی یاسای سروشتی و پیکهاتنی کۆمەڵایەتی و بەهۆی "باری بەدبەختی و زورداریی هەندێك لەدژی هەندێکی تر، بەتایبەت سەرکردەکان" پەیدا بووە...

دێسەمبەرییەکان دیاریان بۆ ئەوە کرد کەملمڵانێی چینایەتی لەکۆمەڵدا لەسەر بنچینەی مولکدارییو ناهاوسانی لەپلەو پایەو ڕامیاریدا وەستاوە...بەڵام دەرکییان بەو ڕاستییە نەکرد کەململانێی چینایەتی ئەنجامی مولکداریی تایبەتی ئامرازی بەرهەمهێنانە.. ئیتر ئەو خاوەندارێتییە بەهەر شێوەیەك بێ... دیسان لەشۆڕشی گەل ئەترۆقان و ئەویان دووپات ئەکردەوە کە لەڕێگەی بڵاوکردنەوەی خوێندەواری ویاسای باش ئەبێ خو لەبەرەنگاربوونی کۆمەڵایەتی لابدرێو مولکدارێتی تایبەتی ئامرازی بەرهەمهێنانیش بهێڵرێتەوە...

دیسان ڕۆڵی جەماوەری گەڵیان دەرك پیكردو لەبەرچاویان ئەگرت، "کرۆکۆڤ" ئەیووت" لەگەڵ ئەتوانرێ هەمووشتێك بکرێ، وبێ ئەویش هیچ شتێك ناکرێ"و"مێژووی تایبەتە بەگەل" و ئەوەی مێژو ئاراستە ئەکات" ڕای گشتی"یە.ڕاکانیشیان دەربارەی"جوانیی" لەوتارە ئەدیبە ڕەخنەگرییەکان و دانراوە ئەدەبییەکاندا بڵاوکرانەوە کە" ڕیلیێڤ" و "ئاریڤسکی" و هتد... نوسییان... بەهۆی ئەم بیرانەشەوە داهێنەریی شاعیری گەورەی ڕوس"پۆشکین" پەرەیسەند. بەگشتی هەوڵیان دا هونەر لەخزمەتی خەباتی ڕزگاریخوازانەدا بێو سروشتێکی نیشتمانی بەرزو بەتەوژمی شۆڕشگێڕانەی بدەنێ."ریلیێڤ" لای وابوو ئەبێ بناغەی داهینان لەچیرۆك و ئەفسانە کۆنەکانی گەلەوەبێ... شۆێنەواری ئەمان لەسەر شانۆی ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان بەقوڵی لەسەر خەباتی ڕزگاریخوازانەی گەلی ڕوس دیار بوو. لینین نرخاندنێکی بەرزی بۆ: بیری شانازیکردنی دێسەمبەرییەکان بەئازادیو بیری کۆماریی و خەباتیان لەدژی زۆرداریی و زۆرەملێی خاوەن جوتیارە بەرزەکان... کردووە.ئەوەی دەرخست کەهەرچەندە نوبەلا شۆڕشگێڕەکان بیرتەسك بوون و ترسناکانە لەگەل دوور بوون... بەلام ڕاپەڕین و ڕاشۆڕشگێرانەکانیان نەوەیەکی تەواوی ڕاپەڕاندو نەوە دیموکراتە شۆڕشگێڕەکایەن خستە چالاکییەوە.

بەو جۆرە سەردەمی نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم دا... کاتەکانی دروستبوون و پەرەسندنی نەریتی

مەتریالیستانە بوو لەفەلسەفەی ڕوسدا بەهاوپەیوەندی بەگەڵ بەرهەمەکانی زانستی سروشتی و بەپەیوەندی لەگەڵ بەرهەمەکانی زانستی سروشتی و بەپەیوەندی بەگەڵ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەی دژ بەقەیسەری و بەندەگێتیدا...

# بەشی شەشەم

- فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی
- ڕیشەی مێژوی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی
- فەلسەفە پێشکەوتوانەکەی کانت
- فەلسەفەی فیختە
- فەلسەفەی ئیدیالیستی بابەتی شیلنگ

## فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵەمانی

## - ڕیشەی مێژوویی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵەمانی

ئەورووپای نیوەی دووەمی سەدەی هەژدە گۆڕانێکی گرنگی ئابووری و کۆمەڵایەتی هاوسەر بەشێوەی بەرهەمی سەرمایەداری بەخۆوە بینی و پایەگاو دەسەڵاتی ئابووری چینی بورژوای تیا بەهێز بوو. شۆڕشەکانی بۆرژوا لەسەدەی حەفدەو هەژدەدا ڕێگەی لەبەردەم پەرەسەندنی سەرمایەداریدا خۆش سستێمی دەرەبەگی و بەس، بەڵکو لەهەموو ئەورووپای خۆرئاواشدا. شۆڕشی مەزنی بۆرژوای فەرەنسە ۱۷۸۹ - ۱۷۹٤، لە هەموویان زیاتر کاریگەر بوو... چونکە کارتێکردنی گەورەی کردەسەر جوڵانەوەی ڕزگاریخوازانەی وڵاتانی ئەورووپاو بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی دژ بەدەرەبەگایەتی تیا ڕاپەڕان و بووە بارمەتیدەری پەرەسەندنی ئایدۆلۆژی بورژوای نوێ و پێشکەوتوو لەو سەردەمە مێژوویەدا، ئەو ئایدیۆلۆژییەی کەمافی هەر مرۆڤێك لەئازادی و خۆشگوزەرانی و موڵکداریی تایبەتیدا ئاشکرا کرد، لە کاتێکدا کە ئایدیۆلۆژی دەرەبەگێتی حاشای لەو مافە نەکرد. ئایدیۆلۆژی بۆرژوای شۆڕشگێڕلە ڕووی مێژووییەوە مرۆڤی کردە بەرزترین گیانلەبەرو گەورەی سروشت. ئیدیۆلۆژە بۆرژواکان بڵاویان کردەوەد کە مرۆڤ هاتۆتە

ناو سەردەمێکی نوێوە... ئەوەش سەردەمی پێشکەوتنی بەپەلەی کۆمەڵایەتییەو هەڵگری ئەو خۆشگوزەرانییەیە کە لەژێر سایەو سێبەری ئەقڵ و ئازادیدا داوای ئەکەن. بەڵام ئەو بۆرژوایانەی لەدژی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە دەرەبەگایەتییە ڕزیوەکان خەباتیان ئەکردو بانگەوازیان بۆ پەیوەندییە بۆرژوازییەکان هەڵئەداو بەسروشتی و ماقوڵ ئەهاتنە پێش چاویان، تا ئەو کاتە ئەو ناکۆکییە قووڵانەی ستەمی سەرمایەداری ئەبەن بەرێوە نەیانئەبینیبون.

پەرەسەندنی سەرمایەداریی پەیوەندییە ئابوورییە دەرەبەگێتییەکانی داتەپان کە کۆسپی ڕێگەی پێشکەوتن بوون و بەش و چینی کۆمەڵایەتی نوێی هێنایە ڕوو، پێویستی کۆمەڵایەتی و سەڵتێتی نوێی خولقاند. شۆڕشی پیشەسازی لە ئینگلستان، زۆر فراوانبونی بەرهەمی کارو قەبارەو تەوەری بەرهەمی کۆمەڵایەتی و ئەو پێشکەوتنانەی زانستە سروشتییەکان بەدییان هێنا... ئەمانە هەروەك نیشانەکانی سەر ڕێگەی بەرەو ئەو پێشکەوتنە سەرجەمییە ئەکەوتنە پێش چاو.

بەڵام هێشتا دەرەبەگێتی لەرووی ڕامیارییەوە تەواو لەناو نەچووبوو تەنانەت لەو وڵاتانەشدا کەچینی بۆرژوا جڵەوی دەسەڵاتی سیاسی گرتبووە دەست، هێزە کۆمەڵایەتییە دەربەگییەکان ڕۆڵێکی گەورەیان ئەبینی. لە وڵاتانی تریشدا کەزۆربە بوون... دەرەبەگێتی بەوەش ڕازی نەئەبوو کەچینی بۆرژوای تازە ڕەسیو هاوبەشی دەسەڵاتی بکات.

گەڕانەوەی پاشایەتی ئال بۆربۆنی نیمچە دەرەبەگ لە فەرەنسا، کۆنگرەی ڤییەنا کە هەموو هێزە دەرەبەگ و پاشایەتییەکانی یەك خست... گەورەترین بەڵگە بوون بۆ دانەپانی کۆنەپەرستی تا ئەو کاتە، زیاتر لەوەش هەوڵی خۆئامادەکردنی هێرشێکی پێچەوانەی ئەدا.

بەڵام چینی بۆرژواش هەستی ئەکرد وا مەترسی هەڕەشە لەجێگەو پایەی ئەکات، نەك هەر لە ڕاستڕەوەکانەوەو بەس، بەڵکو لە چەپیشەوە... لەجەماوەری ڕەتاوەو چەوساوەو، ئەو جەماوەری کەسەرکەوتنی سەرمایەداری و پێشکەوتنەکانی زیاتر بێ بەش و هەژارو ڕەتاوەی ئەکرد... هەروەك ناکۆکی ڕیزەکانی "تاقمی سێیەم" تەنانەت لەکاتی شۆڕشە بۆرژواکانی سەرەتادا... ئەو ناکۆکییانە پەرەیان سەند، ئیتر لەگەڵ سەرکەوتنی چینی بۆرژواو دەسەڵات وەرگرتندا. زوو بوون بەململانێی چینایەتی ئاشکرا. لەو بارودۆخەدا ئایدیۆلۆژی چینی بورژوا کە هەرگیز تا سەر شۆڕشگێڕ نەبووە. زیاتر مەیلی سازشی لەگەڵ هێزە کۆنەکاندا ئەکرد. دیسان هێزی دەرەبەگەکان لای خۆیانەوە دەستیان کرد بەخۆگونجاندن لەگەڵ بارودۆخی نوێداو ئەبوونە بورژوا. ئاشکرایی ئەو ناکۆکیانەو مەیلی سازشکاری، بەتایبەتی لە ئەڵمانیادا لەکاتێکدا خۆیان نواند، کە پەرەسەندنی سەرمایەداری ڕووبەڕووی ژمارەیەکی زۆر لە کۆسپ و تەگەرەی سیاسی و ئابووری بوو... بۆیە لە کاتێکدا ئینگلستان بەهۆی شۆڕشی بورژواو کونەتای پیشەسازی بوو بەگەورەترین دەوڵەتی سەرمایەداری لە جیهاندا، فەرەنسە ستێمی

دەرەبەگایەتی داتەپاندو کەوتە سەر ڕێڕەوی پەرەسەندنی سەرمایەداری. ئەڵەمانیاش بەدابەشکراوی، لەرووی ئابووری و سیاسییەو، بەچەندین دەوڵەتۆکەی بچکۆلەو نیمچە

دەرەبەگییەوە مایەوە، موڵکدارێتی دەرەبەگێتی زەوی و پاشماوە جۆربەجۆرەکانی یاسا دەرەبەگایەتی و سستێمی داخراوی دەستەگەری و بوونی ژمارەیەکی زۆر لەدەوڵەتە سەربەخۆو ستێمە کۆنەپەرست و مونارشییەکان... ئەمانە نەك هەر کۆسپ و تەگەرەی ڕێگەی پەرەسەندنی سەرمایەداریی وڵات بوون و بەس، بەڵکو زیاتر هۆی دواکەوتنی ئابووریش بوون، بەبەراوورد لەگەڵ وڵاتانی تری ئەورووپادا دوای ئەوەی ئەنگلس دیمەنی ئەو ماوەیەی ژیانی ئەڵەمانیا ئەنەخشێنێ دێتە سەر ناونانی ئەو سەدەیە بەسەدەی شوورەیی سیاسی و کۆمەڵایەتی... لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژە بۆ ئەوەش ئەکات کە لەهەمان کاتدا سەدەیەکی مەزنی مێژووی ئەدەب و فەلسەفەی ئەڵەمانی بوو، "هەموو نووسەرێکی دەرکەوتووی ئەو سەدەیە مێشك پڕبوو لەگیانی بێزاری و یاخیبوون لەدژی هەموو ئەو شتانەی ناو کۆمەڵگەی ئەو کاتەی ئەڵەمانیا.. "(٣٧). ئەوەش هەر بەتەنها بەدانراوەکانی شیللەرو فیختەوە نەبەسترابوونەوە، بەڵکوو کردارەکانی نوێنەری گەورەکانی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانیاشی ئەگرتەوە کە: کانت و فیختەو هیگڵ بوون. دیسان ئەنگلس ئەوەشی دەرخست کەشۆڕشی بیری ئەڵەمانیا: هەروەك هی فەرەنسە، دوای شۆڕشێکی دووروودرێژی فەلسەفە ڕووی دا

کەبووە بنچینەی بیریی شۆڕشەکە. بەڵام فەیلەسوفە ئەڵەمانیەکان کە لەگەورەپیاوانی شۆڕشی فەلسەفیی ئەڵەمان بوون، بە پێچەوانەوەی ڕووناکبیرانی فەرەنسە ـ هۆلباخ و دیدرۆ... هتد ئیدیالیست بوون. هۆی ئەوەش دواکەوتویی ئابووری و لاوازی بورژوای ئەڵەمانیا بوو کە لەباریدا نەبوو گۆڕانە شۆڕشگێڕییەکان لەدژی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییە باوەکان ئەنجام بدات، ئینجا ئامادەی سازشکاری ئاشت بوونەوەش بوو. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، ڕێبازی ئەو فەیلەسوفە ئایدیالیستانە هەندێ تەقەلای وای تیا بوو کەبیسەلمێنن چۆن پێویستە ئەڵەمانیا بەرێگەی سەرمایەداریدا بڕوات. بۆ ئەوەی بواری گۆڕینی ژیانی کۆمەڵایەتی لەسەر بناغەی ئەقڵ و ئازادیی ـ جەوهەری ژیان و ئامانجی ـ هەڵبخرێ.

مارکس فەلسەفەکەی کانت بەپەیامهێنەری فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵەمانی و تیۆری ئەڵەمانی بۆ شۆڕشی بورژوای فەرەنسی داناوە. هەمان پێناسیش، تا ڕادەیەکی زۆر، بەسەر فەلسەفەی فیختەو هیگڵ دا جووت دەبێت(٣٨).

یەکێك لەبەرهەمە مەزنەکانی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵەمانی چارەسەکردنی ڕێگەی دیالیکتیکی و لۆجیکی دیالیکتیکی و فۆرمەلەی ئەو یاسایانە بوو کە جڵەوی پرۆسەی پەرەسەندنیان بەدەست بوو، هەرچەندە لەمەڵبەندنی ئایدیالیستانەی هەڵەوە بوو... سروشتیشە کە

بپرسین چۆن ئایدیۆلۆژە بورژوا لاوازەکەی ئەڵەمانیا توانی ئەو هاوبەشییە گرنگە لەپەرەپێدانی دیالەکتیکدا بکات؟.

مێژووی فەلسەفە ئەوەیان دەرخستووە کە دەرکەوتنی بیروڕا فەلسەفییە پێشکەوتووەکان لەوڵاتانی، بەبەراورد، ئابووری دواکەوتە شتێکی دەگمەن نەبووە. ئەگەر ئەو وڵاتانە بەهۆی باروبوخی بابەتیی پەرەسەندنیان، سوود لەتاقی کردنەوەی وڵاتانی پێشکەوتووتر وەربگرن، بۆ نموونە فەرەنسای سەدەی هەژدەیەم لەرووی ئابوورییەوە دواکەوتووبو... بەبەراورد لەگەڵ ئینگلستاندا... لەگەڵ ئەوەشدا شوێنی ژیانی هۆلباخ و دیدرۆو هیلفینیوس بوو... بەفەلسەفەی مەتریالیستەکەیانەوە، کە بەترۆپکی فەلسەفەی مەتریالیستی سەدەی هەژدەیەم دادەنرێ، بەڵام فەلسەفەی فەرەنسە لەو سەدەیەدا پشتی بەفەلسەفەی مەتریالیستی سەدەی حەڤدەیەمی ئینگلستان و مەتریالزمی سپینۆزا بەستبوو. سەرەڕای ئەوەش گرێی باری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە دەربەگیتییەکان... خەملیویی شۆڕشگێڕیتی بورژوای فەرەنسە... بنچینەی ئابووری ـ کۆمەڵایەتی مەتریالیزمی فەرنسە بوون...

لە ئەڵەمانیاش شتێکی هاوێنەی ئەوە ڕووی دا... ئەوەبوو فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵەمانی بەرهەمی بیری فەلسەفەی وڵاتانی پێشکەوتووی ئەورووپای کرد بەپایەگای خۆی.

مەتریالیستە فەرەنسییەکان زەمینەی بیری شۆڕشی ١٧٨٩ ـ ١٧٩٤یان ئامادەکردو ئینجا کاری ڕزگاریخوازانەی لەسەر فەیلەسوفەکانی ئەڵەمان کرد. ئەو گۆڕانە گەورانەی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و شێوەی شۆڕشگێڕانەی داتەپانی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی بەدرێژایی چەندین سەدە زاڵ بوون، لای نوێنەرانی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵەمانی ڕۆڵێکی گەورەیان وازی کرد لەفۆرمەلەی دیدی دیالیکتیکانە بۆ پەرەسەندنی کۆمەڵ. هەندێك لەفەیلەسوفەکان تەقەلایان ئەدا دیدێکی سەرجەمی بۆ مێژووی دیالیکتیك دابنێن، لەوانە (نیکۆلای ئۆف کۆزاو لیپنتن) بوون. لە کۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا زانا گەورەکانی بواری زانستە سروشتییەکان دەرەکیان بەو کرد کە ئیتر لێکدانەوەی میکانیکی و میتافیزیکیی دیاردە سروشتییەکان بەتەنها بەس نییە... ئیتر مەسەلەی بوونی شێوەی نامیکانیکی (شیمیاوی و بایۆلۆژی و... هتد) بۆ جوڵەی مەتریالییان خستەڕوو، وە لەدژی ئەو ڕایە وەستان کە ئەڵێ مەتریالی تایبەتی بێ سەنگ و بسوت (گلوجستین) هەیە، دیسان بەریەرەکانیی هەبوو ئەو گریمانەیان ئەکرد کە ئەیانووت ڕەگەزی مەتریالی سەرەتایی بێ سەنگ هەیەو تیشك و دەنگ و گەرمییان لێ دروست ئەبن.

نرخی مێژوویی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵەمانی ـ لوتکەی فەلسەفەی پێش مارکسیزم ـ بەتایبەتی لەوەدایە کەیەکێك لەسەرچاوە تیۆرییەکانی مەتریالیزمی دیالیکتیکی و مێژوویی پێکدەهێنێ. لەو باردیەوە لینین

ئـەڵێ: "... مـاركس لەسـنووری مـەتریالیزمی سـەدەی هەژدەیەمـدا نەوەسـتا بـەڵكو فەلسـەفەی بـەرەو پێشـەوە پاڵپێوەنـا. مـاركس فەلسەفەی بەبەرهەمی ئەنجامـەكانی فەلسـەفەی كلاسیكی ئەڵـەمانی و بەبەرهەمـەكانی مـەزەبی هیگل، كـە ئـەمیش بـووە هۆی پەیدا بـوونی مەتریالیزمی فیورباخ كەدیالیكتیك هـەرە گرنگەكانی بێ بەربـەرەكانی بوو، دەوڵەمەند كرد"(٣٩).

ئا ئەوەبوو باروئۆخی مێژوویی فەلسەفەی كلاسیكی ئەڵەمانی.

**فەلسەفە پێشكەوتوانەكەی كانت:**

عـەمانوئێل كانـت لەسـاڵی ١٧٢٤دا لەشـاری كویجنسـبۆرگی پروسـی هاتۆتە جیهانەوەو خوێندنی تیا تەواو كردووەو بۆتە مامۆسـتای زانكـۆو ئینجا بەڕێوەبەری. هەر لـەم شارەشـدا هـەموو دانراوەكـانی نووسـیوەو لەساڵی ١٨٠٤دا كۆچی كردووە.

كانــت بەتــەنها فەیلەســوف نــەبووە، بــەڵكو لــە بوارەكــانی ئەنسرۆپۆلۆژی و جوگرافیاو فیزیك و كۆسمۆجۆنیدا زانایەكی سروشتیش بـووە. جگـە لـە فەلسـەفەش وانـەی لەزانستەكان سروشـت ـ ماتماتیـك میكانیـك و فیزیـك و جوگرافیـا و ئەنسـرۆپۆلۆژی و مێـژووی سروشـتی گشتیی ـ دا وتۆتەوە.

كانــت لەپەرەســەندنە فەلســەفییەكەیدا بــەدوو پلــەی جیــاوازدا تێپـەڕیووە: لەپلـەی یەكەمـدا (تـا سـەرەتای حـەفتاكان) هـەوڵی داوە مەسەلە فەلسەفییەكان چارەسەر بكـا كەمەسـەلەی بـوون و فەلسـەفەی

سروشت و ئایین و ڕەوشت و لۆژیك دەگرنەوە، ئەوەش لەو بڕوایەوە بووە کە ئەتوانرێ فەلسەفە وەکو زانستێکی تیۆری تیۆردبوونیی فۆرمۆلە بکرێ بەبێ پەنا بردنە بەر ئەزموونی پراکتیکی. بەڵام لەپلەی دووەم دا (لەسەرەتای حەفتاکانەوە) کانت هەوڵیدا ـ Phenomenons دیاردەی ـ شتەکان لەخودی شتەکان جیا بکاتەوە، هەروەك خۆیان چۆن هەبوون "خودی شتەکان" Nounienens ئەوەی دووپات ئەکردەوە کە ناتوانرێ "خودی شتەکان" مان لەناو ئەزموونەوە بدرێتێ. لەم پلەیەدا کانت هەوڵی ئەدا ئەوە بسەلمێنێ کەشتەکان یان خودی شتەکان لەزانین یاخێن و ناتوانین جگە لە "دیاردەکان" یان ئەو ئامرازەی بەهۆیەوە "خودی شتەکان" کار لەئێمە ئەکەن، هیچ شتێکی تر بناسین. دیسان لە پێکهاتن و پەیدابوون و سنووری هەموو جۆرە ئەرکێکی زانین ئەکۆڵێتەوە... ئەم ماوەیە فەرمان و کارەکانی کانت ڕوخسار نازانمی Agnostiism بوون کە خۆی ناوی نا "ڕەخنەی ئەقڵ".

کانت ئەوەی ئەزانی کە بۆچوونەکانی، توانستی ئەقڵ سنووردار ئەکات، بەڵام لای وابوو کەئەمەش کارێکی پێویستە بۆ پەرەسەندنی زانستەکان، هەموو ئەو قسانەی پووچ ئەکردەوە کە دەیان ووت توانستی "سەلماندنی" لۆژیکی بوونی کە ئەمەش کارێکی پێویستە بۆ پەرەسەندنی زانستەکان ، لۆژیکی بوونی یەزدان و جیهانی غەیبی لە ئارادایە. لەلایەکی تریشەوە کانت وای دائەنا کەبڕوا بەیەزدان هەر

لەتواناداا نییەو بەس، بەڵکو ئەوە هەر کارێکی پێویستە چونکە بێ بوونی بڕوا ناتوانرێ پێویستییەکانی هۆشی ڕەوشتیی لەگەڵ هەبوونی شەڕ لەجیهانەکەماندا بسازێنرێ.

پەرەسەندنی بیری فەلسەفیی کانت ڕەنگدانەوەی ئاشکرای لاوازیی بورژوای ئەڵەمانیای ئەو سەردەمە بوو. بە چاوپۆشین لەو ئەنجامەی کانت لەپلەی دووەمی ژیانی فەلسەفییدا پێی گەیشت کە تێندێنسی ڕووەو لاهووت بوو... وا ئەو ڕێگەیەی کانت گرتبووی و ئەو هۆیانەی پاڵی پێوەنا "ڕەخنە" لە ئەقڵ بگرێ، لەسەر ڕەگی قووڵی گنۆسیۆلۆژی وەستابوو کەزۆر جار ئەکەوتە ناکۆکی ئاشکراو ڕووبەڕوو لەگەڵ تەقەلاکانیدا بۆدۆزینەوەی سەرچاوەی بڕوا لەسەلمێنراوەکان Postulates ئەقڵی پراکتیکدا.

لەسەر ئەو ڕێگەیە کانت هەوڵی ئەدا:

١ـ سەرچاوە جۆربەجۆرەکانی شێوەی زانینی زانستیانەو فەلسەفی بدۆزێتەوە.

٢ـ ئەو بناغەنەی، یەقینیی زانیارییە ماتماتیکی و سروشتیەکانی لەسەر وەستاوە بخاتە ڕوو.

٣ـ کۆڵینەوەی وێنەو واتاکانی بیرکردنەوەی زانستانە بکات.

سەبارەت بەوەی کانت لەپلەی دووەمی پەرەسەندنی فەلسەفییدا ڕەخنەی لە ئەقڵ و ئامرازەکانی تری زانین گرت... بۆیە لەم پلەیەدا فەلسەفەکەی بە "فەلسەفەی ڕەخنەگری" ناو ئەبرێ. بەڵام ماوەکانی

پێش حەفتاکان کە تەنها سەرەتای ئەو ڕێبازە ڕەخنەگرانەیە بوو... کە بەپلەی "پێش ڕەخنەگری" ناونراوە.

**پلەی "پێش ڕەخنەگری" و کارە زانستی و سروشتیەکانی کانت:**

لەپلـەی پـێش ڕەخنـەگری دا کردارەکـانی کانـت لـەبواری زانسـتی سروشتیدا شان بەشانی کردارە فەلسەفییەکانی، جێگەیەکی گرنگیان بۆ خۆیان گرتووە، لەوانـە: مەسـەلەی پەرەسـەندنی لەسروشـتدا خسـتۆتە ڕوو. لێرەدا کانت بە پێچەوانەی "نیوتن" تەقەلا ئەدا کـە پرنسـیپەکانی زانسـتی نـوێی سروشـت بـەکار بهێنـێ نـەك هـەر بـۆ ڕوونکردنـەوەی پێکهاتنی سستێمی ڕۆژ لەو سەردەمەدا، بـەڵکو بـۆ لێکدانـەوەی جـۆری پەیدا بوونیشی بەکاری ئەهێنا.

کانت "گریمانێکی" بلیمەتانەی زانستیی دانـاو ئـەڵێ: سسـتێمی ڕۆژ لە ژمارەیـەکی یـەکجار زۆر تەنۆلکـەی مـەتریالی پەخشـانی نـاو ئاسمـان دروسـت بـووەو لـەو کاتەشـەوە، بەپێی یاسـا فیزیکییـەکان کـە نیـوتن دۆزینیەوە، پەرەی سەندووە. کانت هەر بەتەنها بەکۆڵینەوە لـە تیـۆری گشتی پێکهاتنی ستێمی ڕۆژەوە نەوەستا بەڵکو خۆی تـەرخان کـرد بـۆ کۆڵینەوە لە زۆر مەسەلەی تایبەتی هاوپەیوەنـد بـە مێـژووی ئـەرزەوە، ڕۆڵی "هەڵسان و داچوونی" لە مێژووی زەویدا خسـتەڕوو، سـەلماند کـە ئەم دیاردەیە بۆتە هۆی سیستمی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا.

لـە فیزیکیشـدا نیسـبییەتی "وەسـتاوو جوڵـەی" سـەلماند، بـەوەش بیرەکانی دیکـارت و گـالیلۆی لـەو بـوارەدا پەرەپێـدا. لـە بایۆلۆجیشـدا

بیری پۆلێنی جیهانی ئاژەڵی، بەپێی وەچەو زنجیرەی بنەچە، هێنایە کایەوە.

لە کارە ئەنسرۆ پۆلۆجییەکانیشدا بیری مێژووی سروشتیی ڕەگەزەکانی مرۆڤی خستەڕوو. ئەنگلس دیارە بۆ ئەو لایەنە ئەکات و ڕوونی ئەکاتەوە کە ڕاکانی کانت دەربارەی پەرەسەندن لەسروشتدا سنووردانان بو بۆ تەواو زاڵبوونی شێوەی بیرکردنەوەی میتافیزیکی لای زاناکانی سروشت (٤٠). کانت لەناو ڕاکانیدا لەسەر پێکهاتنی سستێمی ڕۆژ، زۆر داشکانی بۆ ئاین بیری تیۆلۆگی کردووە.

بەڵام کردارەکانی کانت لەپلەی "ڕەخنەگری"دا کەفەلسەفەی بوون، لەژێر کارتێکردنی فەلسەفەی لیبینتز ڤۆڵف دابوون. کانت لەسەرەتای حەفتاکاندا فەلسەفەکەی لەدانراوەکانیدا: "ڕەخنەی ئەقڵی پوخت" ـ ١٧٨١ ـ،" ڕەخنە لەئەقڵی پراکتیکی " ـ ١٧٨٨ ـ" و ڕەخنە لەبەهرەی حوکمڕانی " ـ١٧٨١ ـ دارشت. بەرهەمی یەکەم: ڕاکانی کانت دەربارەی زانین دووەم: ڕێبازی ڕەوشتی. سێیەم: بیرەکانی جوانیی و ڕێبازی تیۆلۆگی تیا بوو... لەو هەموو بەرهەمانەدا کانت لە تیۆریەکەیەوە "خودی شتەکان" Noiumenons و "دیاردەکان" Phenomenons دەست پێ ئەکات و ئەڵێ: جیهانێکی سەربەخۆ لە هۆش (لەهەستەکان و لەبیر)دا هەیە، ئەوەش جیهانی شتەکانەو کانت ناوی نا "خودی شتەکان". پرۆسەی زانین بەوە دەست پێ ئەکات کە "خودی شتەکان" کار ئەکەنە سەر ئەندامانی هەست و هەستیان تیا ئەجوڵێنێ. لەم

بەشــەی بابەتەکــەی، بابــەتی بــوونی "خــودی شــتەکان"، کانــت فەیلەسوفێکی مەتریالیستە، چونکە ئەوانە بەیەکەم بوونی شتەکانی جیهانی مەتریالی دائەنێ نەك هۆشی. بەلام کاتێك ئەچێتە سەر کۆلینەوە لەزانین و سنووری ئەبینین مەتریالیزم بەجێ ئەهێلێ و ڕوو ئەکاتە ئایدیالیزم.

خەسلەتی سەرەکی فەلسەفەی "رەخنەگری" کانت لەو هەولانەیدا بوو کەئەیدا بۆ گونجاندنی مەتریالیزم و ئایدیالیزم و نازانمیی پێکەوە... لەم ڕووەوە لینین ئەلێ: "کاتێك کانت ئەوە ئەسەلمێنێ کە دیدەکانمان ڕەنــگ بەشــتێك لــەدەری خــودی خۆمانــدا ئەداتــەوە... وا وەك فەیلەسوفێکی ماتریالیست بیر ئەکاتەوە، بەلام کە ئەلێ: ناتوانرێ "خــودی شــتەکان" بناســرێن... ترانســێندێنتی Transcendent و غەیبین... وا ئەبێتە ئایدیالیست.

**رازانینیەکانی کانت:**

راکانی کانت دەربارەی زانین پشت دەبەستێ بەتیۆریەکەی لەمەڕ بڕیارەکانی - حوکمەکانی -، چونکە لای وابوو زانین کە هەمیشە لەشێوەی بڕیاردا دەرئەکەوێ کەبوونی پەیوەندی نێوان دوو تێگەیشتە: بڕیار Subject خەبەرەکەی Predicate دووپات ئەکاتەوە. کانت دوو شــێوەی بڕیــار لەیــەك جــوێ ئەکاتــەوە: شــیکاریی Analytical کەخەبەرەکەی هیچ زانیارییەکی نوێ دەربارەی خۆ نادات بەدەستەوە، بەبەراورد لەگەل ئەو زانیارییەی لەخۆوە هەلئەقولێ، وەك بلێیت:

"هەموو تەنەکان درێژ بووەوەن"، لەم بڕیارەدا خەبەر کەتێگەیشتەی "درێژبووەوە"یە هیچ زانانیارییەکی نوێ ناخاتە ڕوو، بەبەراورد لەگەڵ ئەو زانینەی تێگەیشتەی "تەنی" بەبڕیاری تێدایە. چونکە کە لەتێگەیشتەی تەن ئەکۆڵێتەوە ئەبینین "درێژبووەوە"شی تێدایە، وەکو یەکێك لەو نیشانە سەرەکیانەی بەڵگەن بۆ "تەن"، ئەم نیشانەیە لەڕووی لۆژیکەوە ئەتوانرێ لە "خۆ" لەتێگەیشتەی "تەن" ئەنجام بهێنرێ.

بەڵام جۆرەکەی تر لەبڕیارەکان ئەوەیە کە: ناتوانرێ پەیوەندی نێوان خودی بڕیارو خەبەرەکەی لەڕێگەی شیکردنەوەی تێگەیشتەی "خۆ" وە ئەنجام بهێنرێ، کانت ئەمەشیانی ناو ناوە "ئاوێتەیی" Synthetical، لێرەدا خەبەر لە "خۆ"وە ئەنجام ناهێنرێ، بەڵکو لەگەڵیدا جووتە... وتەی "هەندێ تەن قورسە "نمونەیەکی بڕیاری ئاوێتەییە... لێرەدا تێگەیشتەی "تەن" نیشانەی" قورسیی" تێدا نییە، بەڵکو ئەوەی دوایی بەتێگەیشتەی تەنەوە بەستراوەتەوە، کانت ناوی ئەم جۆرە بەستراوەییە ئەنێ: ئاوێتە synhesis. بڕیارە ئاوێتەکایش ئەکرێن بە: بەڵگەیی Aposterioei. سەرەنجامیی Apriori، کە یەکەمیان بەهۆی ئەزموون و شارەزایی پراکتیکییەوە پەیوەندی نێوان "خۆ" و "خەبەرەکە"ی ئەدۆزێتەوە، بەڵام لەدووەمدا ئەوە ناکرێ، چونکە ئەو پەیوەندییە پێش ئەزموونەو سەربەخۆشە Apriori. کە ئەوترێ "هەموو ڕووداوێك هۆیەکی هەیە "ئەوە لەو جۆرە بڕیارانەیە.

کانت بایەخی لەسەر سێ جۆرە لێکۆڵینەوە لەشێوەی زانین چڕکردووە: ماتماتیک، زانستییە سروشتی و تیۆرییەکان "میتافیزیک" (زانینی تێوودربونەوەی هەموو ئەو شتانەی هەن)... بۆیە بڕیارە ئاوێتە پێشینییەکان - ی لەسێ پرسیاری دارێژراو ئەخستە ڕوو، کانت وەرامدانەوەی ئەو سێ پرسیارە ئەبەستێتەوە بەکۆڵینەوە لە سێ توانستی سەرەکی زانینیی:

١ـ هەستیاری Sensiblity.

٢ـ تێگەیشتن Verstad.

٣ـ ئەقل Vernuft.

هەستیاری: توانستی هەست کردنە، تێگەیشتن: توانستی سەرئەنجام هێنانە، ماناکانیش تێگەیشتەی ئەقڵە دەربارەی یەکێتی بێ مەرجی هەموو دیاردە مەرجییەکان. ڕاکانی کانت دەربارەی هەستیاریی و تێگەیشتن، دەروازەی تیۆرییەکەی لە "زانین" دا پێک ئەهێنێ. نەهەستەکان و نە تێگەیشتنەکانیش بەتەنها و لەیەک دابڕاو زانینیان لێ بەئەنجام نایەت، هەستەکان بەبێ تێگەیشتنەکان کوێرن، تێگەیشتنەکانیش بەبێ هەستەکان بۆشن.

کانت تیورییەکی لەڕادەبەدەر ئاڵۆزپێکهاتووی دانا دەربارەی وێنەکانی بەستنەوە (ئاوێتە Synthesis) لەنێوان واتاکان، بەو پێیەی تێگەیشتەی ڕووت و قوتن دەربارەی تێگەیشتن، لەگەڵ وێنەکانی تێوردبوونەوەی هەستی. ڕاکانی کانت دەربارەی "وێنەی نەخشەیی

"Schematism" بۆ واتاکانی ئەچنە ژێر ئالآی واتاکانەوە... ڕۆڵێکی گرنگیان لەوەدا بینی.

کانت لای وایە کەیاسای سەرجەمی و پێویست، بنچینەی هەموو بڕیارە زانستە سروشتییەکانە، بابەتی زانستە سروشتییەکانیش چەندە لەیەك جیاوازبن دیسان زانینی زانستیانەیان وا ئەخوازن کەتێگەیشتە واسەیری شتەکانی سروشت و دیاردەکانی بکات کە کەوتوونەتە ژێر ڕکێفی سێ یاساوە: ١ـ یاسای پاراستنی جەوهەر Substance، ٢ـ یاسای هۆیەتی، ٣ـ یاسای کارتێکردنی بەرابەری جەوهەر. ئینجا کانت لەسەرەنجاما ئەڵێ: هۆش خۆی بابەتی زانست پێك دەهێنێ، ئەوەش نمونەیەکی ئایدیالیستی خۆییە. بەڵام بۆ گوتەی "خودی شتەکان" کە ئەڵێ لەزانین یاخییە، ئەمەش نمونەیەکی "نازانم"ییە.

**توانستی "میتافیزیك"**

**دیالیکتیکی ترانسیندینتالی:**

مەسەلەی بنچینەیی سێیەم لە "ڕەخنەی" کانت مەسەلەی توانستی بڕیارە ئاوێتەییە پێشینەییەکانە لە میتافیزیکدا، واتە لە فەلسەفەی تیۆریدا. جا کاتێ کانت لەبەرەی ئەقڵ Vernuft ئەکۆڵێتەوە لەهەمان کاتدا لەو مەسەلەیەش ئەکۆڵێتەوە. ئەقڵیش لە لۆژیکی ئاساییدا مانای توانستی ئەنجام هەڵهێنجانە. ئەبێتە هۆی پەیدابوونی ئیدیەکان (ماناکان Ideas) بیرەکانیش لەلای کانت، تێگەیشتەن دەربارەی بێ مەرجی، لەبەر ئەوەی کە هەموو ئەو شتانەی لە ئەزموونی پراکتیکەوە

دراوە پێمان هەمیشە مەرجین... بۆیە بابەتی ئیدیەکان (ماناکان) بۆ هەستەکان بە ئەزموون دەرکپێناکرێت ئەقڵیش لای کانت سێ ئیدیە ئەخاتەوە: ١ـ ئیدیەی دەروون: بەو پێیەی کەیەکەی مەرجیی هەموو دیاردە دەروونییەکانە. ٢ـ ئیدیەی جیهان: بەو پێیەی کەیەکەی نامەرجییە بۆ ژمارەیەکی بێ سنوور لە دیاردە مەرجییە بەهۆییەکان (لەهۆو کردارەکان). ٣ـ ئیدیەی یەزدان: بەو پێیەی هۆی مەرجییە بۆ هەموو دیاردە مەرجییەکان.

کانت هەموو ئەو تیۆریانەی بەدرۆ خستەوە کە یەزدان ئەسەلمێنن ئاشکرای کرد کە هەموو ئەو سەلماندنانە هەڵەیەکی لۆژیکی تێدایە: چونکە بوونی یەزدان لەتێگەیشتەی یەزدان خۆیەوە سەرەنجام ئەهێنرێ. ئەوە لە کاتێکدایە کە لەڕووی لۆژیکییەوە ناتوانرێ شتێك لە تێگەیشتنەیەکی ترەوە سەرەنجام بهێنرێ کەلەهەمان کاتدا ئەو شتە خۆی پێشەکی لەو تێگەیشتەیەدا هەبێ. تەنها ئەزموون ئەتوانێ بوونی شتەکان بسەلمێنێ. بەو جۆرە ئەبێ بوونی یەزدان بسەلمێنرێ، چونکە ئەقڵی "پراکتیکیمان"، واتە هۆشی ڕەوشتیمان، ئەوەمان بەسەرا ئەچەسپێنێ، بەبێ بڕوا هێنانیش بەیەزدان ناتوانرێ ستمێکی ڕەوشتیی لەم جیهانەماندا بەدڵنیایی برەخسێنرێ.

دیسان کانت فەرمانەکانی دەربارەی بیری ئەقڵ، لەدژی بڕوای فەیلەسوف و پیاوانی ئاینی ئەڵەمان ناراستەی کردو هەموو زانستە تیۆرییەکانی زانکۆکانی ئەڵەمانیای بەدرۆخستەوە: "زانستی دەروون" و

"زانستی گەردوون" و "زانستی یەزدان" و هەموو ئەو زانستانەش کە لەو سەردەمەدا بە "میتافیزك" ناو ئەبران. هەرچەندە ئەوەشی ئەسەلماند کە میتافیزیك گرنگترین بەشی فەلسەفەیە نەك بەو پێیەی زانستێکی تیۆرییە بەڵکو لەبەر ئەوەی "ڕەخنەیە" لە ئەقڵ، ئەو ڕەخنەیەی کە سنووری ئەقڵی "تیۆری" دیار ئەکات و هەر لەوێشەوە پێویستی گواستنەوە بۆ ئەقڵی "پراکتیکی، واتە زانستی ڕەوشت، ئەهێنێتە کایەوە.

لە لێکۆڵینەوەکانی کانت کە بۆ ڕەخنە لە "ماناکانی" ئەقڵ تەرخان کرابوو، ڕایەکانی دەربارەی دژەکانی Antinomies ئەقڵی پوخت، ڕۆڵێکی گەورەیان لەپەرەسەندنی دوا ئەو سەردەمەی فەلسەفەی کلاسیکی ئەلەمانی بینی. کانت لای وابو کە وەرامی ئەو پرسیارانەی دەربارەی ماهییەتی جیهانن... هەر یەکە دژ بەوەی ترە، ئەو دژانەش ئەو ناکۆکیانەن کە لە ئەقڵدا دەرئەکەون، ئیتر بەپێی ئەوە، ئەقڵ لەسروشتیا ناکۆکە.

کاتێکیش کانت دان ئەنێ بە حەتمیەتی بوونی ناکۆکییە دیالیکتیکیەکان لە ئەقڵدا، بێگومان ئەوە بە یەکێك لە شوێنەوارە گرنگەکانی دائەنرێ ، هەر چەندە لە دواییشدا ئەیووت: ئەو ناکۆکیانەی لە ئەقڵ لە ناکۆکی وەهمی بەولاوە هیچی تر نین.

**ڕا ڕەوشتییەکانی کانت:**

کانت ئەیووت: ناکۆکی نێوان پێویستی و ئازادی، ناکۆکی ڕیالیستی نییە، مرۆڤ لە هەندێك ڕەفتاریا ئازادە، لەهەندێکی تردا ئازاد نییە، چونکە بەبیری و بەهەستی و بەئارەزووی دیاردەیەکە لەناو دیاردەکانی سروشتداو ملکەچی بڕیاری پێویستە زاڵبووەکانی ناو جیهانی دیاردەکانە. لەهەمان کاتدا بوونێکی ڕەوشتییەو هۆشی ڕەوشتی هەیە، بۆیە سەر بەجیهانی "خودی شتەکان"ـە و لەم ڕووەوە ئازادە. هۆشی ڕەوشتیش وا پێویست ئەکات کە گونجاندنێکی ڕەوا لەنێوان ڕەفتارەکانی مرۆڤ لەگەڵ ئەنجامەکانیا بکرێ.

کانت بونی تێگەیشتنەکانی "ئازادی" و "نەمری" و "یەزدان" و بابەتەکانیان بەبڕوا بەجیهانی ماقوڵ لێك ئەداتەوە. بەپێچەوانەی فرمانە لاهوتییەکانی کاسولیك و پرۆتستانت، ئەوەش ئاشکرا ئەکات کەڕەوشت لەسەر ئاین نەوەستاوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئاین لەسەر ڕەوشت وەستاوە.

**جوانیی لای کانت:**

هەڵسەنگاندنی جوانی کردارە هونەرییەکان لای کانت لەسەر تێگەیشتەکان نەوەستاوە بەڵکو لەسەر خۆشییەکی تایبەتییە کە لە وردبوونەوەی شێوەکانی Forms بابەتی جوانی ئەنجام دێت. بەو پێیە بڕیاردانی جوانیی خۆییە. بۆیە ناتوانرێ دروستی یا نادروستی

نرخاندنـەکانمان بسـەلمێندرێ. بڕیـاری جـوانیی لـە مەبەسـتی کـرداره هونەرییەکانەوەیە، بەڵام مەبەستەکەی لە دەرەوە نەسەپێندراوە بەسـە هونەرمەندا بەڵکو ئـەوە "مەبەسـتی بـێ مەبەسـتییە". کانـت شـیعر بـە ترۆپکی هونەر دادەنێ چـونکە تەنانـەت "بـیر جـوانی"یـش و، تەنانـەت توانست لەسەر دەربڕینی بیرە بێ وێنەکان بەرز ئەکاتەوە.

بەڵام بواری دووەمی بـەهرەی بڕیـاری تیۆردبـوونی کانـت " هـەبووە سروشتییەکانە"، بەو پێیەی دیاردەن بـۆ جیهـانی دەرەکـی هەسـتی و بابـەتی زانینـی تێگەیشـتنە Verstand و ئـەبێ بەتـەنها بچـێتە نـاو تێگەیشتەی یاسای میکانیکی لەسروشتدا. بەڵام بەو پێیـەی کـە بابەتـە بـۆ ئـەقڵ وا ئـەبێت بچـێتە نـاو تێگەیشـتەی " مەبەسـتی" یـەوە بـۆ بەدەست هێنانی زانین ئەبێ ئەو دوو ڕێبازە یـەکگرتوو بێـت، بۆیـە ئـەو دوو ڕێگەیە بۆ ڕوانین هـەر بـەدابڕاوی لـە ئـارادا نـین بـەڵکو ئـەبێت بـبن بەیەك بۆ ئەوەی زانین بەدەست بهێـنین. بـەڵام تێگەیشـتنی مـرۆڤ ئـەو یەکێتییە ناگرێ.

### را کۆمەڵایەتی و سیاسی و مێژووییەکانی کانت:

لــە ژێــر کــارتێکردنی ڕوونــاکبیری فەرەنســاو ئینگلســتاندا ڕا کۆمەڵایەتیی و ڕامیاری و مێژووییەکانی کانت دروست بـوون. بەتایبـەتی پەرەی دا بەبیرەکانی ڕۆسۆ دەربارەی دەسەڵاتی گەل. بەڵام سـەبارەت

بەوە کە ئیدیۆلۆگی بورژوای ئەڵەمانی بوو بۆیە دردۆنگ بوو لە ڕووخستنی و ئەیووت: لەڕووی پراکتیکەوە ناتوانرێ دەسەڵاتی گەل دابمەزرێنرێ. بەڵکو ئەبێ ویستی گەل بەتەواوی ملکەچی دەسەڵاتدارێتی بێ. هەر بەوەشەوە نەوەستا کەدژی هەمو جۆرە شۆڕشێکی گەڵ بێت و بەس بەڵکو لەدژی هەموو ئەو چەشنە بیرانەش بوو کە بۆنی دامەزراندنی دەسەڵاتی بەرزی هاولاتیانی لێوە بهاتایە، لەبەر ئەوەی کە لەدیدو بۆچوونی خۆیەوە، ئەوە هەڕەشە لەتێکوپێکدانی دەوڵەت ئەکات.

هەرچەندە هیوای پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری زۆر سنوردار کردبو، لەگەڵ ئەوەشدا لەو بڕوایەدا نەبوو کە ئەو بارودۆخەی ئەو سەردەمە ئەبێ بێ گۆڕان بمێنێتەوە. بۆ نمونە لەدژی گوتەکانی دەرەبەگ ئەڵەمانەکان بوو کە ئەیانووت "گەل جارێ پێگەیشتووی ئازادی نییە".

بنچینەی ڕیالیستی ڕا یاساییەکان و تێندێنسی پێشکەوتوانەی کانت ئەوەدا بوو کە بەسستێمی مافی بورژوازی مەرجدار بەمافی مولکدارێی، بەربەرەکانیی زوڵم و زۆری دەرەبەگێتی ئەکرد.

باشترین و بێ وێنەترین دۆخی کۆمەڵ لای کانت لەبەر کەماڵیی ئاشتی نێوان خەڵك و لەهەمان کاتدا لەنێوان دەوڵەتەکاندایە. بەڵام ئاشتی ئامانجێکی زۆر دوورە. ڕیالیستی مێژوویی، مۆرکی ململانێ و ناکۆکی هەمیشەیی نێوان خەڵکی پێوەیە نەك هی ئاشتی... لەم ڕووەوە

گەیشتە ئەم سەرئەنجامە: ناکۆکی پرۆسەی مێژوویی مەرجی پێویستە بۆ پەرەپێدانی ڕەگەزی مرۆڤ و کامڵ بوونی. جەوهەری ناکۆکییەکانی پرۆسەی مێژوویی لەوەدایە کەخەڵك ئەیانەوێ لە کۆمەڵدا بژین. لەهەمان کاتیشدا هەر یەکە ئەیەوێ بەربەرەکانی ئەوی تر بکات، ئەوەش سەبارەت بەنیەت خراپی ماتدراوی ناو دەرونیانە، ئەو بەربەرەکانێیەش هەڕەشە لەپارچە کردنی کۆمەل ئەکات. بەلام بەبێ ئەو بەربەرەکانێیەش، هەرچەندە موسیبەت و کارەساتی لەدواوەیە، هیچ جۆرە پێشکەوتن و پەرەسەندنێك ڕوونادات.

لینین ئەڵێت: ((فەلسەفەی کانت لە "چەپ"و لە "ڕاست"ەوە ڕەخنەی لێگیرا. لەچەپەوە مەتریالیستەکان ڕەخنەیان لێگرت، نەك لەبەر بڕواکردنی بەبوونی شتەکان بەسەربەخۆ لێمان، یان بەبوونی "خودی شتەکان" (چونکە مەتریالیستەکان هەموو لەو بۆچوونەدا لەگەڵ کانت ڕێك ئەکەوتن). بەڵکو بەهۆی "خۆیەتی" و "نازانم" یەکەیەوە بوو... لەبەر ئەوە بوو کەئەی ئەتوانی زانین لەسەرچاوە بابەتییەکەیەوە ئەنجام بهێنێ)٤٢. بەلام لە "ڕاستەوە" گومانی و ئایدیالیستەکان ڕەخنەیان لێگرت، ئەوانە بەرامبەر نازانمی کانت وەستا، بەڵکو هەر ئەیانویست سەرفرازبن لەناکۆکییەکانی کانت لەگەڵ نازانم... ڕەخنەی چەپەکان لەفەلسەفەکەی کانت پەرەپێدانێکی گەورەی پێدرا، لەسەدەی نۆزدەدا، ئەوەشی لەڕێبازە مەتریالیستەکانی فیورباخ و چێرنیشفیسکی... هتد دا دەر ئەکەوێ. بەلام ڕەخنەی ڕاسترەوەکان

لـەکانتی هـەر لـەژیانی کانـت خۆیـدا بـوو، لەنـەوەدەکانی سـەدەی هەژدەهەمدا فیختە گەورەترین نوێنەری ئەو ڕێبازە بوو.

**فەلسەفەی فیختە**

یۆحـەننا گۆتلیـب فیختـە لەسـاڵی ١٧٦٢دا لـەخێزانێکی جوتیـاریی لەدایك بووە... پێتولێی ئەم فەیلەسوفە هەر لەمنداڵییەوە دەرکەوتووە.

لەبەشی فەلسەفە لەزانکۆی ڕاستە کاری کردووە. لەساڵی ١٧٩٩دا بەتاوانی بڵاوکردنەوەی ئیلحاد دەرکرا. ئینجا لەزانکۆی بەرلین دەستی کردەوە بەکارکردن. لـەم ماوەیـەدا بایـەخی بەمەسـەلەکانی بـورژوا ـ نەتەوەییـەکان داوە، ئەمـەش وای لـێ کـرد کـە ببێتـە یـەکێك لـە ئیدیۆلۆگەکانی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی بـورژوای ئەڵـەمانی. کاتێکیش لەشـکرەکانی نـاپلیۆن ئەڵـەمانیایان داگیرکـرد، فیخـت دەسـتی کـرد بەخوێندنەوەی زنجیرەیەك وتار بـۆ نەتـەوەی ئەڵـەمان... تیایانـا داوای یەکێتی و ڕاپەڕینی لەگەڵ ئەڵەمان ئەکرد. لەنوێ بوونەوەی جـەنگی دژ بەناپلیۆن دا ١٨١٣، فیختە بەخواسـتی خـۆی بـوو بەسـەرباز تالەسـاڵی ١٨١٤دا لەیـەکێك لـە خەسـتەخانە سـەربازییەکاندا تـا زۆری بـۆ هێنـاو کۆچی کرد.

**پەیوەندی نێوان فەلسەفەی تیۆری و پراکیتکی:**

لە ڕێڕەوی خەباتیان بۆ یەکخستنی ئەڵەمانیا، فیختە چالاکییەکانی بەرەخنەگرتن لە پەیوەندییەکانی دەرەگایەتی ئەڵەمانی دەست پێکرد. بۆیـە لـە کـرداره بیرییەکانیـدا بایـەخی بەمەسـەلەکانی فەلسـەفەی

"پراکتیکی" داوه ـ ڕەوشت و ڕێکخستنی دەوڵەت ـ .. سەبارەت بە پێنەگەیشتنی پەیوەندییە سەرمایەداریی لە ئەڵمانیا و بەهۆی دواکەوتوویی بورژوای ئەڵمانی و لاوازی سیاسییەوە... لە تێگەیشتە "کار"دا (پراکتیک Praxis) سروشت ئایدیالیستی بوو، تەنانەت لای بلیمەت گەورەکانی وەکو فیختەش، چونکە فیختە بەکارخستنی پراکتیکی Oraxis بەتەنها نەگێڕایەوە بۆ چالاکی هۆشی ڕەوشت. هەر بەو پێیەش داخوازییە سیاسییەکانیشی دائەڕشت کە تەنها داخوازی ئەقڵی پوختن، هی هۆشی ڕەوشتن.

فیختە بیرە فەلسەفییەکانی بەو پێیە داڕشت کە تیۆری زانستە، یان "زانستی زانستە". ئەرکی فەلسەفەش لەوەدایە کەبەو پێیەی زانستێکی تیورییە، لەزانست بنچینەی هەموو زانینێك بدۆزێتەوە.

بەرهەمە سەرەکییەکەی فیختە "زانستی زانست" ـ ١٧٩٤ ـ دانراوێك نەبوو دەربارەی بوون بێ، بەڵکو دەربارەی زانست بوو. تیورییەکەشی دەربارەی زانین، لەسەر تیوری ئیدیالی ـ خۆیی لەبووندا بیناکرد.

فیختە لای وابوو کە فەلسەفە تەنها دوو باری سەرنجی سەرەکی هەیەو هیچی تر: ماتریالیزم (کەناوی ناوە دۆگماتی)، ئیدیالیزم ـ تێندێنسی پراکتیکی، نەك کۆڵینەوەی تیوری وا لە فەیلەسوف ئەکات کە لایەنگیری یا ئەو ڕێبازە بێ فەیلەسوفی ماتریالیست لەبوونەوە ئەچێ بۆ هۆش، بەڵام فیختە لای وابوو کەزۆر زەحمەتە ئەو ڕێگایە لێك بدرێتەوە کە بەهۆیەوە بوونی ماتریالیستی ئەگۆڕێ بۆ هۆش یان دید.

فیختەوە ئەکرێ ڕوبدات چونکە من ئەتوانم هۆشم ئاراستە چالاکی بیرکردنەوەیی بکەم، لێرەدا بیرکردنەوە لەبەرامبەر هۆشی مندا بوونێکی هەیە. بەو جۆرە فیختە بڕیار ئەدا کە ئیدیالیزم بەدەستپێکردنی بەهۆشەوە یەکەمەو لەپێش ماتریالیزمەوەیە.

فیختە فەلسەفەکەی بەکۆڵینەوە لەواقیعی پێدەری ڕاستەوخۆ - واتە خۆیی هەستپێکەردنی چالاك Intuition. یان "خۆ" ڕاستە کەهەموو ئەوانەی توانستی ئاقڵبوونی هەیە ئەگرێتەوە، دەست پێکرد. چالاکی پەرەسەندنی "خۆ" بەوە لێك ئەداتەوە کە گواستنەوەیەکە لە بابەتەوە، یا بیری یەکەمەوە، بۆ بابەتێکی ناکۆك: لەویشەوە بۆ بابەتی سێیەم، کە یەکێتییە، یان ئاوێتەیە Synthesis بۆ ئەو دوو بابەتە. فیختە لای وابوو کە سەرەڕای "خۆ"ی سەرەتایی ئەبێ "خۆنا- ش - اللاأنا -" بسەلمێنرێ بەمانایەکی تر، بوونی "سروشت" شان بەشانی "هۆش"، "بوونی بابەت" شان بەشانی "خۆ" بسەلمێنرێ. ئینجا فیختە دان بەوەدا ئەنێ کە ئەو"خۆ"یە، ئەو سروشتە، ئەو بابەتە، هەر ئەوە نییە کەببێ و بەس بەڵکو کار ئەکاتە سەر "خۆ"، بەمانەیەك لەماناکان چالاکییەکەی سنوردار ئەکات. دیسان ئەبێ ئەو "خۆ"یە پاڵی لە "خۆنا"ی بەرامبەر وەربگرێ. هەروەها ئەوە دووپات ئەکاتەوە کە چالاکی و کاری ئەو "خۆ"یە یان "هۆش" ڕاستەوخۆ هەستی پێ ئەکەین، بەڵام لەزانینمان یاخییە، بەو جۆرە چالاکیی ناهۆشیاریی بنچینەی چالاکیی تیوری پێکئەهێنی، چالاکیی "خۆ" لای فیختە پێش

هـــەموو شــتێك ڕەفتــاری ڕەوشــتی خۆیــە، چــالاکیی لای مــرۆڤیش بەمەبەستی جێبەجێکردنی یاسای ڕەوشت و ئەنجامدانی ئەرکە. بـەڵام تێندێنسـی سروشـتی لای مـرۆڤ، کەسەرچـاوەکەی سروشـتی فیزیکـی مرۆڤــەو بەهــەموو جیهانــەوە بەستراویشــەتەوە، بەرامبــەر ئــەوە ئەوەستێ... ئائەوەیە "خۆنا" کەناکۆکە لەگەڵ "خۆ"و بۆ کردار پـاڵی پێـوە ئــەنێ. فیختــە لای وابــوو کــە تــەنها مــەرجی پێویسـت بـۆ بــەپێڕەوکردنی یاســای ڕەوشــتی، ســەرکەوتنی بەســەر هەڵچــوونە هەستییەکاندا. دیسـان ئـەیووت ئـەو "خۆنا"یـە بەرهـەمێکی پێویستی چالاکی تایبەتی هۆشە، بەڵام لەکاتی ڕوودانی ئـەم چـالاکییەدا نـاتوانین شـتێك دەربـارەی ئـەم چـالاکییە بـزانین. بۆیـە بیرکردنـەوەی ئاسـایی ناتوانێ هـیچ شـتێك دەربـارەی ئـەو چـالاکییە بزانـێ. ئـیتر ناچـارە کـە ئەنجامەکـەی بەشـتێك دابنـێ کـە هـەروەك خـۆی بـۆ خـۆی هـەبێ ئـاوا ڕەچاوی بکەین، بەشـێوەی سـەربەخۆ لـە هۆشـمان، هـەروەك کاریکاتـە سەر هۆشمان.

بـەڵام فیختـە ئـەیووت بـیری فەلسـەفی ئـەو واهیمەیـە ناهێڵـێ کـە هاوسـەری پێویسـتی بـیری ئاسـاییە، چـونکە وا دائـەنێ کـە نـاوەڕۆکی هەسـتەکانمان لـە دەرەوە نەمانـدرێتێ، ئـەو "پێدانـەش" لای فیختـە دیسـان دیـدیکی پێویسـتە ـ لەواقیعـدا ـ کـە چـالاکی داهێنەرانـەی "خۆ"وەیە. بۆیـە یەکـەمێتی هـەر بـۆ ئـەو چـالاکییەیە کـە ئـەبێ وەکـو سەلمێندراوێکی بنچینەیی بۆ "زانستی زانست" وەربگیرێ. فیختـە بـەم

چالاكییه ئەڵێ "دەرەجەی كردار" ـ Tat Handlung دوایی، ئەم فەیلەسوفە دێتە سەر سەلماندنێكی ترو ئەڵێ:

ئەوە توانستی تیوری نییە كەوا لەتوانستی پراكتیكی ئەكات توانستمەند بێ، بەڵكو تەواو بەپێچەوانەوە توانستی پراكتیكییە ئەبێتە هۆی بوونی توانستیی تیوری.

لەچوار چێوەی ئەو ئیدیالیزمە خوێیەدا دەرك بە تێگەیشتنێكی دیالیكتیكی ئەكەین بۆ پرۆسەی چالاكی، چونكە ئەبینێ كە "خۆ"ی چالاك هەمیشە لەژێر پاڵەپەستۆی دژ یا پێچەوانەیەكدا ئەكەوێتە جولە یا كردار. ڕووخستن و دارشتنی تێگەیشتەو پرنسیپە بنچینەییەكانی فەلسەفەی تیوری لای فیختە بەكولینەوەوە هەڵهێنجانی واتا لۆجیكییەكانەوە بەستراوە. لە فۆرمەلەكردن پەرەسەندنی واتاكانیشدا دەرینەخات كە "خۆ" یەكبینە لەپلەی خوارووەی چالاكییەوە ئەچێتە سەروتری... تا ئەگاتە سەر ئەوەی كە ڕێگەی "زانستی زانست" لەدیدی فیختەدا لەگەڵ ڕێڕەوی سروشتی زەینی مرۆڤدا بگونجێ. "زانستی زانست"یش لای ئەم تەنها مێژوویەكی جۆرتایبەتییە بۆ بزوتنەوەی گیانیی مرۆڤایەتی.

**ڕێبازی ڕەوشتی و ڕای فیختە لەسەر ئازادی:**

تێگەیشتەی ئازادی لەفەلسەفەی "پراكتیكی" لەمەزەبە ڕەوشتیەكەی فیختەداو فەرمانەكانی لەسەر ماف و دەوڵەت و پەروەردە... ڕۆڵێكی جەرگە وازی ئەكەن. لەژێر كارتێكردنی

ڕاستەوخۆی ڕووداوەکانی شۆڕشی بورژوای فەرەنسە - ١٧٨٩ - ١٧٩٤ـ و داتەپاندنی ستێمی دەرەبەگی ئەڵمانی و تێشکانی سەربازی و سیاسی و ئینجا تێشکانی جوڵانەوەی نیشتمانی بورژوای ئەڵمانیا... ئەو تێگەیشتەیە پێکهات. فیختە لای وابوو کە مەسەلەی بنچینەیی لەرەوشتدا مەسەلەی ناکۆکی نێوان پێویست و ئازادییە. ئەڵێ ئازادی مرۆڤ لەسەر بەتاڵکردنەوەی کاری مێژوویی و سروشتی ناوەستێ. بەڵکو لەسەر ملکەچی ئارەزوومەندانەی سەڵت بۆ یاساو ئامانجە پەرەسەندووەکانی ڕەگەزی مرۆڤایەتییە، ملکەچییەك کەلەسەر خودی هۆشی پێویستی بێ... لەدوایشدا ئەڵێ پلەی جیاجیای ئازادی کە لەگەڵ سەردەمە مێژووییەکاندا ئەگونجێ، لەئارادا هەیە. چونکە مەسەلەی ئازادیی لەڕووی مێژووییەوە خستەڕوو.

**ڕاکانی فیختە دەربارەی ماف:**

فیختە ئەیووت: پێویستە زانستی ماف کە پەیوەندی نێوان خەڵك ڕێکئەخات لەگەڵ زانستی ڕەوشت کە بابەتەکەی - ئازادی لە جیهانی ناوەوەی مرۆڤدایە - بەتەواوی لەیەك جودا بکرێتەوە. ماف لای ئەم لەسەر یاسای ڕەوشتی نەوەستاوە بەڵکو لەسەر هاوپەیوەندیی خەڵك وەستاوە. ئەوەش کە پێکەوە گونجاندنی بەرامبەری مسۆگەر ئەکات، ملکەچی ئارەزوومەندانەی سەڵتە بۆ ئەو یاسایانەی کە کۆمەڵ دایئەنێ، ئەم ملکەچییەش پێویستی بەرێککەوتنێك هەیە کە ژیانی کۆمەڵایەتی ڕێکئەخات.

فیختــه لــەدژی دەســەڵات دابەشــکردن بــوو بەســەر: یاســادانان و جێبــەجێکردن و قــەزایی ـ دا. تــا ئەگاتــە ئــەو ڕادەیــەی کــە جیهــانی کۆمەڵایەتی ئەکات بەجیهانی موڵکدارێتی تایبەتی چینی بورژوا. چـونکە لای ئــەم کۆمــەڵگای مــرۆڤ لــەخاوەن موڵــک و بــێ موڵــک پێکهــاتووە، دەوڵــەتیش دامــەزراوی خــاوەن موڵکانــە. ئــەم بۆچــوونە پێشــبینییەکی بلیمەتانە بوو بۆ سروشتی ئــابووری چینایەتی دەوڵــەت. بــیری قــوونی فیختە لە تێگەیشتنی ئەو ڕۆڵە سنوردار کراوەبوو کەموڵکداری تایبــەتی لــە کۆمەڵگــەی بــورژواو دەوڵــەتی بــورژوادا وازی ئــەکات، کــە ئــەو سنوردارییە بەشەقڵی ئیدیالیست بکات بەموولکدارییەوە ئاشکرا دەبێ. پرۆژەکەشی دەربارەی ڕێکخستنی دەوڵەت و کۆمەڵگەی ئەڵەمانی چەند ڕایــەکی کۆنەپەرســتانەی تیــابوو... چــونکە هەنــدێك جــار بەرامبــەر تێندێنسی پەرەسەندنی مێژوویی کۆمەڵگەی ســەرمایەداری ئەوەســتێ و دەرکی بەوە نەئەکرد کە بێگومان، پەرەسەندنی سەرمایەداری دابڕاویــی ئــابووری دەوڵەتۆکــە دەرەبەگایەتییــەکان دائــەروخێنێ و بــازاڕێکی سەرمایەداری جیهانی دروست ئەکات.

لە "دەوڵەتی بازرگانی داخراودا" (١٨٠٠) فیختە خەو بەدروستکردنی دەوڵــەتێکی ئەڵــەمانی "داخــراو" لەســەر خــۆی، ئــەبینێ کــە لــەڕووی ئابوورییەوە لــەجیهانی دەرەوە دابڕاو بێ. لــەدوا کردارەکانیشــیدا بــەو پێیــە ســەیری دەوڵــەت و "مــافی" ئــەکرد کــە پلەیــەکی ســەرەتاییە، هەرچەندە پێویستیش بوو بۆ پلەکانی بوونی ڕەوشتی مرۆڤایەتی.

بیرەکانی فیختە هاوبەشی لەبالآپێکردن و پەرەپێدای هۆشی سیاسی بەشە رادیکاڵەکانی بورژوای ئەڵەمانیادا کرد. لەمەیدانی "فەلسەفەی تیوریدا" کارێکی بەهێزی کردە سەر پەرەسەندنی ئاییندەی ئیدیالیزمی کلاسیکی ئەڵەمانی. تیورییەکەشی لەپەرەسەندنی ئاییندەی ئیدیالیزمی کلاسیکی ئەڵەمانی. تیورییەکەشی لەپەرەسەندنی هۆشداو هەوڵدانی بۆ هەڵهێنجانی بەرنامەیی واتاکان و رێگەی "پێچەوانەیی" هەڵهێنجانی لەدووپاتکردنەوەی لەسەر مافی ئەقڵ لەزانینی تیوریدا، مەزەبەکەی لەسەر ئازادی بەو پێیە ملکەچییەکی نارەزوومەندە بۆ پێویستی مێژوویی، کەلەسەر هۆشی ئەو پێویستییە وەستاوە، ئەوانە هەموو کارتێکردنێکی گەورەیان لەسەر پەرەسەندنی بیری فەلسەفی دوا ئەو سەردەمە هەبوو.

**فەلسەفەی ئیدیالیستی بابەتی شیلنگ**

**فەلسەفەی سروشت ـ لایەنی پێشکەوتوانە**

**لەفەلسەفەی شیلنگ دا:**

فەرەدریك ویلهەم شیلنگ ـ ١٧٧٥ ـ ١٦٥٤ ـ سێیەم ناوداری ئیدیالیزمی کلاسیکی ئەلەمانییە. لەکاتێکدا مامۆستا بوو لەزانکۆی فییەنا، گرنگترین دانراوەکانی تیا نووسی. دەربارەی چالاکییەکانی شینلنگ لەو ماوەیەدا ئەنگلس ئەڵێ: ((لەو کاتەدا زەینی خەریکی پێگەیین بوو، لە بەبیری رووناك داگیرسابوو... هەندێکیان رۆڵی خۆی لەخەباتی داهاتوودا بینی))٤٣. بەلام شیلنگ ئەوەی پێشکەوتووی

بالاکردووی ئەو کاتەی ئەڵەمانیا بێ ئومێد کرد، چونکە خۆی خستە پاڵ کۆنەپەرستی سیاسی. شیلنگ لەفەلسەفەی سروشت و لەڕاکانی دەربارەی ئازادی کە بەبەکارهێنانی بەرنامەی دیالیکتیکی پەرەپێدا، لەوەوە خۆی گواستەوە بۆ فەلسەفەی کۆنەپەرستانەی وەحی ئایینی بۆ بوژاندنەوەی سۆفیزمی ئەفلاتونی نوێ.

چارەسەرکردنی فەلسەفەی سروشت گرنگترین پلەی پەرەسەندنی فەلسەفیی شیلنگ پێکئەهێنێ لەڕووی بابەتەکانی کۆلێنەوەوە و بەرنامەیلێکولینەوەوە... فیختە تەنها لەبارەی سەرنجی ڕەوشتەوە سەیری سروشتی ئەکرد، نەك بەو پێیە هەیە. بەڵام سروشت لای شیلنگ بابەتێکی سەربەخۆیە بۆ کۆڵینەوە.

تێندێنسی و ئارەزووی پێرسونالی شیلنگ بەتەنها لەپشت کۆڵینەوەی شییەوە نەبووە، بەڵکو ئەو سەردەمەی دواچالاکی شیلنگ گەلێ دۆزینەوەی گرنگی تیا ڕوودا بەتایبەتی لەبوارەکانی فیزیك و کیمیا و فیزیۆلۆگیدا. دۆزینەوەکانی بواری فیزیك کارێکی گەورەیان هەبوو لەسەر دارشتنی پرۆسەی دینامیکی... دۆزینەوەی گرنگ لەمەیدانی زیندەوەرزانیشدا ئەنجام درا.

دیدی شیلنگ بۆ سروشت ئیدیالییە، لای ئەم مەتریال خۆی گیانیە، لەگەڵ ئەوەشدا بیری پەرەسەندنی خستە ناو ڕێبازەکەی لەسروشتدا. سروشتی بێ هۆش لەپێش پەیدابوونی مرۆڤدا هەبووە، دەرکەوتنی شیلنگیش لەناو پلەی بەرزو بەرتری پەرەسەندنا ئەبێ.

فەلسەفەی سروشت لای شیلنگ زۆر جار لەگەڵ بەرهەمی زانستەکانی سروشتی ئەو دەمەدا ئەکەوتە ناکۆکی ئاشکراوە. بۆیە هەرزوو دوای سەرکەوتنەکانی ئایندەی زانستەکان، نرخی خۆی لەدەست دا. دیسان ئەوەی دەرخست کەمەرجی سەرەکی بۆ کۆڵینەوەی سروشت لەدۆزینەوەی ناکۆکیە دینامیکییە ریالیستەکانی ناویدایە، بەوەش فەلسەفەی سروشت ئەگۆڕێ بەدیالیکتیکی ئیدیالی بۆ سروشت. باری سەرنجیش بۆ ناکۆکییە دیالیکتیکییەکان لەسروشت دا بە ڕاکانی دەربارەی دیالیکتیکی وێنە Fornsی بیرکردنەوە لە پرۆسەی زانیندا تەواو ئەکات. ڕەخنە لەتێگەیشتنیش Verstand، کەشیلنگ خۆی پەرەی پێدا، ناوەڕۆکێکی دروستی ئەقڵی تیا بوو. لەلایەکی ترەوە، مەترسی گۆڕان بۆ نکوڵی کردن لە تێگەیشتن و لە لۆجیکیشی تیا هەبوو. لایەنی باشەی ئەم ڕەخنەیە لەوەدا بوو کەڕێگەی لەبەردەم مەزەبی دیالیکتیك لەیەکێتی دژەکاندا خۆشکرد.

**لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا شیلنگ هاتە سەرئەو ڕایەی کە بڵێ:**

فەلسەفەی سروشت تەنها نیوەی ئەرکی ستێمی فەلسەفی چارەسەر ئەکات، بۆیە جگە لە فەلسەفەی سروشت، کە لە یەکەمێتی بابەتەوە دەست پێ ئەکات، ئەبێ فەلسەفەیەکی تریش هەبێت تا ئەوە دەربخات کە "چۆن بابەتیی لە دەستپێکردن خۆییەوە دەرئەکەوێ، بەو پێیەی تەواو سەرەتاییە" ئەوەش (فەلسەفەی - ترانسیندینتالییە Transendental). فەلسەفەی سروشتی Natural Philosophy و

فەلسەفەی ئیدیالیزم پێکەوە هەردوو ڕێبازە تەنها و توانسەمەندەکە لە نێوان خۆیاندا دابەش ئەکەن.

شیلینك لەهەردوو فەلسەفەکەیدا، فەلسەفەی سروشت و فەلسەفەی ترانسیندینتالی، لەپرنسیپی یەکێتیی گیان و سروشتەوە دەست پێنەکات، لای وابوو کە جگە لە ئەقڵی مۆتڵەق هیچی تر نییەو لەوەدا خۆیی و بابەتی پێکەوە ئەبەسترێن، "یەکێتییەك پێك ئەهێنن کە جیاوازی نێوان خۆیی و بابەتی تیا نەبێ" دیسان لای وایە کەهۆشی خۆیی، هۆشی خۆیی یەزدانە، چونکە یەزدان لای ئەم خودی ئەقڵە. بەو جۆرە فەلسەفەی یەکێتیی کە ئەیویست ببێتە فەلسەفەی ئەقڵی Rationalism لاتەنگیر، لای شیلنگ ئەبێتە شێوەیەك لەشێوەکانی نائەقڵی Irrationalism و سوفیزم. دیسان ئەڵێ: یەزدان پێش هەموو شتێك پیرسۆناڵە، جیاوازی نێوان یەزدان و مرۆڤیش لەوەدایە کە پیرسونالی و ئازادی لای یەزدان بێ سنوورن، بەڵام لای مرۆڤ سنووریان هەیە.

فەلسەفە سروشتیەکەی شیلنگ، فەلسەفەیەکی پێشکەوتووانە بوو، بەڵام مەزەبە فەلسەفییەکەی، هەمووی پێکەوە، لەساڵی ١٨١٥وە گۆڕا بۆ مەزەبێکی کۆنەپەرستانە، بوو بە "فەلسەفەی ئەفسانەو وەحی" ئنگلس، کەلەو سەردەمەدا لاویش بوو، جەوهەری گۆڕانی شیلنگ کە بەرەو ئایین و سۆفیزم بوو، دەست نیشان کرد. ناوەڕۆکی

کۆنەپەرستانەی "فەلسەفەی ئەفسانەو وەحی" و دژایەتیکردنی زانست
و نەتوانینی بینینی ناوەڕۆکی باشەی فەلسەفەی هێگلی خستەڕوو.٤٤

# بەشی حەوتەم

- فەلسەفەی کلاسکی ئەڵەمانی ئیدیالزمی دیالیکتیانەی
- فەلسەفەی هیگل لوتکەی ئیدیالیزمی کلاسیکی ئەڵەمانییە.
- یەکێتی بون و نوختەی دەست پێکردنە لەفەلسەفەکەی هیگلدا.
- تیۆری پراکتیکی لۆجیکسی هیگلی. هێلە گشتیەکانی دیالیکتیکی هیگلی.
- فەلسەفەی سروشت.
- فەلسەفەی گیان.
- ستێم و بەرنامەی لەفەلسەفەکەی هیگلدا.
- ناوکی ئەقڵیی دیالیکتیکی هیگلی.

## فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی، ئیدیالیزمی دیالیکتیکانەی

## ـ فەلسەفەی هیگل لوتکەی ئیدیالیزمی کلاسیکی ئەڵمانییە.

جورج و لیبەم فردریك هیگل بە ناوبانگترین نوێنەری فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵەمانیە. لە ساڵی ١٧٧٠دا لە شاری شتوگارت لە میرنیشینی فیۆرتمبورك ـ ئەلەمانیا هاتوتە دنیاوە.لە زانکوی توبنگن فەلسەفەی لاهوتی خوێندووە..لە ساڵی ١٨٠١دا بەرگری لە دکتۆرانامەکەی کردووەو ئینجا بووە بە مامۆستا لە زانکۆی ڤییەنا.لەو ماوەیەدا هیگل کەوتبووە ژێر کارتێکردنی ڕاستەوخۆی "فەلسەفەی یەکێتی"شیلنگ. وە بە هاوکاریش لەگەڵ ئەم"گۆڤاری فەلسەفەی ڕەخنەگری" یان دەرکردووە.

یەکەم بەرهەمی گرنگ و تەواو سەربەخۆی هیگل"فینومینولۆژیای گیان"(١٨٠٦)بوو کە وەك مارکس ئەڵێ"سەرچاوەی ڕاستەقینەی" فەلسەفەی هیگلییە.لە ساڵی ١٨٠٨یشدا بوو بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی سانەوی لە نۆرمبۆرگ...لەو کاتەشدا،دانراوە مەزنەکەی "زانستی لۆژیك"ی نوسی. دوای ئەوەی بۆتە مامۆستاو ڕاگر(عەمید) لەچەند زانکۆیەك، لە ساڵی ١٨٣١ دا کۆچی دوایی کردووە.

**ئنگلس جێگەی مێژوویی هیگل لەپەرەسەندنی فەلسەفەدا وادیار ئەکات:**

"فەلسەفەی نوێی ئەڵمانی لەمەزەبەکەی هیگلیدا گەیشتە لووتکە، شوێنەواری مێژوویی مەزنی هیگل لەوەدایە کە یەکەم کەس بوو سەرنجی لەجیهانی مێژوویی گیانیی بەو پێیەدا کەپرۆسەیە، واتە لەجوڵەی هەمیشەیدایە، لەگۆڕان و پەرەسەندندایە، تەقەلای ئەوەیدا کەپەیوەندی ناوخۆی ئەو جوڵان و پەرەسەندنە بدۆزێتەوە... ئیتر لامان گرنگ نییە کە هیگل چارەسەری ئەو مەسەلەیەی نەدۆزیوەتەوە، چونکە کارە مێژووییەکەی لەخستنەڕووی ئەو مەسەلەیەدایە"(٤٥)

نرخی مەزنی فەلسەفەکەی هیگل لەوەدایە کەبەشێوەیەکی ڕێکوپێک دیدی دیالیکتیکانەی بۆ جیهانی فۆرمولە کرد کەلەگەڵ بەرنامەی دیالیکتیکی بۆ کۆڵینەوە بسازێ. هیگل دیلیکتیکی بەو پێیە دارشت کە زانستێکی فەلسەفییەو مێژوو بۆ هەموو زانین و دیسان بۆ ئەو یاسایانەی زیاترین پەرەسەندنی واقیعی بابەتی ئەگرێتەوە،گشتی ئەکات. هەروەها هیگل هەوڵیدا لە پرنسیپە بنچینەییەکانی ڕێگەی بیرکردنەوەی دیالیکتیکی کە لە بنەرەتەوە پێچەوانەی میتافیزیکن بکۆڵێتەوە لەلایەنە جیاجیاکانەوە بیانسەلمێنێ.بە قووڵی و توندی ڕەخنەی لە میتافیزیک گرتووە تا یاسا و واتا دیالیکتییەکان فۆرمولە بکات، هەرلاچەندە بە شێوەیەکی ئیدیالیستانەی شێواو بوو.

ئەم فەیلەسوفە بیرە دیالیکتییەکانی کانت و فیختە وشیلنگی بەرەو پێشەوەی پەرەپێداو لە هەمان کاتیشدا بیرە چەوتەکانیانی بە درۆ خستەوە.

هیگـل لای وابـوو سروشـت بـه شـێوەیەکی سـەربەخۆ لـە مـرۆڤ لـە ئارادایە،زانیاری مرۆڤایەتی ناوەروك بابەتییە. لەو کاتەی کە ڕەخنـە لـە بەربـەرەکانیی نـاوخۆیی ئـەگرێ، ئـەو ڕەخنەیـەی کـە کانـت لـە نێـوان ناوەرۆك و ڕووکەشدا دایناوە، هەر لەهەمان کاتدا ئەوە ئەچەسپێنێ کـە لە ڕووی بابەتییەوە ڕووکەش لە ناوەروك کەمتر نییە...بـەڵکو ڕووکـەش ناوەرۆکیشە،بە پەنا بردنە بەر پرنسیپی دیالیکتیکی لە یەکێتی ناوەروك و ڕووکەشـدا هیگـل بەربـەرەکانی ڕاکـانی کانـت لـە مـەر مـەحالیی زانینی"خودی شتەکان"ئەکات.بە پێچەوانەی فیختەشەوە، لای وایە کـە ناتوانرێ سروشت یا کۆمەڵگە لە"خۆ"ی مرۆڤایەتییەوە،لە هۆشی خۆوە سەرئەنجام بهێنرێ،دیسان ناشتوانرێ بۆ ئەو بگێڕێتەوە...ڕەخنەکەشی لە شیلنگ لەو توندوتیـژی کـەمتر نەبوو،بـە تایبـەتی لـە کەمکردنـەوەی ڕۆڵی بیرکردنەوەی لۆژیکیو لە لۆژیك بە شێوەیەکی گشتی و لە خەملان Intuitiomism کە شیلنگی بەرەو نائەقڵیی ئاشکرا برد.

بـەلآم هیگلـی ئیدیالیسـت نەیئـەتوانی ڕەخنـە لـە ئـەنگی بنچینـەیی ئیدیالیزمی فەلسەفەکانی پێش خۆی بگرێ.سروشـت لای ئـەم هـەر وەك ئیدیالیستەکانی تر، بەرهەمی گیانێکی بەرزە بەسـەر سروشـتدا هـەر بـە تـەواوی لەبـەر ئـەوە بـووە کـە هیگـل نـەیتوانی وەرامـی ئـەو مەسـەلە دیالیکتییە گرنگانـە بداتـەوە کـە پـێش ئـەم باسـکرابوون،یان خـۆی لـە سستێمە فەلسەفیەکەیدا خستە ڕوو.

**ـ یەکێتی بون و بیر نوختەی دەست پێکردنە لە فەلسەفەکەی هیگڵدا.**

هیگل وەك شیلنگ لەو بڕوایەوە دەست پێ ئەکات کە ئەڵێ:ناتوانرێ نە مەتریال و نە هۆشی مرۆڤ بە سەرەتا دابنرێ، چونکە لە ڕووی لۆجیکەوە ناتوانرێ هۆش لە مەتریالّ ئەنجام بهێنرێ هەر وەك چۆن ناتوانرێ مەتریال لە هۆشی مرۆڤ ئەنجام بهێنرێ. ئەو"هۆشە"ش ئەبێ وا سەیر بکرێ کە ئەنجامی پەرەسەندنێکی پێش یەکەم جەوهەری موتلەقە. بەڵام هیگل بەربەرەکانی بۆ چوونی شیلنگ ئەکاو لای وایە کەفەلسەفەی دروست فەلسەفەی یەکیتی نییە،بەڵکو ئەو فەلسەفەیەیە کە پرنسیپەکەی یەکێتییە،ئەوە چالاکییە، جوڵەیە پاڵپەستویە،و لەدواییشدا شان بە شانی جووت بوونی لەگەڵ خۆیدا لە جیاوازیشدایە.یەکەم یەکێتی کە بنچینەی جەوهەریی جیهان پێك ئەهێنێ ... یەکێتی بوون و بیرە،یەکێتییەک کە هەر لە سەرەتاوە ـ بابەتیی وخۆیی تیا جیاوازە، بەڵام ئەو جیاوازییە تەنها لە بیردا هەیە.هیگل خۆی بەلایەنگیری پانتیزم دائەناو ئەیووت هەموو فەلسەفەیەکی دروست ئەبێ پانتیزم بێ. دیسان لای وابوو کە ئەقل بەهرەیەکی تایبەت بە مرۆڤ نییە، بەڵکو بنچینەی سەرەتاییە بۆ جیهان، بۆیە جیهان لە بناغەیدا لۆجیکییە،و بە پێی یاساکانی بیر یاساکانی، ئەقڵ پەرەئەسەنێ و باڵائەکا، بەوەش ئیدیە،ئەقڵ،لای هیگل ئەبێ بە جەوهەری مۆتلەقی سەربەخۆ لە مرۆڤ و مرۆڤایەتی ، لە سرۆشت و مرۆڤ

و مێژووی جیهانی. دیسان هەوڵ ئەدا ئەوە بسەلمێنێ کە بیر وەکو ماهییەتێکی جەوهەریی لە دەوری جیهاندا نییە بەڵکو لە ناو جیهان خۆیدایە، بەو پێیە کە ناوەڕۆکی ناوەوەیەتی. ئەو بیرە لەو جۆربوونە بێ شومارەی دیاردەکانی بووندا دەرئەکەوێ.

هیگل سەرنجی بیر" ئیدیەی موتلەق " وانادات کە وەستاو بەستراوەیە بەڵکو کە پرۆسەیەکە یەکبینە پەرەئەسەنێ، لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکی تر...تائەگاتە ئەو ڕادەیە بڵێ ئیدیەی موتلەق هەر سەرەتا نییە و بەس بەڵکو ناوەڕۆکی پەرەسەندووی پرۆسەی هەموو گەردوونە. بەو پێیە ئەتوانرێ پرنسیپی هیگلی کە ئەڵێ: ئەبێ وا لەمۆتلەق بگەین نەك وەك سەرەتایەك بۆ هەموو بوویەك، بەڵکو وەکو ئەنجامێکیشی، مانای وەکو پلەیەکی بەرز لە پەرەسەندنی. ئەم پلەی بەرزە لە پەرەسەندنی"ئیدیەیموتلەق"هیگل ناوی ئەنێ"گیانی موتلەق"، مرۆڤایەتی،مێژووی مرۆڤایەتی.

هیگل هەموو ئەو بیرانەی خستە ڕوو،بۆ یەکەم جار هەوڵی دا لە"فینۆمینۆلۆژیای گیان" دا بیانسەلمێنێ. دیسان لە بەشی یەکەمی ئەو دانراوەدا هیگل لە پەیوەندی هۆش بە بابەت ئەکۆڵێتەوە ئەگاتە ئەو سەرەنجامەی کە: بابەت توانستی زانینی هەیە چونکە ماهییەتەکەی شەقڵ گیانیی، لۆجیکی هەڵگرتووە. ماهیەتی خۆیی هۆش لە بابەت دا دەرئەکەوێ و بە هۆی ئەوەوە بۆ هۆشی خۆ بەرز ئەبێتەوە. بۆیە ئەبێت لە پەیوەندییە دەرەکییەکانەوە سەیری هۆشی -

خۆ نەکریّ، بەڵکو لە شێوەکانی تری هۆشی خۆ کانەوە سەیری بکریّ لێرەوە لە باری سەرنجی هیگلەوە،پەیوەندییە جۆر بە جۆرە کۆمەلاّیەتییەکان دێتە ئەنجام(بۆ نموونە: پەیوەندی کۆیلە لەگەل خاوەنەکەی) ئەو پەیوەندیانەش تەنها شێوەیەکە Form بۆ پەرەسەندن و دەولەمەند کردنی هۆش مرۆڤایەتی بۆ خۆدی خۆیان لە سەر ڕێگەی بەرەو یەقینی مۆتڵەق و بۆ ڕژێمێکی کۆمەلایەتی پەسەند، کە تیایدا نلوەڕۆکی بیّ سنوورو دەوڵەمەندی ئیدیەی مۆتڵەقی تیایدا ناوەڕۆکی بیّ سنوورو دەوڵەمەندی ئیدیەی موتڵەقی تیا ئاشکرا بیێ...هیگل ئیسان لای وایە:

دەرکپێکردنە هەستییەکان ڕاستەوخۆ بەبابەت ، بەمەتریاڵەوە بەستراونەوەو کار ئەکەنە سەر پایەگاکانی هەست،بەلاّم زانست ئەو دیاردەو لایەنانە دەرئەخاکەئەیانبینین یان گوێمان لێیانە یان تامی ئەکەین.

لەدواییدا ئەڵێ: بیر پشت بەبەرهەمە ئەزموونییە هەستییەکان ئەبەستیّ ،بەبیّ ئەمان ئەو نابێت . بەلاّم هیگل یەکێتیی دیاتیکتیکی نێوان تیوری وئەزموونی نابینیّ، ئەو شێوەیەی کەبیر ناوەڕۆکەکەی لەباری سەرنجە هەستییەکان لەجیهانی دەرەوە وەرئەگریّ...تێی ناگات . ئینجا ئەگاتە ئەم سەرنجامە خەیاڵییە :

بیری مرۆڤ لەوە تێپەر نابیّ کەیەکێکە لەدەرکەوتەکانی (هەر چەندە بەرزترینیانە لەسەر زەوی)، بیری هەڵواسراوە،لەدەری مرۆڤدایە -

"ئیدیەی موتڵەق"، واتە یەزدان، مەعقول، یەزدانی و ڕیالستیی‌و پێوستیی، بەپێی پێویست لەگەڵ یەکدا جووت ئەبن، لێرەوە یەکێك لەبابەتە بنچینەییەکانی فەلسەفەی هیگلی ئەنجام دێت: "هەموو ئەوانەی واقعە مەعقولن.هەموو ئەوانەی مەعقولە واقیعن. بەڵام واقیعی لای هیگل هەموو ئەوانە نییە کە هەن، بەڵکو هەموو ئەوانەیە کە گرنگن، جەوهەرین و لەرووی مێژوویەوە پێویستن.

بیر، ڕیالیزمی بابەتی ڕەنگ پێ ئەداتەوە، جا چەندە ئەو پێچەوانەیە ڕاست بێ، ئەوەندە ئەتوانین قسە لە سەر دیدی ئەقڵیی بۆ جیهان بکەین. بەڵام هیگل ڕەنگدانەوەی واقیع(ئەقڵ)و ئەوەی ڕەنگ پێ ئەداتەوە ـ واتە ڕیالیزمی بابەتی ـ لەگەڵ یەکدا جووت ئەکات. ئەو یەکێتییەی نێوان ئەقڵی گەردوونی و جیهانی دیاردەکان بە دەولەمەندی و هەمە جۆرییەوە هیگل ناووی ئەنێ"ئیدیەی موتلەق".

تێگەیشتە ـ فورمەلەی بنچینەیی بیرە. لای هیگل" سەرەتای هەموو ژیانێکە"و" وێنەیەکی داهێنەری بێ سنوورە، هەموو ناوەرۆك دەولەمەندییەکی تیایە و لە هەمان کاتدا سەرچاوەی ئەو ناوەڕۆکەیە". لە کاتێکدا هیگل بەربەرەکانی دیدی مەتریالیستانەی تێگەیشتە ئەکات بەو پێیەی کە شێوەیەکی بەرزتری ڕەنگدانەوەی واقیعی بابەتییە، بەو ە کارەکان لنگە وقوچ ئەکات، چونکە لای ئەم ، بیر ڕەنگدانەوەی بوون نییە، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەوە، بوون لاشاندنێکی بیرە، هی تێگەیشتەیە، هی ئیدیەیە. لەم ڕووەوە هیگل ئەڵێ:

"تێگەیشتە ئەوەیە کە لەناو خودی شتەکاندا ئەژی،ئەوەیە کە بەهۆیەوە شتەکان بەو جۆرەی دەرئەکەون هەن. تێگەیشتنی بابەت مانای هۆشمەندی تێگەیشتەکەیەتی. جا چەندە ئەو رایە خەیاڵی دەریکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا بیرێکی قوڵ و ڕاستی لە سەر ڕۆڵی گرنگی تێگەیشتەکان لە پرۆسەی بیرکردنەوەو لە سەر سەربەخۆیی نیسبی و لە سەر بەرهەمە هەستییەکان، کە لێیەوە دەست پێ ئەکاو بەلام لە چوارچێوەکە دەرئەچێ، وازی کرد"(٤٦).

لەو سەردەمەی هیگلی تیا ئەژیا ئەمی تەسکی ئەزموونی و باوەڕنەبوون بە بیری تیوری و هەوڵدان بۆ ئەوەی کۆڵینەوە تەنها واقیعە هەستییەکان بگرێتەوە، ئەوانە بە سەر زانستدا زاڵ بوون. زانا ئەزموونییەکان واسەیری تێگەیشتەکانیان ئەکرد کە هەر تەنها ناوی ڕووتوقوتن و نیشانەن بۆ کۆمەڵێ واقیع کە بە هەست دەرك ئەکرێن، هیگل لە دژی ئەو کەم کردنەوەیەی ڕۆڵی بیری تیوری بوو. بەلام بە تێگەیشتەیەکی زانستیانە بۆ ڕۆڵی بیری تیوری (کەتا ئەو کاتەش چارەسەری نەکرابوو) بەرامبەر بە ئەزموونی نەوەستا.بەڵکو بە تیورییەکی ئیدیالیستی لە سەر هێزی بێ وێنەی تێگەیشتەکان وەی بیرەکانت ئەوەی کرد...

بەو پێیە بۆ چوونی بنچینەیی لە سستێمە فەلسەفیەکەی هیگڵدا جووتکردنی ئیدیالیستانەی بوون و بیرە، گێرانەوەی هەموو پرۆسەکانە بۆ پرۆسەی بیرکردنەوە...مێژووی واقیعی ئەگێڕێتەوە بۆ پرۆسی زانین،

وادائەنیّ کە پەرەسەندن و قۆلبوونی زانیاریمان دەربارەی جیهان هیچ نییە جگە لە پەرەسەندنی ئەو واقیعە خۆی نەبیّ.

ئنگلس دیارد بۆ ئەو بنچینە فەلسەفییەی هیگل ئەکات و ئەڵیّ:

"هیگل ئیدیالیست بوو، بیرەکانی ناو مێشکمان لای ئەو، بەرادەی ئەم ئەزموون یان ئەو ئەزموون، ڕەنگدانەوە نین بۆ شت و پرۆسەیواقیعییەکان، بەڵکو بە پێچەوانەوە، هیگل شتەکان و پەرەسەندنیان بەلاشاندنی "بیرێك" دائەنیّ و ئەڵیّ گوایا هەر لە پێش دروست بوونی جیهاندا هەبووە. ئیتر بەو پێیە کارەکانی سەرەو خوارو لنگەوقوچ کرد، بە شێوەیەکی ترسناك پەیوەندی ڕیالیستی نێوان دیاردەکانی جیهانی شێواند"(٤٧).

## تیۆری پراکتیکی لۆژیکی هیگلی

## هێڵە گشتیەکانی دیالیکتیکی هیگلی

فەلسەفەکەی هیگل لە سیّ بەشی سەرەکی پێك هاتووە: لۆژیك، فەلسەفەی سروشت وفەلسەفەی گیان کە ڕاستەوخۆ فەلسەفەی هەق و زانستی جوانی فەلسەفەی ئایین و مێژووی فەلسەفەیان پێوە بەستراوە.

هەروەك لە پرنسیپی بنچینەیی فەلسەفەی هیگلدا دەرئەکەویّ لۆژیك بەشی هەرە گرنگی سستێمەکەی پێکئەهێنیّ چونکە یەکێتیی بون و بیر مانای وایە یاساکانی بیر کە لۆژیك لێی ئەکۆلێتەوە،هەر هەمان یاساکانی بوونە،بە سروشت و مێژووی مرۆڤایەتی و زانینیشەوە. لۆژیك پێش

هیگل زانستی وێنەی بوون بوو(شێوەی خۆیی مرۆڤ). بەلام هیگل هەرچەندە نکوڵی لەم بوونی جۆرە زانستە نەکرد، واتە لە لۆژیکی وێنەیی (شێوەیی) وەك زانستێك دەربارەی شێوەو یاسا سەرەتاییەکان بۆ بیر کردنەوەی دروست، لە هەمان کاتدا ئەرکێکی فراوانتر و سەرجەمیتر ئەخاتە بەردەم زانستی لۆژیك، ئەوەش کۆلینەوەیە لەو یاسایانەی زیاتر سەرجەمین بۆ پەرەسەندنی زانین.

وە لەبەر ئەوەی"بیر" لای هیگل بنچینەی هەموو بوونێکە، بۆیە لۆژیك لای ئەم ئەبێتە زانستێك دەربارەی ماهییەتی گشت شتەکان. لەبەر ئەوە هیگل لە دانراوەکەیدا((زانستی لۆژیك)) شان بە شانی مەسەلە ئاساییەکان کە دەربارەی تێگەیشتەو بڕیارو بەڵگە ئەقڵییەکانن... لە مەسەلەو باسی تری واش ئەکۆلێتەوە کە لەوەو بەر بە لۆژیکی وێنەیی نەسپێردرا بوو وەکو: یاساکانی خۆدی واقیع و بوونی گۆڕانە چەندایەتییەکان بۆ چۆنایەتی و پەیوەندییە بەرامبەرییەکانی واتا فەلسەفییەکان و سروشتی پرۆسە میکانیکی و کیمیاوی زیندەوەرییەکان هتد... جا هەر چەندە ئەوە شوێنەوارێکی مەزنی مێژوویی هیگلە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕووخستنی هیگل بۆ لۆژیکە دیالیکتییەکەی ئیدیالیستی بوو، چونکە یاساکانی سروشت و یاساکانی لۆژیك، یان بیر، لەگەڵ یەك جووت ئەکات.

لیـنین ئـەڵێ" "هیگـل ، بـەکرداری ، سـەلماندی کـە شێوەو یاسـا لۆژیکییەکان بەرگێکی بۆش نین، بەڵکو ڕەنگدانەوەی جیهـانی بابـەتین. بۆ وردی ئەڵێین نەیسەلماند بەڵکو بلیمەتانە پێشبینی کرد"(٤٨).

لەزانستی لۆژیکدا هیگل لە تێگەیشتەی گشتییەکان ئەکۆڵێتەوە، ئەو تێگەیشتانەی کە لەناو پرۆسەی پەرەسـەندنی زانیـاری مرۆڤایەتیـدا لـە ڕووی مێژوویـەوە دروسـت بـوون وەك" بـوون و نـەبوون، گـۆڕان، چەندایەتی و چونایەتی، پێوانـە، جەوهـەر، وەك یـەککردن و جیـاوازی، نـاکوکی، پێویسـتی و سـوتفە، توانسـت و واقیـع و هـی تـریش، دەیسەلمێنێ کە هـەموو ئـەو تێگەیشـتانە پەیوەندیان بەیەکـەوە هەیـە پلەی جیاجیای زانین دەرئەبرن و بەرەو ناخی قـووڵایی هـەموو بوویـەك ئەڕۆن.

تێگەیشتەکانیش لای هیگل لە جۆلەی بەردەوامـدان، ئەگوێزرێتـەوەو لـە یەکێکـەوە بـۆ یـەکێکی تـر، ئـەگۆڕێ و پەرەئەسـەنێ و ئـەبێ بەدژەکەی، بەوەش ناکۆکییە پێوەبەسـتراوەکانی نـاوەوەی دەرئـەخات کـە هێـزی جۆڵێنـەری تێگەیشـتەو بیرەکـان لەپـەتی - یـەوە ئـەبێ بـە کۆنکرێـت و لـە تێگەیشـتەی یـەك لایـەن و هـەزار لـە ناوەڕۆکـا ئـەبێ بەدەولەمەندتر کەلەیەکێتیدا ئەبێتە چەند لایەنی و هەتا دژ بە یەکیش. لە پەرەسەندنی تێگەیشتەو لە توێژینەوەی لەو تێگەیشتەی چـەندایەتی وچونایەتیی، هیگل دەری ئەخات چۆن گۆڕانی چەندایەتی ئەبێتـە هـۆی گـۆڕانی چـۆنایەتی بـە شـێوەی قەڵـەمبازو پچـراندن لـە بـەردەوامی و

گواستنەوە لە دۆخێکەوە بۆ دوخێکیتر، بۆ ئەمەش هیگل نمونەی گۆڕانی ئاوا ئەهێنێتەوە کە چۆن شلە ئەگۆڕیَ بۆ دۆخی بەستن یان غاز. دیسان نمونەی تری بوارە جۆربەجۆرەکانی ئەهێنێتەوە. لەو ڕێڕەوشدا هیگل ڕەخنەی توند لە میتافیزیک ئەگریَ و ئەوە دووپات ئەکاتەوە کە ئەڵیَ: دژەکان مۆتلەق نین بەڵکو نیسبین وە لە نێوانیان دا کۆسپی وانییە کە ئەبڕیَ، دژ بوونیش نیسبیە، واتە هەر یەکە لە دوو دژەکە تەنها پەیوەندی لەگەڵ دژەکەیدا هەیە، لە جوڵە، لە گۆڕان و پەرەسەندن. لینین ئەڵیَ: هیگل بلیمەت بوو کە پێشبینی لەوە کرد کە: گۆڕانی تێگەیشتەکان و هەموو پەیوەندییەکانیان و جوتبوونی دژەکانیان و گواستنەوەیان لە تێگەیشتەیەکەوە بۆ تێگەیشتەیەکی تر، کە" گۆڕانی تێگەیشتەکان و جۆلانەوەی ئەمریان، هەر ئەوە دەرئەخەن کە پەیوەندییەکی لەو بابەتە لە نێوان شتەکانی ناو Trtiad فورمەلە کردووە: تێز Thesis–، دژی دژ Antithesis- ڕۆنان Synthesis-(نەفی نەفی ). لەم فورمەلەیەدا، واتە لە شێوەی سیَ کوچکەدا، هیگڵ نەفی نەفی بە شێوەیەکی ناڕەواو نائاسایی بەکاردەهێنیَ ، بە شێوەی مۆر کە هەموو پرۆسە لێکۆلراوەکانی پیَ مۆر دەکات. بۆیە ئەکەوێتە بەردەم ڕەخنەی مارکس و ئنگلس و لینین کە یاسای پەرەسەندنیان بە پشت بەستن بە پێدراوە کۆنکریتییەکان چارەسەر کرد..."(٥١)

هیگڵ بە دوزینەوەی یاسا گشتییەکانی گۆڕان و پەرەسەندنی هەموو ئەو شتانەی هەن، چەپۆکێکی توندی ئاراستەی دیدی میتافیزیکی کرد کە دەڵێ ماهییەت ناگۆڕێت. بەڵام هیگڵ ئیدیالیستانە لەو گۆڕانانەی ماهییەت گەیشت، بەو پێیەی جوڵانەوەی بیرە، هی"موتلەق ئیدیە-"یە. بەو پێیەی بوونی ماهییەتە بە تێگەیشتە... تێگەیشتەش لای هیگل پرۆسەی تیۆری بیرکردنەوەیە و بۆ مۆتلەق بەرزکراوەتەوە. چالاکی بیرو سەرجەمی چالاکی بەهۆش و بەمەبەستی مرۆڤ ، بۆ گۆڕانی جیهان، هیگڵ ئیدیالیستانە لێکدەداتەوە ، بە پێیەی کە داهێنراوێکە ، یان هۆشمەندیی خۆییە بۆ "ئیدیە- ی موتڵەق" کە لەخۆدی خۆیدا هەموو ئەو شتە لە ڕووانەی وا دەرئەکەون کە پەرەسەندنێکی شت و کۆمەڵە ، دەرئەخا.

شۆێنەواری گرنگی هیگڵ لەوەدایە کە ئەو خەسڵەتە گرنگەکەی خوڵەی بیری تیوری کۆنکرێتی دەرخست لە زانینی پەتی - بەوە بۆ زانینی کۆنکرێتی. بەڵام هیگڵ بە شێوەیەکی ئیدیالیستانە ئەو پرۆسە ڕیالیستەی شێواند ، چونکە بە پرۆسەی پێکهاتن و پەرەسەندنی شتە سرۆشتییەکانی دایە قەڵەم، کەلەو حالەتەدا ناناسرێ و ناگێڕێتەوەتەنها لە ڕووی تیەرییەوە نەبێ.

لە کۆڵینەوەیدا لە پرۆسەی زانین، هیگڵ مەسەلەی پەیوەندی زانینی تیوری لەگەڵ چالاکی پراکتیك ئەخاتە ڕوو، هەوڵ ئەدات کە یەکێتیی و پەیوەندی تیوری و پراکتیك Praxis دەربخات...بەلام تێگەیشتەی

مارکسیزم بۆ پراکتیك لە بنەڕەتدا لە تێگەیشتەی هیگڵی جیاوازە ، پراکتیك لە بارەی سەرنجی مەتریالیزمی دیالیکتیەوە - ئەوەیە کە ئامرازە مەتریالیستەکان بەمەبەستی گۆڕینی ڕیالیزمی ماتریالی و زانینی بەکارهێنانی ، بەڵام هیگڵ وا لە پراکتیك گەیشت کە چالاکییەکی دیاری بیرەو لە سەرەنجامیشدا، چالاکییەکی گەردونییە بۆ "ئیدیە ی موتلەق" کە لەکاتی هۆشمەندی خودی خۆیدا جیهان دەخوڵقێنیْ.

لووتکەی پرۆسەی پەرەسەندنی لۆژیکی لای هیگل دەگاتە تێگەیشتەی "ئیدیە ی مۆتلەق" کە لەسەرەتادا "جیاوازە" لە بووندا و جولەی ئەداتیْ، بەوەش بوون بووە خاوەن ناوەڕۆك. دوایی "ئیدیە ی مۆتلەق" لە شێوەی ماهییەت و ئینجا تێگەیشتەداناشکرا دەبیْ. لە دوایشدا دیسان - بە هۆی پەرەسەندنی تگەیشتەوە سەر لەنوێ ئەگەڕێنەوە بۆ "ئیدیە ی موتلەق

لینین ئەڵێ: لە ڕاستیدا ئنگلس هەقی بوو کە بە سستێمەکەی هیگڵ بڵێ " ماتریالیزمێکی هەڵاوگێرە "(٥٢).

مەسەلەکانی لۆژیکی دیالیتیکی جێگەیەکی دەرکەوتویان لە " زانستی لۆژیك" دا گرتووە. هیگڵیش لە پێشبینییەکی بلیمەتانەوە دەربارەی یەکێتی یاساکانی بیرو یاساکانی واقعی بابەتی دەستئەکات بە چارەسەرکردنی ئەو مەسەلانە.

یاساکانی بیر هەرچەندە بە تەنها پابەندن بە خۆوە بەڵام ناوەڕۆکی بابەتییان هەیە. هەروەك لینین ئەڵێ: پەیوەندییە ڕیالیستەکانی پێش

مارکسیزم تێینەگەیشتبون، چونکە هەر لە سنووری دووپات کردنەوەی ئەوەدا مانەوە کە دەیانووت: بیر تەنها ناوەڕۆکی ڕەنگدانەوەی ڕووداوەکانی جیهانی دەرەوەیە. لینینیش ئەڵێ: " لۆژیك زانستێك نییە دەربارەی یاساکانی پەرەسەندنن" هەموو شتە دەرەوەی بیر بێت ، بەڵکو دەربارەی یاساکانی پەرەسەندنن" هەموو شتە مەتریالیست و سروشتی و گیانییەکان"،واتە"پەرەسەندنی کۆی ناوەڕۆکی کۆنکریتی concerete جیهان و زانینمان بۆی، مانای، پوختەی،کۆی، ئەنجامی مێژویی زانینی جیهان"(٥٣).

**ـ فەلسەفەی سروشت.**

ئەگەر لۆژیك لای هیگل "زانستێك بێت دەربارەی خودی ئیدیە، لە پێناوی خودی خویدا" وا فەلسەفەی سروشت لای ئەم فەیلەسوفە " زانستێکە دەربارەی ئیدیە، لە بونەکەی تریدا".بەلام هیگلێ بۆمان لێك ناداتەوە چۆن گواستنەوە لەبیرو لۆژیکیی "پوختەوە" بۆسروشت ڕوونەدات. تەنها ئەوەندە نەبێ" ئیدیە ـ ی موتڵەق" دوای ئەوەی دەرکی بەناوەڕۆکی خۆی کرد" بەخواستی خۆی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی خۆی دا تا سروشت پێکبهێنێ"(٥٤)... لەدواییدا ئەڵێ:"گیان نابێ بەگیان تەنها لەناو سروشتدا نەبێ"... تاقسەکانی ئاینی مەسیحی لایەنگیری دەکات کە ئەڵێ: یەزدان گێتی لەنەبوون دروست کردووە.

هیگڵ لای وابوکە شێوەسەرەکییەکانی سروشتی(جیاوان) لە "ئیدیە ـ ی موتڵەق": میکانیك و فیزیك و ئۆرگانیکایە.لە میکانیکا لەشوێن و، کات و، مەتریال و جوڵەو، رافرینی جیهانی ئەکۆڵێتەوەو ئەو تێگەیشتانە، ئیدیالیستانە لێك ئەداتەوەو تەقەلا ئەدات تالەرووی لۆژیکییەوە مەتریال لەزەمان و زەمین هەڵبهێنجێ، لەگەڵ ئەوەشدا هیگڵ ناچار ئەبێ دان بەوەدا تەقەلا ئەدات تالەرووی لۆژیکییەوە مەتریال لەزەمان و زەمین هەڵبهێنجێ، لەگەڵ ئەوەشدا هیگڵ ناچار ئەبێ دان بەوەدا بنێ کە کات و شوێنێ بۆش لەئارادا نییە، ئەمەش ئەوە ئەنێتەکایەوە ـ بە پێچەوانەی گوتەی ئیدیالیستانەی خۆی ـ کەزەمان و زەمین دوو شێوەی بوونی مەتریالن. دیسان دان بەوەدا ئەبێ کە مەتریال و جوڵە لەیەك جیانابنەوە:

"هەروەك چۆن جوڵە بەبێ مەتریال نییە هەروەها مەتریال بەبێ جوڵانەوە نییە"(٥٥).بەلام لای هیگڵ مەتریال تەنها وەکو روخساری دەرەوەی"ئیدیە ـ ی موتڵەق ئەمێنێتەوە... تەنانەت هیگڵ والە جوڵانەوە ناکات کە گۆڕانەو ئەبێت بە پەرەسەندن، بەڵکو وەك گواستنەوەی شوێن و دووبارە بوونەوەی ئەوەی لەپێشدا هەبووە تییدەگات.

لە فیزێکیشدا هیگڵ لەتەنە ئاسمانییەکان و روناکی و گەرمایی و کیمیاو هیتر ئەکۆڵێتەوە... لەم بەشەی فەلسەفەی سروشتدا زۆر گوتەو گریمانی بێ بنچینە ئەبینین، کەبێ توانایی ئیدیالیزم نیشان

ئەدات لەگشتی کردنی بەرهەکانی زانستە سروشتیەکان، وەك نکۆلی کردنی لەراستیی دروست بوونی ئاو لەهایدرۆجین و ئۆکسجین... بەلام لەگەڵ ئەو گوتە نەزۆکانەشدا هیگڵ گەلێ پیشبینی بلیمەتانەی خستنەڕوو. بۆنمونە نزیکبونەوەی لە تێگەیشتنی زانستیانەی کارەبا وەك شێوەیەك لەشێوەکانی جوڵەی مەتریال، بەڵگەی بۆ کاری یاسایی بوونی گۆڕانە چەندایەتییەکان بۆ چەندایەتییەکان بۆ چۆنایەتی لە پۆرسە کیمیاوییەکاندا ئەهێنایەوە.

بەلام بەشی سێیەم لە فەلسەفەی سروشت - ئۆرگانیکا لە مەسەلەکانی جیۆلۆجی و ، ڕووەك و ئاژەل ئەکۆلێتەوە...

هیگل بڕوا بە پەرەسەندنی ڕیالیستانەی مەتریالیزمی بابەتی بووە زیندوەکان ناکات:ئەو شێوە سروشتیانە هەمووی یەك لە یەك پەیدا نابن، بەڵکو هەریەکەیان بەرهەمی"ئیدیە ی مۆتلەق"ە. بەو جۆرە دیدی ئیدیالیستانەی کە دەڵێ مەتریال شتێکی بێ کارەیە و خامۆشەو لە گیان جیابوتەوە ، پاڵ بە هیگلەوە ئەنێ بۆ نکۆلی کردن لە پەرەسەندنی سروشت. هەرچەندە دیالیکتیکی گەیاندە ڕادەیەکی سەرووتر لە ئاستی مەتریالیستە میتافیزیکییەکان... بەلام هیگڵ لە دژی تیوری بەرزەپەرە کە زاناو فەیلەسوفەکانی ئەو سەردەمە خستیانە ڕوو ئەیووت: ئەو تیوەریەی کە دەڵێ: بووە زیندووە زیاتر پەرەسەندوەکان لە بووی پەرەسەندووی نزمتر پەیدا بوون تەنها قسەی پوچ و نەزوکە. هیگل ئەلا: " لەژێر خۆردا شتێکی نوێ لە سروشتدا

نییە،بۆیە ئەو هەمە چەشنە بێ سنوورە لە شێوەو وێنەیدا یارییەکی شەکەتکەرە. نوێ تەنها لەو گۆڕانە پەیدا ئەبێ کەبە سەر جیهانیگیانیدا ڕووئەدات"

ئیتر بەو فەلسەفەی سروشت لای هیگل هەرچەندە گەلآ پێشبینی بلیمەتانەی تیا بوو.بەڵام دوور بوو لە تێگەیشتنی دیالیکتیکی ڕیالیستی سروشت وەك یەك کۆی پێکەوە بەستراو، کە بەردەوام لە ئەنجامی ناکۆکییە هاوتاکەکانی ناوخۆی، ئەگۆڕێو پەرەئەسەنێ...ئنگلس پەنجە بۆ ئەوە ڕائەکێشێ کە سروشت کرد کە بەشی هەرە لاواز بێ لە سستێمە فەلسەفییەکەی هیگلدا.

بۆیە هیگڵ نەیتوانی لە تێگەیشتنی میتافیزیکی سروشت خۆی قوتار بکات، هەرچەندی لە هەندێ مەسەلەدا توانی خۆی بخاتە سەرووی ئاستی زانا سروشتییەکانی سەردەمی خۆی، ڕەخنەی ئاراستەی تێندێنسی تەسکی ئەزموونی و سەرەتای دەستپێکردنی میتافیزیکی ـ میکانیکی بۆ تێگەیشتنی دیاردەکانی سروشت... کرد.

**ـ فەلسەفەی گیان.**

فەلسەفەی گیان بەشی سێیەم لە سستێمە فەلسەفییەکەی هیگڵ پێك ئەهێنێ، ئەو فەلسەفەی گیانەش لە فرمانەکانی هیگڵ دەربارەی گیانی خۆیی (ئەنسرۆپۆلۆژی و، فینۆمینۆلۆژی و سایکۆلۆژی) و دەربارەی گیانی بابەتی (هەق ڕەوشت و دەولەت)و دەربارەی گیانی موتلەق، بەو پێیەی پلەیەکی بەرزتری هۆشی" ئیدیە ـ ی موتلەق"ە بۆ

خـودی خـۆی (هونـەرو ئـاین و فەلسـەفە) ئەنسرۆپۆلۆژیدا دەربـارەی پەرەسـەندنی تـاکیی پیرۆسـونالی مرۆڤایـەتی و دەربـارەی پەیوەنـدی گیان بە لەشەوە دەربارەی جیاوازی ڕەگەزو جیـاوازی تەمـەنی خـەڵك و دەربارەی حاڵەتی دروست و نەخۆشی و لەش دەربارەی شەقڵ و میـزاج و هـی تـریش ... قسـە ئـەکرێ.لای هـیگڵ - هـەروەك ڕوونـاکبیرانی فەرەنسا- جیـاوازی نێـوان مـرۆڤ و ئـاژەڵ و قـنج ڕۆشـتینە بـە پلـەی یەکەم،هەر چەندە ئیدیالیستانە ئەو ڕاستییەی لێکدایـەوە، سـەرنجی دا کـە بەڕاسـتی جیـاوازی ڕەگـەز هـیچ بەلگـە نییـە بـۆ تێندێنسـی ڕەگـەز پەرستی "مـرۆڤ خـۆی ئاقڵـە، ئـەوەش یەکسـانی هـەموو مرۆڤـی تیـا ڕەخساوە، ئیتر لێرەوە نـەزوکێتی بـیری دابەشـکردنی خـەڵك بـەخاوەن شـتی جیـاوازو بـەبێ بـەش لـە مـاف دەرئەکـەوێ"(٥٦).. هەرچـەندە ئـــەووت: نـــەژادو نەتـــەوەکان توانـــدنی پلـــەی پەرەســـەندنی"گیـــانی موتلـەق"ی جیاجیـان، بۆیـە نـاتوانرێ ئـەو جیاوازیانـە نـەهێلرێ هـەتا هەتایە هـەر ئـەمێنێ. دیسـان هـیگڵ وەکـو ئیـدیۆلۆگی بـورژوای لاوازی ئەڵـەمانی هـەوڵی ئـەدا ئـەوە بسـەلمێنێ کـە پێویسـتە پێشـکەوتنی کۆمەلایەتی هەر لەناو چوارچێوەی ئەو" سسـتێمە لـە ئارادایـە" بکـرێ. واتە لە ناو سستێمی دەرەبەگێتیدا، ئەووت وەستان بەرامبەر سسـتێمی کۆمەلایەتی تەنها پرکێشی گەنجەکانە، کەی ئەوانەی نزیـك بوونـەوە لـە ڕەسێوی وا ئەوەیان نامێنێ.

لەکۆلینەوەی لە پەرەسەندنی ئایندەی هۆشی سەڵت لە فینۆمینۆلۆژی و لە سایکۆلۆژیدا..ئەمە سەرەنجام ئەهێنێ:"گیانی بابەتی" لە سەر بنچینەی هۆشی سەڵتایەتی وەستاوە."گیانی بابەتی" یش لای هیگڵ پەیوەندییە هەمە جۆرەکانی ماف و رەوشت ئەگرێتەوە کە ئەم ئیدیۆلۆگە ئایدیالیستە ئەلمانییە خێزان و کۆمەلگەی شارستانی(پەیوەندییە ئابورییەکان) و دەوڵەتیش ئەگێرێتەوە ۆ ئەو گیانی بابەتییە...بەو جۆرە ئایدیالیستانە لە رەوشت ئەگات و بە ناوەڕۆکی ناوەکی و هێزی جۆلێنەری، نەك هەر پەیوەندییە یاسایەکانی دائەنێ و بەلکو ئەڵێ هی پەیوەنییە ماتریالیستی و سیاسییەکانیشە... لەگەڵ ئەوشدا تێگەیشتنی هیگڵ بۆ رەوشت و دەربارەی پەیوەندی پراکتیکی پەرەسەندنی سەرجەمی پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکانی ئەو سەردەمەی، تیایە.

لەبەر ئەوەشە ئازادی لای هیگڵ ناوەڕۆکی گیانەی بۆیە ماف بە بەئەنجامهێنانی بەبوونێکی راستەوخۆی ئازادی دائەنێ. بەو وتەیەش بەرامبەر بە زۆرداری ی دەرەبەگایەتی ئەوەستێ. بەلام هیگڵ شەقلی چینایەتی پەیوەندییە یاساکانی نەبینی کەلە راستیدا ئەو پەیوەندیانە رەنگدانەوەی ویستی چینی دەسەلاتدارە. بۆیە مۆلکداریەتی تایبەتی، بەرای هیگڵ رەوایە چونکە بە شێوەیەکی مێژوویی دیاری پەیوەندییەکۆمەلایەتییەکانی دانانێ، بەلکو بەجێبەجێ کردنێکی جەوهەری و پێویستیئازادی دائەنێ... بەهەمان رێگەی

تیۆربوونـەوەیی speculative هـیگڵ هـەوڵ ئـەدا هێلـە گشـتییەکانی "کۆمەلگـەی شارسـتانی " لـە تێگەیشـتەکانی مـاف هەڵبهێنجـێ و پەیوەندییە ریالیستییەکانی نێوان ستێمی ئـابوری و سـەرخانی کۆمـەڵ سـەرەوخوار هەڵبگێرێتـەوە... لـەوەدا دەوڵـەت بـە پلەیـەکی بـەرزی پەرەسـەندنی رەوشـتی بابـەتی و بنچـینەی رەسـەنی پەیوەندییـە ئابورییەکان دائەنێ. بەلام لەناو ئـەو قاوغـدا زۆر جـار پێشـبینی قـووڵ دەربـارەی جەوهـەری راسـتەقینەی پەیوەنییـە کومەلایەتییـەکانی ئەخاتەروو. بۆنمونە کەقسەلەسەر دامەزرانـدنی دەوڵـەتی کـۆنی یۆنـانی دەکات پەنجەبۆ پەرەسـەندنی توندتیـژی ناکوکییـەکانی نێـوان خـاوەن موڵك و رەش و رووتەکانی ناو کۆمەلگای کونی یونان رائەکێشێ.

نرخی پێشکەوتوانەی ئەو تێزەی هیگڵ لەرووی مێژووییەوە لەوەدایە کـە بەبەلگـە سـەلماندی کـە ئەبـێ خـەبات بکـرێ لـەدژی زۆرداریـی دەرەبەگایـەتی و لـە پێنـاوی دیموکراسـیدا. بـەلام هـیگڵ ئـازادیی، بەشـێوەیەکی سـەرەکی، بـەئازادی گیـان، ئـازادی بـیر، ئازادی ئـەقڵی پێرسونالـی تێئەگەیشـت کـە ئـەوەش لەرۆڵـی فاکتـەرە ئـابووری و سیاسییەکان کەم ئەکاتەوە کە دەستەبەری لـەناوبردنی چەوسـانەوەی دەرەبەگین.

هیگڵ مێژووی جیهان ئەکاتە سـێ پلەی سەرەکی: رۆژهـەلات، کـۆن Antique جەرمانی. لەجیهانی رۆژهەلاتدا مرۆڤ دەرکی بەوە نـەکردووە کە ئازادی جەوهەری مرۆڤ پێك ئەهێنـێ، بۆیە لێرە هەموو کۆیلە بـوون.

بەلام لە جیهانی کۆندا(یونانی کۆن و ڕۆما) هەندی ێکیان وتیان ئازادی جەوهەریان پێک ئەهێنێ بۆیە ئەوان ئازابوون. ئەم تێگەیشتنە ئایدیالیستانە بۆ کۆیلەیەتی، بە باروبۆخی ئابووری، کە خولقێنەرێتی، ئەخاتە لاوە... هیگڵ بەو ڕاگەیاندنانەی کە گوایە گەلانی جەرمەنی: بەتایبەت ئەڵمان، ئازادی خۆیان وەرگرتووە، هەرتەنها تێگەیشتنەی ئازادی ناشێوێنی بەس بەڵکو تا دوورترین ڕادەش ئەرکەکانی گۆڕانی دیموکراسی بۆرژوای و کۆمەڵگە تەسک ئەکاتەوە... دامەزراندنی دەوڵەتی پاشایەتی دەستووریی لای هیگڵ، لوتکەی پێشکەوتنی کۆمەلایەتییە، ئەوە تەقەلای بۆرژوای ئەلەمانیاش دەردەخات کە دەیویست لەگەڵ کۆنەپەرستی دەرەبەگێتی خۆی بگونجێنی. دیسان تێندێنسی کۆنەپەرستانەی فەلسەفەی مێژوویی هیگڵ لەوەدا دەردەکەوێ کە گەلانی جێرمەن بەتایبەتی ئەڵمانی بەمەزن دادەناو گەلانی خۆرهەلاتیشی بەسووک و دواکەتوو سەیر ئەکردو دەیووت ئەو گەلانە هەتا هەتایە هەروا دەمێننەوە، هیچ پاشەڕۆژێکیان نییە، کاتێ هیگڵ دەیەوێ ئەوە بسەلمێنێ کە" مێژوویی جیهان لە خۆرهەلاتەوە ئەچێ بۆ خۆرئاوا بۆیە ئەورووپا تەواو کۆتاییەکەی و ئاسیاش سەرەتاکەی پێک دەهێنێ" بەوە خیانەت لە دیالیکتیک دەکات چونکە دیالیکتیک نکوڵی لە وەستاوی موتڵەق و بەستراوی دەکات.

دەوڵەت لای هیگڵ لاشاندێکی ناویی ئازادی و تەدارەکی یەزدانە لەسەر زەوی. ئەم بیرە هەرچەندە دژی زۆرداری و دەرەبەگی و دژی

جیابوونەوەو separatism و ناوچەگەری particularism بوو، دیسان لە دژی خەباتی شۆرشگێڕانەی دژ بە دەوڵەتۆکە دەرەبەگایەتییەکانی ئەڵەمانش بوو. بۆیە ئەم تێگەیشتەیەی هیگڵ بۆ دەوڵەت جەوهەری چینایەتی دەوڵەت ئەشارێتەوە. دەوڵەت وەك ئامرازێك بۆ زاڵبوونی چینایەتی و دیکتاتۆرێتی چینی دەسەڵاتدار لە لای هیگڵ لە پشت دیوارێکی ئایدیالیستانەوە ون ئەبێ.

هونەرو ئاین و فەلسەفە- ئەوانە سێ شێوە بەرزەکەی هۆشیی " گیانی موتڵەق" ن، لەوانەدا مێژووی جیهانی ئەگاتە کەماڵ، لەوانەدا ئەقڵ بە تەواوی هۆش بەخۆی پەیدا ئەکات و ئاسودە ئەبێ. ڕاستە هیگڵ فەلسەفە ئەخاتە ئاستێکی بەرزتر لە ئاین، بەڵام ناوەڕۆکەی لە سەرنجامدا لەگەڵ ناوەڕۆکی فرمانە ئاینییەکان جووت ئەکات، چونکە بابەتی زانین لە هەردووکیاندا "بیری موتڵەق" ە کەلای فەلسەفەی هیگڵ مەبەستی یەزدان و لە هەمان کاتیشدا مەبەستی جیهانە پێکەوە . بەو جۆرە هیگڵ ئەو ناکۆکییەی لە نێوان زانست و ئاییندا هەیە چاوی لێ ئەپۆشێ.

لە فەلسەفەی گیاندا تێندێنسی کۆنپارێزو، کۆنەپەرست هەندێ جار بە ڕوونی ئاشکرا ئەبێ...بەڵام پێویستە ئەوە نرخی باشەی ئەم بەشەی فەلسەفەکەی هیگڵ و دانراوەکانی ، وە"فەلسەفەی مێژوو" و "فەلسەفەی هەق" و ئەوانی ترمان لێ نەشارێتەوە. ئەم دانراوانە زۆر بیری پێشکەوتوانەو پێویستی پەرەسەندنی بۆرژوای ئەڵەمانی و

پێشبینی بلیمەتانەی دیالیکتی تیایە. ئنگلس ئاماژە ۆ فەلسەفەی هەق و مێژووی فەلسەفەی هیگڵ ئەکاو ئەڵێ: " لەهەر مەیدانێك لەو مەیدانە جۆربەجۆرە مێژووییانەدا هیگڵ کۆشش ئەکات تا هێڵی پەرەسەندن بدوزێتەوە، کە بەم یان بەو مەیدانە دا ئەڕوات و بەڵگە ۆ ئەو هێڵە بهێنێتەوەو ئاشنای بکات"(٥٧).

## سستێم و بەرنامە لە فەلسەفەکەی هیگڵدا. ناوکی ئەقڵی دیالیکتیکی هیگڵ

لەفەلسەفەی هیگڵدا ئەبێ بەوردی جیاوازی بکەین لەنیوان بەرنامەی metod دیالیکتیکی هیگڵی (لایەنی پۆسەتیڤ لە فەلسەفەکەی) سستێمی system هیگڵی واتە کۆمەڵە ڕاکانی لەسەر سروشت و کۆمەڵ، بەو پێیەی دوو شێوەی بوونی"ئیدیە - ی موتڵەق" ەو لایەنە کۆنەپەرستانەکەی فەلسەفەکەیەتی. جا هەرچەندە لای هیگڵ سستێم و بەرنامە لە ڕووی ئۆرگانیکەوە پێکەوە بەستراون، لەگەڵ ئەوەشدا ناکۆکییەکی عاسێیان لە نێواندایە. سستێمەکەی هیگڵ - بە پێچەوانەی بەرنامە دیالیکتیکییەکەی - سنووری پەرەسەندنی زانین داناوەو دیسان تێگەیشتەی دیالیکتیکی و کۆمەڵ و بیر ئەشێوێنێ. هیگڵ هەروەك زوربەی فەیلەسوفەکانی پێش مارکسیزم ، لای وایە کە فەلسەفە لە زانستەکانی تر جیاوازە بەوەی کە: پێشکەشکردنی زانیارییەکی تەواوەتی و موتڵەق و کامل ، لە دەربارەی واقیع و دەربارەی جیهان

کراوەتـە ئـەرکی سەرشـانی فەلسـەفە. هـیگڵ فەلسـەفەکەی بـەو پێیەفورمولـە کـردووە کـە "زانسـتی زانسـتەکانە"، واتـە سسـتێمێك لـە ڕاستییە مۆتڵەقەکان،کە بە فەلسەفەی سروشت بەرەبەرەکانی زانستە سروشتیەکان و بە فەلسەفەی مێژوو بەرەبەرەکانێی مێژوو وەك زانست و بە فەلسەفەی هەق بەریەرەکانیی زانستی یاسای ئەکرد.. هتد. بەڵام ئەوە واناگەیەنی کە هیگڵ ناوەڕۆکی پۆسـەتیڤی زانستەکانی بەتـەواوی فەرامۆش کردووە، یان لای وابوبێ کە نابـێ فەلسـەفە ئـەو زانسـتانە لـە بەرچاو بگرێ.

پێشخواستی هیگڵ بۆ دانـانی سسـتێمێکی فەلسـەفی سـەرجەمی لـە ڕاستییە موتلەقەکان، سستێمێك کە نەك هەر بەرهـەمی زانستەکانی تـر پوخت بکاو بەس، بەڵکوو لە هـەموو ئـەو بەرهەمانـەی کـە زانستەکانی ئەتوانن لـە پاشـەڕۆژدا پێشـکەش بکـەن، تێپـەڕێ ، ئـەو تەقەلایـە هـەر پێشەکی بریاری سـەرنەگرتنی درابوو. ئـەوە نـەنگ یـا کـەمی نییـە کـە زانستە سروشتی و مرۆڤییەکان زانیارییەکی تەواوەتی پێشکەش ناکەن، بەڵکو بـە پێچـەوانەوە شـوێنەواری گرنگیـان لەوەدایـە کـە بەوڕادەیـەی پێگەیشتوون ڕازی نـابن و دەرك بـە پێویسـتی و توانسـتی بـەرەو شـتی نوێ دۆزینەوە چوون و زانینی یاسای نوێ ئەکەن . لەسـەر فەلسـەفەش پێویستە، بەو پێیە زانستێکە، وا سەیری ئەنجامـەکانی نـەکات کـە کـە موتڵەق و نەمرن و هیچ مشتومڕیا گۆرانێکی لە سـەر نـاکرێ. هـیگڵ کـە ڕەخنـەی لـە مەزەبـە فەلسـەفییەکانی پێشـوو ئـەگرت سـنورداریی

مێژووییانی دووباره ئەکردەوە، واتە ئەیووت نەکامڵ و نـەدوا فـۆرمیش. ویستی بسەلمێنێ کە زانیاری فەلسەفە و زانین بە گشتی ، پەرەئەسەنی بەردەوام دەوڵەمەند ئەبێ، کەچی سستێمە فەلسـەفییەکەی خـۆی لـەو پرنسیپە بەدەرکرد و بە لوتکەی پراکتێکی هۆشە"ئیدیە ـ ی موتلەق"ی ناوەڕۆکی خۆیی و بەدوا پلەی پەرەسەندنی ئەقڵی جیهانیی دانا.

لـە کاتێکـدا دیـالیکتیکی هیگڵـی ئـەوە دووبـارە ئەکاتـەوە کـە، پەرەسەندن، سەرجەمی و گشتییە، کەچی سستێمەکەی خۆی نکۆڵی لـە سـەرجەمی پەرەسـەندن ئـەکات . سروشـت لای ئـەم لـە زەمانـدا پەرەناسەنێ، بەڵکو تەنها لە زەمیندا جۆر بەجۆر ئەبێ. ئەو ناکۆکییـەی لـە نێوان نـاوەڕۆکی سسـتێم و بنیـاتکردنی Structure و سـەرەنجامە سـەرەکییەکانی... لەگـەڵ بەرنامـەی دیالیکتیکیـدا هەیـە، دیسـان لـە فەلسەفەی گیان و لە لۆژیکدا، کە بۆ ڕووخستنی بەرنامـەی دیـالیکتیکی تـەرخان کـراوە دەبینـرێ. چـونکە هـیگڵ وا نـاوەڕۆکی دۆگمـای سستێمەکەی خستەروو کە ڕاستییەکی موتڵەقەو جێگەی مشتومڕ نییە.

هەروەها ئەنگلس پەنجە بۆ ئـەوە ڕادەکێشـێ کـە دیـالیکتیکی هـیگڵ هەروەها سستێمەکەی ، لە زۆر شوێن، پەیوەندییە ڕیالیستەکانی جیهان ئەشێوێنێ. هیگڵ بەو پێیەی ئیدیۆلۆژی بۆرژوای ئەڵەمانی ناشۆرشگێڕە . ناچارە داواو ئەنجامە شۆرشگێڕییەکان ، کە لـە ڕووی لۆژیکییـەوە لـە دەروازەی دیالیکتیکی بەرەو"بوون" هەڵدەقوڵێن ، بە سنوورو بێلایـەن بکات.

کلاسیکییەکانی پێش مارکسیزم ـ لینینیزم دیاردیان بۆ ئەوە کردووە کە هیگڵ دیالیکتیکی ناچار کردووە کە لەگەڵ سستێمە کۆنپارێزەکەیدا خۆی بگونجێنێ ، ئەوەش لە هەندێ لایەن و شەقڵی میتافیزیکی بەرنامە دیالیکتیکییەکەی خۆیدا ڕەنگی داوەتەوە .دیالیکتیکی هیگڵی بیرو زانین بەوە دانەنێ کە تاکە ڕێگەی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانە، بەوەش چاو لەو ڕۆڵە ئەپۆشێ کە ململانێی دژەکان وازی ئەکەن. دیسان دیدی دیالیکتیکی ئایدیالیستی هیگڵی بۆ یەکێتیی دژەکان یەك لایەنی بووە.، بە جۆرێك کە تێگەیشتەی بۆ ئەوە ، توندیی ململانێی دژەکان و یاسای نەفی کۆن نەك پارێزگاری بکرێ.

ئەی کەوابوو ناکۆکی ئەقلی دیالیکتیکی ئایدیالیستانەی هیگڵی لە کوێدایە؟

لە ڕاستیدا پێش هەموو شتێك لەو پێشبینییە بلیمەتانەیدایە کە دەربارەی پەیوەندی دیاردەکان و جوڵەیان و پەرەسەندنیانەو دەربارەی ناکۆکییە، وەك سەرچاوەی جوڵان و پەرەسەندن و دەربارەی بونی گۆڕانی چەندایەتییە بۆ چۆنایەتی و دەربارەی سروشتی بیری تیوری و شێوەکان و واتا لۆژیکییەکانە کە لەناویانەوە ئەو بیرە تەواو دروست ئەبێت. لینین ئەڵێت: هیگڵ" بە بلیمەتیی خۆی توانی دیالیکتیکی شتەکان (دیاردەکان، جیهان، سرۆشت) لە دیالیکتیکی تێگەیشتەکان بخەملێنێ "لینین قسەکەی تەواو ئەکات و ئەڵێ:" هەر خەملاندن بوو، زیاتر نەبوو"(٥٨).

دیسان تێگەیشتنی هیگڵ بۆ بەرنامەی زانست نرخێکی زانستیانەی گەورەی هەیە. هیگڵ لە دژی تێگەیشتەی میتافیزیکی بەرنامە بوو... بەرنامە لای ئەم شتێك نەبوو کە خواستمان چونی بۆێ بە ئارەزووی خۆی بسەپێنێ... بەڵام ناوەڕۆکی بابەتیی بەرنامە لە لای ئەم لە ناو تەومژی سۆفیتیدا ون ئەبێ: زانین لای هیگڵ تەنها چالاکی "ئیدیە ی موتڵەق"ە بۆیە بەرنامە ئەبێ بە جوڵانەوەی خۆیی بۆ ناوەڕۆکی پرۆسەی لۆجیکیە .

بە پێچەوانەی تەقەلای دوگمی گەیشتن بە ڕاستی موتڵەق، هیگڵ ئەیسەلمێنێ ـ هەرچەندە لە بەرگێکی ئایدیالیستی سەقەتدایە ـ کە پرۆسەی زانین پرۆسەیەکی مێژوویی، ڕاستیی ئەنجامێکی ئامادەکراو نییە بۆ زانینی کە بەیەکجاری درابێ و ئتر هەتا هەتایی بێ، بەڵکو پەرەئەسێنێ و یەکبینە لە گۆڕاندایە. هیگڵ هەروەك لینین پەنجەی بۆ ڕاکێشا "خواستی لۆژیك بووە کە شێوەکان Formen Gchaltrolle شێوە بن بۆ ناوەڕۆکی ڕیالیستی ، زیندوو، کە لەناوەڕۆك جودا نەبێتەوە"(٥٩).

بەو جورە ناوکی ئەقڵی دیالیکتیکی ئیدیالیستی هیگڵی ، لەو ژمارە زۆرەی ئەو بیرانەوەیە کە پەیوەندییان بە زانینی یاسا زیاتر سەرجەمییەکانی پەرەسەندنی سروشت و کۆمەڵ و زانین، بە تلیبەتی تیوری زانین و لۆژیك ـ ەوە هەیە. بەڵام ئەو تێزانە کە هیگڵ بە شێوەیەکی ئایدیالیستانە خستونییە ڕوو... چارەسەری زانستیانەیان

نەكراوە هەر لەفەلسەفەی ماتریالیزمدا نەبێ كە ماتریالیستانە بەرنامەی دیالیكتیكی بەكاردەهێنێ.

ماركسـیـیە كلاسـیكییەكان چارەسـەری ماتریالیسـتانەی بـیرە پۆسەتیڤەكانی دیالیكتیكی ئایدیالیستی هیگڵیان كرد بـە پـەیرەوكردنی ئەو پرەنسیپەی كە ئەڵێ: هۆشی مرۆڤ ڕەنگدانـەوەی واقیعی بابەتییـە كە لـەدەری ئـەو هۆشـەدایە و بەشێوەیەكی سـەربەخۆیە لێـی. دیسـان ماركسـیـیە كلاسـكییەكان دیالیكتیكیـان لـە كولینـەوەی پروسـەی ڕەنگدانەوەدا بەكار هێنا بۆ ئەوەی تیوری ماتریالیزمی ـ دیالیكتیكی لـە زانین و لۆژیكی ماتریالیستی ـ دیالیكتیكی بابەتیی باو لە سروشت و لـە كۆمەڵدا دابنێ. بەڵام ئەوە مانای دانانی بەرنامەیـەكی نۆێیـە بـۆ زانینـی واقیع ، كە لە بنەرەتدا پێچەوانەیە لە گەڵ بەرنامەكەی هیگڵدا.

# بەشی هەشتەم

- فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵەمانی:
- مەتریالیزمی ئەنسرۆپۆلۆژی فۆیرباخ
- هەڵوەشانەوەی قوتابخانەی فەلسەفەی هیگلیی.
- مەتریالیزمی فۆیرباخ ـ گرنگترین ئەنجامەکانی هەڵوەشانەوەی قوتابخانەی هیگلیی بووە.
- فۆیرباخ و ئەرکەکانی "فەلسەفەی نوێ".
- ڕەخنە لە فەلسەفەی ئیدیالیزم.
- ڕەخنە لە ئایین.
- تێگەیشتنی مەتریالیستانەی سروشت.
- تیۆری زانین.
- پەرەپێدانی ئایندەی مەزەبی هەستیی.
- ڕا کۆمەڵایەتی و ڕەوشتییەکان.

## فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵەمانی: مەتریالیزمی ئەنسرۆپۆلۆژی فۆیرباخ

## هەڵوەشانەوەی قوتابخانەی فەلسەفەی هیگلیی.

لۆدفیخ فۆیرباخ دوا نوێنەری مەزنی فەیلەسوفە کلاسیکییە ئەڵەمانییەکان بوو. شوێنەواری مێژوویی هەڵکەوتی فۆیرباخ لەوەدایە کە ڕەخنەی قوڵی لە ئیدیالیزمی کانت و هیگڵ و فەیلەسوفەکانی تر گرتووە. ئەریتە پێشکەوتووەکانی مەتریالیزمی سەدەی هەژدەیەمی بورژواندۆتەوە پەرەپێداوە. بە پێچەوانەی نوێنەرەکانی تری فەلسەفەی کلاسیکی ئەلەمانی کە ئیدیالیست بوون. ئەم

مەتریالیستێکی تێکۆشەر بوو. لەگەڵ ئەوەشدا زەحمەتە لە مەتریالیزمی فۆیرباخ بگەین بێ لەبەرچاو گرتنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ پەرەسەندنی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵەمانی لە سەردەمی پێشوتردا.

ئەو دۆخە شۆڕشگێڕانەی لە چل و پەنجاکانی سەدەی نۆزدەیەم لە ئەڵەمانیادا پێگەیی، بووە هۆی بەربڵاوی توندوتیژی ململانێ لە نێوان چینی بورژواو کۆنەپەرستی دەرەبەگایەتیدا. لە کاتێکدا کە ئەڵەمانیا لە ڕووی ئابوری و سیاسییەوە بە دابەشکراوی مابووەوە، بورژوای ئەڵەمانی جارێ هێزەکانی خۆی لەسەر ئاستی نەتەوەی ئەڵەمان یەک نەخستبو.

بەڵام بەربڵاوی و گەورەبوونی ناکۆکییەکان لە نێوان سەرمایەداری باڵاکردو لەگەڵ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە دەرەبەگییە ڕزیوەکاندا پاڵپێوەنانێکی بەهێز بوو بۆ بەربەرەکانی چینی بورژوا لەدژی ستێمی زۆرەملێی دەرەبەگایەتی، دیسان دەوڵەتە دراوسێکانی کە لەرووی ئابوری و سیاسییەوە پێشکەوتوتر بوون یارمەتی ئەوەیان دا، بە تایبەتی فەرەنساو جوڵانەوە ڕوناکبیرییەکەی.

پەرەسەندنی بورژوای ئەڵمانی و هەڵوەشانی میرنیشین و دەوڵەتۆکە زۆرەکان، دروستکردنی دەوڵەتێکی ئەڵمانی یەکگرتوویان ئەخواست. بۆیە ئیدیۆلۆگەکانی بورژوای ئەڵمانی کە داوای یەکگرتنی ئەڵمانیایان ئەکرد، بەوە خواستی دەسکەوتی نەتەوایەتی هەموو گەلی ئەڵمانیان دەربڕی. بەڵام ئەیان ئەوێرا بەربەرەکانیی ڕاستەخۆو لەڕوو لەدژی دەوڵەتی دەرەبەگێتی و دامودەستگا ڕامیارییەکانی ئاشکرا بکەین، بەڵکو ئەو بەربەرەکانییەیان لە شێوەی ڕەخنەی فەلسەفییانەی لە ئایینی مەسیحی ئەرسۆزۆکسی دارشت.. کە ئەوەش لە ناوەڕۆکدا ڕەخنەگرتن بوو لە کۆنەپەرستیی سیاسی، چونکە لەو سەردەمەدا ئایین ئایین ئایدیۆلۆژیی زاڵ و باو بووە، جگە لەوەی کە دەوڵەتی دەرەبەگێتیش بە ڕەسمی بەخۆی ئەووت مەسیحی.

گەورەو قوڵبوونی ناکۆکییەکان لە نێوان بورژواو بەشە دەرەبەگە دەسەڵاتدارەکاندا لە هەڵوەشانی قوتابخانەی فەلسەفی هیگڵدا ڕەنگی دایەوە. ناکۆکی نێوان سستێم و بەرنامە لە فەلسەفەکەی هیگڵدا

ئەگەڕایەوە بۆ ڕەگوڕیشە قوڵەکانی کۆمەڵایەتی ئابوری. بۆیە شتێکی سەیر نەبوو کە دوای مردنی هیگڵ خێرا ململانێ لە نێوان باڵە شۆڕشگێڕو کۆنپارێزەکانی ناو لایەنگرانی فەلسەفەی هیگڵیی دەربکەوێ.

باڵی ڕاست ـ ناونران هیگڵییە پیرەکان ـ کە سستێمی کۆنپارێزی هیگڵیان کرد بەڕێبازی خۆیان، لەوانە (گابلەر، هۆش، هینریخ، داوب). بەڵام نوێنەرانی باڵی چەپ: هیگڵییە لاوەکان "بوو (شتروواس، باویر، شتێرنر هی تر) کە بەشێوەیەکی سەرەکی بەرنامەی دیالیکتیکیی هیگڵیان کر بە ڕێبازی خۆیان.

هیگڵییە لاوەکان هەوڵیان دا سەرەنجامی خوانەناسی و شۆڕشگێڕانە لە فەلسەفەکەی هیگڵ هەڵبهێنجن، بەپێچەوانەی ئەو بۆچونەی هیگڵ کە ئەڵێ فەلسەفە ـ بەپێچەوانەی ئاین ـ ڕاستیی لە شێوەی تێگەیشتەدا دەرئەخات، واتە لەڕووی زانستییەوە، ئینجا شێوەی بەرزی هۆشی گیانی موتڵەت بۆ خودی خۆی نوێنەر ئەکات... ئەمانە هێرشێکی توندو ڕێکوپێکیان لەدژی فرمانەکانی ئایینی مەسیحی کرد. ئیسان بە پێچەوانەی هیگڵ، تێزەکەی فیختە دەربارەی توانستی تەواوەتی هۆشی خۆی ـ ی واقیع گۆڕیان خستە پلەی یەکەم. بەو مانایە فەلسەفەکەیان "فەلسەفەی کار" یان ئاشکرا کرد. بەڵام هەر زوو دەرکەوت کە بانگەوازی ئەو لاوانەی بۆ جەماوەری گەڵ نەبوو، کە ڕەگەزی سەلبیی مێژوکردیان تیا بەدی نەکرد، بەڵکو بۆ دەسەڵاتداریی میری بووە، کە بۆ

وەرگرتنی جڵەوی دەسپێشخەری مێژوویی بۆ گۆڕانە دیموکراسییە - بورژواکان هیگڵییەکان پشتیان پێ دەبەست.

دانراوەکەی شتراوس "ژیانی یەسوع" (١٨٣٥ - ١٨٣٦) بانگی لێکداپچڕانی قوتابخانەی هیگڵیی بوو، تیایا لەسەرچاوەی ئەفسانەکانی ئینجیل ئەکۆڵێتەوەو تەنها بە ئەفسانەو داهێنانی خۆکاری جەماوەری گەلی دائەنێ نەك هی یەك کەس یا کۆمەڵێکی ئایینی بێ. لێکدانەوەی بۆ دیدی ئایینی دروست کردنی جیهان لەو تێگەیشتە هیگڵییەوە بوو بۆ جەوهەری پەرەسەندن و لە ڕووی مێژوویییەوە. هەرچەندە شتراوس نکۆڵی لە بوونی مێژوویی مەسیح نەکردو ئایینی مەسیحیشی، لە جەوهەردا، بە جوتبووی ڕاستیی پایەبڵندی فەلسەفی دانا.

برنوباویر قۆناغیچکی دوورو درێژی لە ڕەخنەی ئایینی مەسیحیدا بڕی... لە ڕاکانی هیگڵ لە سەرهەڵشی خۆوە دەست پێ کردووە. لە "ڕەخنە لە مێژوی ئینجیلی قدیس یۆحننا" (١٨٤٠) "ڕەخنە لە مێژوی ئینجیلی سینۆبتییەکان" (١٨٤١ - ١٨٤٢ دا باویر نکۆڵی لە هەبوونی مێژوویی مەسیح ئەکات، هەروەك شتراوس ئایینی مەسیحی و (ئایین بە گشتی) بە بەرهەمی پێویستی پەرەسەندنی گیانیی مرۆڤایەتی دائەنێ. باویرو هاوڕێکان ئاینییان بەهێزی سەرەکی چەوسانەوەی مرۆڤ و شەکەتکردنیان دائەنا. لە چەوساندنەوەی ئایینی، کۆیلەیەتی ئابوری و سیاسی و ماف و ڕەوشتە دەرەبەگایەتییەکانیان سەرەنجام هێنا، بۆیە هیگلیە لاوەکان هەموو گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکانیان ئەگێڕایەوە بۆ

ڕزگاری ئایینی و بۆ کڵێسە جیاکردنەوە لە دەوڵەت و بۆ سەرفرازبوون لە هۆشی ئایینی و ڕەخنەگرتن لە ئایین و واهیمەکانی. بەڵام جوڵانەوەی ئەو لاوە هیگڵیانە کە لەسییەکاندا ڕۆڵێکی پێشکەوتوانەیان وازی کرد، لە نیوەی یەکەمی چلەکانەوە ئەو سروشتە پێشکەوتوانەیان لە دەست ئەدا.

**ـ مەتریالیزمی فۆیرباخ ـ گرنگترین ئەنجامەکانی هەڵوەشانی قوتابخانەی هیگڵی بوو.**

لۆدڤێخ فۆیرباخ (١٨٠٤ ـ ١٨٧٢* لە خێزانێکی پارێزەری بەناوبانگ لە دایک بووە. لە سەرەتای لاوێتیدا ئەیویست خۆی بۆ لاهوت تەرخان بکات، ساڵێك لە زانستگای لاهوت خوێندویەتی (١٨٢٣)و ئیتر وازی لێ هێناوەو چووە بۆ بەرلین و گوێی لە موحازەرەکانی هیگڵ گرتووە. لە ساڵەکانی ١٨٢٧ و ١٨٢٨دا دەستی کردووە بە گومانکردن لە یەقینی ڕاکانی هیگڵ دەربارەی بنچینەی لۆجیکی سروشت. لەگەڵ ئەوەشدا لە پەیامەکەیدا "دەربارەی ئەقڵی سەڵتی و، سەرجەمی و بێ سنور" (١٨٢٨) هێشتا لەسەر زەمینەی ڕیالیزمی بابەتی وەستاوە. دوای دووساڵ لە دەرس وتنەوە لە زانکۆی ئەرلانجین لەسەر بڵاوکردنەوەی "چەند بیرێ لەمەڕ مردن و نەمری" دەرکرا.. لە ساڵی ١٨٣٠ بەدواوە گۆشەگیر ژیاوەو دانراوەکانی لەسەر فەلسەفە ئامانجی خۆی

لەرزگارکردنی مرۆڤ لە چنگی هۆشی ئاینییدا دەستنیشانکرد. لە ساڵی ١٨٢٩دا بەتەواوی خۆی لە ئیدیالیزم سەرفراز کرد. لە دانراوەکەیدا "رەخنەی لە فەلسەفەی هیگڵ" فۆیرباخ چارەسەرێکی مەتریالیستانە ئەدا بە مەسەلە بنچینەییەکەی فەلسەفە، سروشت یا بوون یان مەتریال بە واقیعێك دائەنێ کە بەپێویستی، ئەقڵی بیرکردنەوەی لێوە پەیدا ئەبێ. لە ساڵی ١٨٤١دا دانراوە سەرەکییەکەی "جەوهەری مەسیحییەت"ی بڵاوکردەوە ئینجا "بابەتی سەرەتایی بۆ چاککردنی فەلسەفە "(١٨٤٢)و" بنچینەکانی فەلسەفەی ئەقڵ ی لە (١٨٤٢)دا بڵاوکردەوە. فۆیرباخ هاوبەشی شۆرشی (١٨٤٨)ی نەکردو خۆی بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی وەك نوێنەری فرانکۆرت نەپاڵاوت.

لەرۆژانی شەپۆلی شۆرشگێرپیدا، فۆیرباخ چەند دانراوەیەکی بڵاوکردەوە بەلام هیچ بایەخێکی پێ نەدرا، چونکە بورژوای ئەڵەمان رووی لە فەیلەسوفە گەورەکەی خۆی وەرگێرابوو لەوکاتەشدا پرۆلیتاریا، بەهۆی گەشەکردنی هۆش و رێکخستنی، ئەچوە ژێر پەرچەمی ئەوبیرەی کە مارکس و ئنگلس ئاڵاکەیان هەڵگرتبوو.

لە کاتەکانی پێش کۆتایی ژیانی، فۆیرباخ رووی کردە سۆسیالیزمی زانستی. لە "سەرمایە"ی مارکسی کۆڵیەوەو لە ساڵی ١٨٧٠دا بووە ئەندامی پارتی دیموکراتی سۆسیالیست. بەلام لەگەڵ ئەوانەشدا گەیشتە ژیانی مەتریالیزمی دیالیکتیکی و مێژویی. تا کۆتایی ژیانی وەکو یەکێ لە دەرکەوتوترین زاناکانی ئیلحادو مەتریالیزمی پێش مارکس مایەوە.

## ـ فۆیرباخ و ئەرکەکانی "فەلسەفەی نوێ"

فۆیرباخ فەلسەفەکەی خۆی بەتەواوکەرو، لەهەمان کاتدا بە بەجێهێڵەری فەلسەفەکەی هیگڵ و فەیلەسوکانی پێش خۆی دانەنا. ئەگەر هیگڵ ئەقڵ یا بیری لە مرۆڤ لە چالاکی هەستی و پێویستییەکانی دانەبڕێ، وا "فەلسەفەی نوێ" یا "فەلسەفەی پاشەڕۆژ" ـ هەروەك فۆیرباخ ئەو ناوەی لە فەلسەفەکەی خۆی نابوو ـ لە مرۆڤەوە هەنگاو ئەنێ و مرۆڤ، بەتەنها مرۆڤ، خودی ڕاستییە بۆ ئەقڵ و مرۆڤ خۆشی بەرهەمی سروشتە.

فۆیرباخ بەفەلسەفەی تێوربوونی ئەقڵی بەرپەرەکانی زانستە ئەزموونییەکانی ئەکرد بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە ئەبێ فەلسەفەش لە پێدراوە هەستییەکانەوە دەست پێبکات. پایەگاکانی هەست دیسان پایەگای فەلسەفەشن.

ئایین بەڵێنی ڕزگاری دوا مردن بە مرۆڤ ئەدات. بەڵام ئەرکی فەلسەفە بەدیهێنانی ئەو خواستانەیە لەسەر زەوی. کە ئایین بەڵێن ئەدا لەجیهانی غەیبیدا جێبەجێیان بکات، کە لە ڕاستیشدا نین. لەسەر فەلسەفە پێویستە جێگەی ئایین بگرێتەوە تا ـ لەبری دڵخۆشکردنی وەهمی ـ توانستی زانینی توانا ڕاستەقینەکانی گەیشتنە بەختیاری مرۆڤ بدات.

فۆیرباخ لەدژی تێگەیشتەی ئیدیالیستی بو بۆ بیر کە گوایە جەوهەرێکە لە دەوری مرۆڤ و سروشتدایەو ئەوەی دووبارە کردەوە کە

مەسەلەی پەیوەندی بیربەبوون لەهەمان کاتدا مەسەلەی ماهییەتی مرۆڤە، چونکە مرۆڤ تەنها بوونێکە کە بیرئەکاتەوە. بۆیە ئەبێ فەلسەفە مەسەلەی پەیوەندی بیر بەبوونەوە وەلام بداتەوە ئەبێ فەلسەفەیەکی ئەنسرۆپۆلۆژی بێ، ولتە مەزەبێك بێ لەمرۆڤدا کە لەبوون و لەچالاکی خۆیدا ئەم مەسەلەیە چارەی ڕیالیستی و بەکرداری خۆی وەدەست دەهێنێ. فۆیرباخ ئەڵێ: یەکێتی بوون و بیر، تەنهاو تەنها لەوکاتەدا ڕاستییەو خاوەن ماناشە کە مرۆڤ وەك بنچینەی ئەو یەکێتییەو خودی خۆی وەربگرێ"(٦٠).

ئەو زانستانەی لە چالاکی مرۆڤ ئەکۆڵنەوە واتەکانی ئیدیالیزمی تیۆردبوونەوەی Speculative لە دەربارەی بیروگیانیی، بەگشتی، بەتەواوی بەدرۆ ئەخەنەوە. ئەو زانستانە بەتایبەتی فیزۆلۆجیا، ئەو پەیوەندییە ئۆرگانیکەی کە بیربەو پرۆسە مەتریالیستانەی بەناو لەشدا ئەڕۆن بە دەرکە هەستییەکانی جیهانی دەرەکی.. هتد.. ئەبەستێتەوە. مرۆڤ لە سروشت جیا ناکرێتەوە بۆیە کارێکی هەڵەیە کە بەجیهانی گیانی مرۆڤ بەو پێیەی واقعێکە بۆ خۆی هەیەو بەرزترو بلندترو بلندترە لە سروشت، بەربەرەکانیی سروشت بکرێ. فۆیرباخ ئەڵێ: ئەم فەلسەفە نوێیە. مرۆڤ بە سروشتیشەوە، وەك بناغەیەك بۆی، ئەکاتە تاکە بابەتی سەرجەمیتر بۆ فەلسەفە، لەدوایشدا ئەنسرۆپۆلۆژی بە فیزیۆلۆژیشەوە ئەکات بە زانستێکی سەرجەمی"(٦١).

ئیتر بەو جۆرە فۆیرباخ دەستی کرد بەدانانی تیۆرییەکی مەتریالیستانە دەربارەی مرۆڤ کە لەسەر زانستی فیزۆلۆژی و سایکۆلۆژی - مرۆڤ بوەستێ. بێگومان ئەم تێگەیشتنەی بابەتی فەلسەفی، مۆرگی یەك لایەنەی هەلگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا رۆڵێکی پێشکەوتوانەی گەورەی بینی لە خەباتی دژ بەراکانی هیگڵ کەبیری دەکرد بە خواوەند.

فۆیرباخ نەیدەویست فەلسەفەکەی بە مەتریالیزم ناو بنرێ، چونکە لەشەست و حەفتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، لەناو ڕیزەکانی بورژوای ئەڵەمانیدا بیرەکانی ناوبراو کە مەتریالیزمی باو Uulgar (بیوشنر، فوخت، مولیشوت)، کە بیری بە شێوەیەکی تایبەت لە شێوەکانی مەتریال، کە دەماغ دەری ئەدا دائەنا. ئەوەش وای لێکرد کە تەنانەت ناوی (مەتریالیزم) نەبات، دیارە بەمەش دودڵیی ململانێی بەرامبەر ئیدیالیزم دەرئەکەوێ، فەلسەفەی مەتریالیزمی پێشو وەستاوە.

شەقڵی جیاواز کەری مەتریالیزمی ئەنسرۆپۆلۆژی فۆیرباخ لەوەدا خۆی ئەنوێنێ کە نکۆڵی لە دوانەیی Dualism لەش و گیان ئەکات، لەوەدایە کە دانیپێدائەنێ و ئەیەوێ بیشیسەلمێنێ کە تێزی مەتریالیزم لە یەکێتی گیانیی و لەشیی، خۆیی و بابەتی، دەرونی و فیزیکی، بیروبوندا ڕاستە. بەڵام ئەنسرۆپۆلۆژییەکەی فۆیرباخ بە ڕوخستن و چارەسەرێکی دیاریکراو بۆ مەسەلەی بنچینەیی پرنسیپی ئەنسرۆپۆلۆژی، بەرای فۆیرباخ لەسەر لێکدانەوەی زانستانەی هۆشی

کۆمەڵایەتی کە لەوەدا ڕەنگدانەوەی ماهییەتی مرۆڤ نەبینێ، وەستاوە.
بەڵام ئەو ماهییەتە چییە؟ پێش هەموو شتێك ئەو هەستیاری ـ یە، ژیانی ئەقڵ و دڵ و هەموو جۆرە هەستاندنەوەو سۆزی مرۆڤە، هەستاندنەوەی سەڵت کە ئەویندارەو ئازار ئەچێژێ و پەرۆشی بەختەوەرییە. بەو جۆرە فۆیرباخ لە پلەی یەکەمدا لە شێوەکانی هۆشی جۆربەجۆری کۆمەڵایەتی و ئاین لەباری سەرنجی ناوەڕۆکی ژیانییەوە کە لەناویدایە، ئەتوێژێتەوە. بەوجۆرە ئەم فەیلەسوفەمان هەنگاوێکی گەورە بەرەو پێشەوە ئەنێ بە بەراورد لەگەڵ مەتریالیستەکانی پێشوو کە ئەیانووت ئاین ـ بەو پێیەی کۆمەڵی دیدی خەیاڵییە ـ هیچ ناوەڕۆکێکی ڕیالیستی تیانییە. ئەوە لەکاتێکدا کە فۆیرباخ کارە لە ئاسا بەدەرەکانی سروشتی بۆ سروشت خۆی هی خەیاڵی بۆ واقع و سەرو هەستپێکراوی بۆ هەستپێکراوی دەگێڕایەوە، جیاوازیی بنچینەیی بەرنامە ئەنسرۆپۆلۆژییەکەی فۆیرباخ ئالەوەدایە.

ئەنسرۆپۆلۆژییەکەی فۆیرباخ سەرەتاکانی تێگەیشتنی مەتریالیستی مێژوویی و تەقەلای لێکدانەوەیەکی مەتریالیستانەی ئاینییە، بەو پێیە ڕەنگدانەوەی ژیانی مەتریالیستییە. بەڵام ئەم ژیانە مەتریالیستییە، هەر بەتەواوی وەك ماهییەتەکەی مرۆڤ، فۆیرباخ بەتێگەیشتنێکی پەتیی لە دابەشبونی کۆمەڵ بەچەند چینێکەوەو شتی تریش تێیدەگات...

- ڕەخنە لە فەلسەفەی ئیدیالیزم.

فۆیرباخ لە دەرکەوتوترین ڕەخنەگرەکانی فەلسەفەی ئیدیالیزم بوو، بە وێنەیەکی ڕەزامەندانە تاوانی وەرگرتنی هەڵوێستی دۆگمای، "بێ ڕەخنەگریی" کە ئاراستەی فەلسەفەی مەتریالیزم کرابوو، پوچەڵ کردەوە... دیسان ویستی بیسەلمێنێ کە ئەقەڵای فەیلەسوفە مەتریالیستەکان بۆ بەڵگە هێنان بۆ لێک لێبونەوەی بونی جیهانی دەرەکی، یان سروشت، لەبیر، یاهۆش و شتی تر، هەر لەدیدی ئیدیالیستی نابینی بێ ڕەخنە دەربارەی بوونی یەکەم هۆی لە ئاسا بەدەر- دەوەیە. بەوجۆرە ئەوە دێتە ئەنجام کە فەلسەفەی ئیدیالیزمی تێوردبونەوەیی Speculative نکولی لە بونی سروشتی ئەکا کە بەشێوەیەکی سەربەخۆ بێ لە لەش، چونکە گیانێکی لە ئاسا بەدەر لەسەر سروشت ئەسەپێنێ. فۆیرباخ ئەیسەلمێنێ کە ئیدیالیزم لە ڕیالیستەوە دەرناچێ، بەڵکو - بەبێ هیچ بناغەیەک - چاو لە پێدراوە هەستییەکان، لە دوایشدا لە شتە ڕیالیستەکان کە بەپایەگاکانی هەست پەییان پێدەبرێ. لێرەدا فۆیرباخ بەگشتی لە دژی جەردکردن ناوەستێ بەڵکو تەنها لەدژی بەکارهێنانی شێوەی ئیدیالیستانەی سەقەت دەوەستێ.

سەرەنجامی ڕەخنەی فۆیرباخ لە ئیدیالیزم، گەیشتە ئەوەی بڵێ فەلسەفەی ئیدیالیزم تەنها لاهوتێکی تێوردبوونەوەیەو هیچی تر.

فۆیرباخ فەلسەفەی ئیدیالیزمی تیۆردبوونی لەگەڵ لاهوت یەکسان ناکات... فەلسەفەی تیۆربەنی، خوا ئەکات بەگێتنی بێ پێرسونالی، ئەوەش ماهییەتی ناوەکی خۆیەتی. بەوجۆرەش فەلسەفەی تیۆربونی رێگە بۆ پانتیزم Pantism خۆش ئەکات، واتە جوت کردنی خوا لەگەڵ سروشت و، ئینجا نکوڵی کردن لە خوایەتی Theism بەوپێیەی فەلسەفەکەی هیگڵ بەخواکردنی مەتریالیستە، بەلام فەلسەفەی سپینۆزا پانتیزمی مەتریالیستییە.

مارکسیست ـ لینینیستە کلاسیکییەکان بەرز رەخنەی فۆیرباخ لە فەلسەفەی ئیدیالیزم بە تایبەتی رەخنە لە مەتریالیزمی کلاسیکی ئەڵەمانی یان هەڵسەنگاندووە. لە هەمان کاتدا پەنجەیان بۆ کەموکورتییەکانی ئەو رەخنەیە درێژ کردووە. ئەو رەخنەیە بەشێوەیەکی سەرەکی، لەمەڵبەندی مەتریالیزمی میتافیزیکییەوە گیراوە، ئەم کارەش بووە هۆی ئەوە کە فۆیرباخ نەك هەر ئیدیالیزمی هیگڵیی و بەس بەڵکو بەرنامە دیالیکتیکەکەشی بخاتە لاوە. دیسان فۆیرباخ نەیتوانی "ناوکی ئەقڵی لە دیالیکتیکی هیگڵ جیابکاتەوەو دەرکی بە پێویستی دانانی دیالیکتیکی نوێ و مەتریالیستی نەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا رەگەزی دیالیکتیکی لە مەزەبەکەی فۆیرباخدا هەبوو، بۆنمونە باوەری بەشەقڵی بابەتی نەفی هێناو دەربارەی کۆن و نوێ و نەفی نەفی، بەهەمان مانا کە هیگڵ لەو پرۆسەیە گەیشتبو، قسەی

دەکرد، بەڵام ئەوانە هەمووی لە سنووری تێبینی تاکی سەرجەمییان، سەرنجی وەك پێویست ئەم فەیلەسوفەمانی ڕانەکێشا.

دیسان فۆیرباخ زۆر دوور بوو لەتێگەیشتنی دیالیکتیك وەك لۆژیك و تیورییەکی زانستانە بۆ لێکۆڵینەوە... فۆیرباخ ئەڵێ: "دیالیکتیکی ڕاستەقینە مۆنۆلۆژیك نییە لە نێوان من و تۆدا"(٦٢).

بەوجۆرە فۆیرباخ نهێنی فەلسەفەی ئیدیالیزم - ئایینی خستە پێش چاو، بەڵام نەیتوانی بەربەرەکانی ئیدیالیزمی دیالیکتیکی بە تێگەیشتنێکی نوێی جیهان بکات. ئەم کارە بەشکۆیەی دانانی ئەم فۆرمەلە بەرزەی مەتریالیزم چارەسەری بۆ نەدۆزرایەوە تەنها لەسەر دەستی مارکس و ئەنگلس دا ئەبێ.

**ڕەخنە لە ئایین.**

فۆیرباخ ڕەخنەگرتنی لە ئایین بە گرنگترین مەسەلە داناوە کە ژیانی خۆی بۆ تەرخان بکات. تێگەیشتنی ئەنسرۆپۆلۆژیشی بۆ جەوهەری ئایین پەرەپێدان و قوڵکردنی ئیلحادی بۆرژوا بوو. مەتریالیستەکانی سەدەی حەڤدەو هەژدە ئەوەیان سەلماند کە هەستی ئایینی دەگەڕێتەوە بۆ ترس و لەرز لەبەردەم هێزە ترسناکەکانی سروشتا، فۆیرباخ بەوەوە نەوەستا کە هەر لایەنگری ئەو تێزە بکات، بەڵکو زۆریشی لەسەر زیادکردن: نەك هەر، ترس بەتەنها، بەڵکو هەموو زەحمەتی و ئازارەکان و دیسان ئاوات و خواستەکانی لە ئاییندا

تـەعبیری لـێ دەکـرا. یـەزدان لای فۆیربـاخ تـەنها لـە ئـێش و ئـازاری مرۆڤایەتییەوە لە دایك ئەبێ... پەیدابوونی ئایین بەوپلەی سەرەتاییەی مێژووەوە دەبەستێتەوە کە مرۆڤ هێشتا بیرێکی ڕاستی دەربارەی دیاردە سروشتییەکانی دەوروپشتی دروست نەکرد بوو، کـە چارەنوسـی خـۆی تارادەیەکی دوور لەسەریان وەستابوو... پەرستنی دیاردەکانی سروشت ("ئایینی سروشتی") لەکۆنا و نەریتە ئاینییەکان لەسەردەمی ("ئـایینی گیانیی") ئەوە دەرئەخات کە مرۆڤ ئەوەی پەیوەندی بە چارەنوسیەوە هەبێ ئەیپەرستێ، ئیتر ئەو شتە ڕاست بێت یا تـەنها واهیمەیـەك بـێ... فۆیرباخ ئـەڵێ: "مـرۆڤ بـڕوا بـە یـەزدان ئـەکات، نـەك هـەر لەبەرئـەوەی بەتـەنها خـاوەنی خـەیاڵ و هەسـتە، بـەڵکو لەبەرئەوەشـە کـەخۆی تێندێنسی ئـەوەی هەیـە کـە بـەختیار بـێ. بـڕوای بـە بـونێکی بـەختیار هەیە، بڕوای بـە بـونێکی کـامڵ هەیـە نـەك لەبەرئـەوە دیـدی بـەختیاری هەیەو بەس، بەڵکو لەبەر ئەوەشە کە ئەیەوێ خۆی بەختیار بێ ، بڕوای بە بونێکی کامڵ هەیە چونکە ئەیەوێ خۆی کـامڵ بـێ، بـڕوای بەنـەمری هەیە چونکە ڕقی لە مردن ئەبێتەوە"(٦٢).

ئەوانەیە پرنسیپە بنچینەکانی تێگەیشتەی ئەنسرۆپۆلۆژی بـۆ ئـایین کە ڕەخنەش لەبیرو باوەڕەکانی ئایینی مەسیحی ئـەگرێ پـەنا بـۆ ئـەو پرنسیپانە ئەبات.

جەوهەری مرۆڤ لای فۆیرباخ، ئەقڵ و ئیرادە و دڵە. کەوابو قسەکردن لێرەدا دەربارەی سروشتی سـەڵتە کـە لەهـەموو پلـە جۆربـەرجۆرەکانی

مێژوودا هەروەکو خۆی نەمینێ. ئەم تێگەیشتنە ئەسکە میتافیزیکی و سروشت Naturalisrie بۆ مرۆڤ بووە هۆی تێگەیشتنێکی نامێژوویی بۆ ئایین، هەرچەندە فۆیرباخ هەوڵ ئەدات شوێن پەرەسەندنی مێژوویی و شێوە مێژوییەکانی بکەوێ. شتی سەرەکی کە ئەم فەیلەسوفەمان لەبیری چوبو، ئەوەبوو کە: ئایین ناکۆکییە بەیەکادراوەکانی کۆمەڵگەی فرەچین و کۆیلەکردنی مرۆڤ لەلایەن هێزە خۆکارەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ڕەنگ پێدەداتەوە.

تێگەیشتنی نامێژویی ژیانی مرۆڤ بووە هۆی ئەوەی کە فەیلەسوفەکەمان سروشتی مێژویی راگوزاریی ئایین و ئەو ڕێگەو شوێنانەی زامنی سەرفرازبوونە لێی، ئەبینێ. فۆیرباخ زۆرجار دوبارەی ئەکردەوە کە بێگومان دیدی خورافی ئایین بۆ جیهان نامێنێ و مرۆڤ دیدی غەریبی دەربارەی ماهییەتی خۆی ڕەت ئەکاتەوەو ئەوەی ئایین بەڵێنی داوە کە لەجیهانی غەیبیدا جێبەجێی بکات ئەم لەسەر زەوی بەدی دەهێنێ. فۆیرباخ خۆشەویستی مرۆڤ بۆ مرۆڤ، بەتایبەتی خۆشەویستی سێکس، بەهەستی ئایینی دائەنێ. سەبارەت بەوەی خۆشەویستی بەڕای فۆیرباخ جەوهەری ڕاستەقینەی ئایین پێکدەهێنێ. بۆیە وا سەیری ئیلحاد دەکات کە ئایینی ڕاستەقینەیە، ئایینێکە بێ یەزدان. ئەم تێگەیشتنە فراوانەی ئایین لاوازترین خاڵی ئەنسرۆپۆلۆژی فۆیرباخییە. چونکە پەردە ئەدات بەسەر ڕۆڵی ئاییندا وەك ئامرازی کۆیلەکردنی گیانی جەماوەرو ئەبێتە هۆی بڕوبیانو بۆ هەستی ئایینی و

زیادرۆیشتن لەسەر ڕۆڵی مێژوویی ئایین، کە خەریك ئەبێ لای فۆیرباخ شێوەی سەرەکی ژیانی گیانیی مرۆڤایەتی پێکدەهێنێ. فۆیرباخی مولحید خۆی بە ڕیفۆرمیستی ئایین دائەنا. لەو ڕاستییە نەگەیشت کە ڕەخنەی زانستیانە لە ئایین هەربەوەوە ناوەستێ کە دیدە ئاینییەکان بگێڕێتەوە بۆ ناوەڕۆکە ئەرزییەکەی، بەڵکو ئەرکی سەرەکی و ئەو ڕەخنەیە لەوەدایە کەئەو هۆیە مەتریالیستانەی لەپشت ڕێبازی دوانەیی Dualisation ئایینی جیهانەوە ماندرا شیکار بکرێ، چونکە تەنها ئەو جۆرە شیکارە جەوهەری کۆمەڵایەتی ئایین ئەدۆزێتەوەو یارمەتی دەرخستنی ئامرازە مێژووییە ڕیالیستەکان ئەدات، کە زامنی سەرفرازییە لێی.

**تێگەیشتنی مەتریالیستانەی سروشت.**

لای فۆیرباخ مەزەبی مەتریالیستی لە سروشتدا بنچینەی فەلسەفەی ئەنسرۆپۆلۆژی پێکدەهێنێ، ئەم بە پێچەوانەی قسەی ئیدیالیست و لاهوتییەکان ئەوە دووبارە ئەکاتەوە کە سروشت تەنها واقیعە، مرۆڤیش ئەنجام و بڵندترین تەواوکەرێتی. لە مرۆڤداو لەناو مرۆڤدا سروشت هەست بە خۆی ئەکات و لە خۆی ورد ئەبێتەوەو خۆی ئاقڵ ئەکات. لەبەرامبەر ڕا ئیدیالیست و لاهوتییەکاندا کە لەنرخی سروشت کەم دەکاتەوە، فۆیرباخ دووپاتی دەکاتەوە کە هیچ شتێك لەسەرو سروشتەوە نییە هەر بەتەواوی وەك چۆن هیچ شتێك لەخوارەوەی نییە:

"لە سروشت وردبینەوە، لە مرۆڤ وردبینەوە، لێرەدا نهێنییەکانی سروشتتان بۆ دەردەکەوێ" (٦٤).

فۆیرباخ لای وایە کە تێگەیشتەکانی "بوون" و "سروشت" و "مەتریال" و "واقیع" هەموویان نیشانەی جیاوازی یەك مانا دەنوێنن و ناتوانرێ جۆربەجۆریی دیاردەکانی سروشت بۆ یەك شت، بۆیەك مەتریالی هاورەگەز بگێرێنرێتەوە، ماهییەتیش جۆربەجۆرە هەروەك "بوون"، سروشتیش ئەمرەو ئەوەی سنور بۆ درێژبوونەوەی دائەنێ سنورداریی مرۆڤ خۆیەتی، چونکە لە زەمیندا بێ سنورەو ئەوەی لە زەمانیشدا دەرئەکەوێ تەنها شتی سەڵتایەتین، زەمان و زەمین "دوو مەرجی سەرەکی هەموو بوونێك و هەموو ماهییەت و هەموو بیرو چالاکییەك و هەموو گەشەکردنێك هەموو پێشکەوتنێکن "(٦٥). هیچ واقعێك لەدەری زەماندا نییەو دیسان هیچ زەمینێکیش لە دەری سروشتدا نییە. بۆیە قسە ئاینییەکان لە دەربارەی سەرەتای جیهان، هەر لە بنچینەندا بۆشن. فۆیرباخ دەڵێ: "سروشت سەرەتاو کۆتایی نییە. هەموو ئەوانەی لەناویدایە نیسبین، هەموو ئەوانەی لەناویدایە لەهەمان کاتدا وەك هۆو ئەنجام دەرئەکەون، هەموو ئەوانەی لەناویدایە چەند لایەنین و بەشتی ترەوە بەستراون(٦٦)". بەڵام سەرەنجام ئەم پێشبینییە بلیمەتانەی ئەم فەیلەسوفە هەروا جێهێشت و پەرەی پێنەدا... چونکە شێوە جۆربەرجورەکانی بەستراوەیی دیاردەکان و رەدوکەوتنی یەکتری لێنەکۆڵییەوەو بەلای ئەو واتانەدا نەچوو کە

جێگەیەکی گەورەیان لە "زانستی لۆجیک"ی هیگڵیدا گرتبوو، بۆیە دیدی فۆیرباخ لە دەربارەی سەرجەمیی دیاردەکانی سروشت بەرگێکی شەقڵ گشتی و زۆر پەتییان لەبەرکرد. جگە لەوەی دیدێکی ئاشکرای لە دەربارەی جۆربەجۆری چۆنایەتی شێوەکانی جوڵەو گواستنەوەی لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر نەبوو. بەلآم لەراستیدا فۆیرباخ بەتەنها سەرجەمیی جوڵەی نەسەلماند، بەڵکو قسەشی لەسەر پەرەسەندن ئەکرد: " هەر لە کۆنەوە زەوی بەم شێوەیەی ئێستاکە نەبووە کە دەیبینین، بەڵکو لە ئەنجامی پەرەسەندنێکی دووردرێژو چەند شۆڕشێ بەم جۆرەی ئێستای لێهاتووە". دیسان فۆیرباخ لای وایە کە هەموو تەنە زیندووەکان لە تەنە بێگیانەکان پەیدا بوون خۆنەگەر لەم سەردەمەدا پەیدابوونی تەنە گیاندارە سادەکان لە تەنە بێگیانەکان نەبیرێ، وا هۆیەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئەو باروبۆخە بابەتییەی کە پێش ملیۆنەها ساڵ هەبووە. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، لە تێگەیشتنی پرۆسەی پەرەسەندندا فۆیرباخ هەر میتافیزیکی بووە، چونکە لە ناکۆکییە دیالیکتیکییەکان و لە یەکێتی و لە ململانێی دژەکان بەو پێیەی کە سەرچاوەی پەرەسەندنن.. نکۆلی ئەکات.

بەپێچەوانەی مەتریالیستەکانی سەدەی هەژدەیەمەوە فۆیرباخ بە تێگەیشتەی میکانیکی بۆ سروشت قایل نەئەبوو. لە کاتێکدا تێگەیشتەی میکانیکی بۆ ژیان بەدرۆ ئەخستەوە، زۆر بەتوندی لەدژی جەبرییە vitalism دەوەستا. دیسان تێگەیشتنی بۆژیان وەک

شێوەیەکی بەرزی هەبوونی سروشت، بەشێوەیەکی سەرەکی لە دژی مەتریالیزمی باو Vulgae، کە لەڕاستیدا حاشای لە هۆش ئەکرد ئاراستەی ئەکرد. ئەم فەیلەسوفەمان وا سەیری هۆش ئەکات. بەهەموو شێوەکانییەوە وەك تەعبیرێکی ڕاستەوخۆ لە دەربارەی یەکێتی بابەت و خوییە، تێگەیشتنەکەشی بۆ ئەو یەکێتی و بابەت وخۆییە، مرۆڤ و سروشت، شەقڵێکی سروشتی Naturalistic و ئەنسرۆپۆلۆژی سنورداری هەبوو، چونکە فۆیرباخ بنچینەی ڕیالیستی و گرنگترین ئەم یەکێتییە لەبەرهەمی کۆمەڵایەتیدا ئەبینی، کاتێکیش مەسەلەی پەیوەندی نێوان سروشتی زیندوو بەستراو، مەتریالیستانە چارەسەری ئەکات، ڕەخنە لەدیدی ئیدیالیستانەی تیلۆلۆگی دەگرێ کە گوایە دەڵێ هەموو سروشت گونجاوێکی Harmony پێشەکی ئامادەکراو نییە. لێرەدا فۆیرباخ ئەوە دووبارە دەکاتەوە کە ئەو گونجان و تێندێنسە بەرەو کەماڵییەی لە جیهانی ئاژەڵ و ڕوەکدا سەرنجی لێنەدەین لە ئەنجامی بەدیهێنانی ئامانجە پەیوەستە ناوخۆییەکانی دیاردەکانەوە نییە... دیسان دیاردەی بۆ شەقڵی نیسبی تیلۆلۆگی بابەتی ناو سروشتی زیندووی کرد.

بەو جۆرە مەزەبەکەی فۆیرباخ لە سروشتدا، سەرەڕای هەندێ پێشبینی دیالیکتیکانەی تاکیانەو سەرەڕی تێگەیشتنی زیاتر قوڵی بۆ یەکیتی سروشت و هەمەچەشنەی لە مەتریالیستەکانی خۆی، لەگەڵ ئەوانەشدا بە گشتی لە چوارچێوەی لە مەتریالیزمی میتافیزیکی

دەرنەچووە، بۆ نمونە، لە پێناسەکەی بۆ سروشت ئەوە زیاتر ئاشکرا دەبی و ئەڵێ: "من وا لە سروشت دەگەم کە کۆمەڵە هێزو شت بووە هەستییەکانە کە مرۆڤ سەبارەت بەوەی مرۆڤی نین لە خودی خۆی جیایان دەکاتەوە... یان لە باری سەرنجی پراکتیکییەوە سروشت هەموو ئەو شتانەیە کە بۆ مرۆڤ ئاشکرا ئەبن بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە هەموو پێگەیاندنێکی غەیبی بۆ بڕوای بەخوا کردنە Theism ڕاستەوخۆ لەرووی هەستییەوە وەك بنچینەیەکی ژیانی و بابەتیش بۆی. سروشت ڕۆشنایی و کارەباو موگناتیس و هەواو ئاوو ئاگرو خۆڵ و ئاژەڵ و ڕووەکە، مرۆڤیش بەوپێییەی تەنێکی چالاکی خۆکارو خۆنەویستە. وشەی "سروشت" بۆ "من هیچ شتێکی تر نییە، شتێکی غەیبی نییە، شتێکی لاهوتی نییە". لینین ئەڵێ: "بەوجۆرە ئەوە دێتە ئەنجام کە سروشت هەموو ئەوانەیە کە لەئاسا بەدەرنین بۆ سروشت. لێرەدا فۆیرباخ ئاشکراو نایابە بەلام قوڵ نییە. ئەنگلس بە قوڵییەکی زۆرتر جیاوازی لەنێوان مەتریالیزم و ئیدیالیزم دەستنیشان دەکات" (٦٧).

**تیۆری زانین. پەرەپێدانی ئایندەی مەزەبی هەستیی.**

فۆیرباخ لەسەرنەریتی مەتریالیستەکانی سەدەی هەژدەیەم ڕۆیشت تا هاوبەشییەکی فراوانتر لەچارەسەرکردنی تیوری مەتریالیزمی - هەستی لەزانیندا بکات. لەم بوارەدا یەکەم کاری ئەوەبوو کە بەتوندی لەدژی تێگەیشتەی ئیدیالیستی تێوردبونەوەی هەستی وەستا. سەبارەت بەوەی شتێکی سەرەتایی و لەرووەو دوورە لەڕاستی. جیهانی

ریالیست ئەو واقیعەیە کە بەهەست دەرك ئەکرێ بۆیە تەنها بەهۆی دەرکە هەستییەکانەوە توانستی ناسینی ئەم جیهانە دەرەخسێنێ. فۆیرباخ بەیەکجاری نکۆلی لەوە دەکات کە شتی واهەبێ کە نەتوانرێ دەرکی پێ بکرێ... "بەوجۆرە نەك هەرتەنها دەرەکی بەڵکو ناوەکیش، نەك هەر تەنها تەن بەڵکو گیانیش، نەك هەر تەنها شت بەڵکو "خۆ"یش بابەتەکانی هەست پێکدەهێنن. بۆیە شتەکان هەموو لەبواری دەرك پێکردنی هەستدان، ئەگەر ڕاستەوخۆ نەبێ وابە شێوەیەکی ناراستەوخۆ ئەگەر بەهەستە ئاساییە کاڵوکرچەکان نەبێ وا بەشێوەیەکی ڕتوشکراو، ئەگەر بەبینینی زانایانی بەیۆلۆژی و کیمیا نەبێ وا بەچاوی فەیلەسوفەکان بەوجۆرە ئەزمونی Empiricism ـ لەسەر هەقە کە سەرچاوەی بیرەکانمان لە هەستەکانماندا... دەبینێ "(٦٨). دیسان فۆیرباخ لەدژی ڕەخنەکانی "گومانیی" و "نازانمی" بوو بەرامبەر دەرکە هەستییەکان، تا دووبارەی کردەوە کە ئەمەی دوایی بە بەستراوەیی ڕاستەوخۆی بەشتەکانەوە، قەت ناتوانێ هەڵمانبخەڵەتێنێ.

لینین بەرز ئەو تێزە بەناوبانگەی فۆیرباخی نرخاندووە کە دەڵێ پایەگاکانی هەست لای مرۆڤ بەتەواوی بەسە بۆ زانینی گشت دیاردەکات بەڵام فۆیرباخ نەیتوانی ئەو تێزە بسەلمێنێ، چونکە نەیدەزانی کە توانستی پایەگاکانی هەست بۆ ڕەنگدانەوەی واقیع بەشێوەیەکی دروست و هەمەلایەنە هەر لە ئەنجامی پەرەسەندنی هەزاران سەڵەیەتی. بەوجۆرە ئەو تێزە لە گریمانێکی بلیمەتانە نزیکترە وەك لەوەی

سەرەنجامێکی تیوری پەرەسەندنی بێ ـ کەبەسەر مرۆڤدا جێبەجێ ئەکرێ دیسان عەیبی تێگەیشتەی فۆیرباخ بۆ ڕەنگدانەوەی هەستی لەوەدایە کە دیدە هەستییەکانی نەبەستەوە بە پراکتیکەوە Praxis بە چالاکی پراکتیکی مەتریالیستانەی مرۆڤەوە. لەو بارەیەوە مارکس ئەڵێ: "فۆیرباخ کە بیری تاقیتەنیا ڕازی ناکات، پەنا بۆ تیۆربوونەوەی هەستی ئەبات، بەڵام هەستوەریی بە چالاکی پراکتیکی هەستەکانی مرۆڤ دانانێ"(٦٩).

فۆیرباخ هەربە بەڵگەی ڕۆڵی بیستن و بینین و بینین و پایەگاکانی تری هەست بۆ زانینی جیهانی دەرەکی، وازی نەهێنا بەڵکو پەنجەشی بۆ نرخی زانینیی گشت ژیانی سۆزیی و چالاکی سۆزیی مرۆڤ ڕاکێشا. بەڵام بەرهەمی مەتریالیستی، نەخستە ڕیزی ئەو چالاکیە هەستیانەوە.

هەستەکانی مرۆڤ لەڕووی چۆنایەتییەوە لەهی ئاژەڵ جیاوازە... فۆیرباخ لای وایە کە کارێکی هەڵە ئەبێ ئەگەر هۆی جیاوازیی پایەگایەکانی هەست لای مرۆڤ بەراوردی لەگەڵ ئاژەڵچدا بگێڕێنرێتەوە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ ئاقڵە. خۆ ئەگەر مرۆڤ بە هەستەکانی لە ئاژەڵدا جیاواز نەبایە واڵە بیرکردنەوەشدا لێی جیاواز نەئەبوو. دیسان ئەڵێ: "هەستەکان لای ئاژەڵ ـ ئاژەڵییە بەس لای مرۆڤ ـ مرۆڤییە". بەڵام ئەم تێزە جیاوازی چۆنایەتی دەرکی هەستی مرۆڤ و ئاژەڵ بۆ جیهان لێکناداتەوە، چونکە فۆیرباخ هۆیە ڕاستەقینەکانی بوونی مەیمون بە مرۆڤی نەدەزانی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پەنجە ڕاکێشانەی فۆیرباخ بۆ

چەشنی تایبەتی ڕەنگدانەوەی هەستی بۆ جیهان لەلایەن مرۆڤەوە نرخێکی پرنسیپی گەورەی هەبوو لە چەسپێنی مەزەبی هەستی Sensualism لە زانیندا.

ئەو نرخاندنە گەورەیەی فۆیرباخ بۆ ڕۆڵی زانینی هەستی و ڕەخنە لە تێگەیشتەی تێوردبوونەوەیی Speculatre کە لەجێگەی پێدراوە هەستییەکانی کە نەکردەوە، مانای ئەوە نەبوو کەدان بەکاری زانیاری تایبەتیی بیری تیوری و چوستیی بۆ گەیشتنە تێگەیشتنێکی قوڵتری واقیع دانەنا، ئەرکی بیر لە لەوەدایە کە پێدراوە هەستییەکان کۆبکاتەوەو بەراوردیان بکات و لێکیان جیابکاتەوەو بیانپۆلێنێ و ناوەڕۆکە شاردراوەکەی کە ڕاستەوخۆ دەرناکەوێ بدۆزێتەوە. فۆیرباخ ئەلێ: "بەهەست پەرتوکی سروشت ئەخوێنینەوە. بەڵام بێ هەستەکان تێیان ئەگەین". بیر، پێدراوە هەستییەکان دابین ئەکات و هەڵیان ئەسەنگێنێ و شییان ئەکاتەوەو لێکیان ئەداتەوە. فۆیرباخ ئەوەشی باش ئەزانی کەبیر - بەپێچەوانەی ڕەنگدانەوەی هەستی جیهانی دەرەکی - شەقڵێکی ناراستەوخۆی هەڵگرتووە، چونکە مەرج نییە کە پێویست بێ ئەوەی ئەیکەین بابەتێك بێ بۆ دەرکپێکردنی ڕاستەوخۆ. کەوابو ئەیچۆن بڕیار لەسەر یەقینی تێگەیشتنەکان لەسەر گونجاندنیان لەگەڵ واقیعی بابەتیدا ئەدەین؟، ئەوە بە بەراوردکردنی تێگەیشتنمان و سەرەنجامە تیورییەکان لەگەڵ پێدراوە هەستییەکاندا ئەکرێ. بەوجۆرە تێوربوونەوەی هەستی لای فۆیرباخ ئەبێ بەپێوانەیەك بۆ یەقینی

بیرەکانمان. بەلام ئەو گونجاندنە هەموو سات ناکرێ، چونکە مرۆڤ بەهۆی بیرەوە بەوەی لە (کۆن)دا هەبووەو ئەوەی جاری لە (پاشەڕۆژ)دا نەبووە ئاشنا ئەبێ. پەیوەندیی نێوان بیر لە لەگەڵ ڕەنگدانەوەی هەستیی جیهاندا شەقڵێکی دیالیکتیکی ناکۆك هەڵئەگرێ. ڕاستە فۆیرباخ یەکێتی هەستەکان و بیری، لەپرۆسەی زانیندا سەلماند بەلام ئەوەی نەبینی کە گواستنەوەی لە ڕەنگدانەوەی هەستیی جیهانی دەرەکیی بۆ ڕەنگدانەوەی ئەم جیهانە لەبیری تیوری پەتیدا، لە تێگەیشتەکانی زانست و گوتەکانیدا، شەقڵێکی ئاڵۆز هەڵئەگرێ و بەشێوەی قەڵەمبازیش ڕوو ئەدات. مەسەلەی واتاکان کە لە فەلسەفەی کانت و هیگڵیدا جێگەیەکی بەرزیان گرتبوو لە ڕاستیدا بایەخێکی وای پێ نەدان، دیسان بەدەگمەن بایەخی بەمەسەلە لۆژیکییەکان ئەدا. ئەو بیرە قوڵەی هیگڵیش لە دەربارەی گواستنەوەی بیری تیوری پەتیی بۆ کۆنکریتی Concrete و ئینجا لە دەربارەی توانستی کۆنکریتی لە بیرکردنەوەی پەتیدا، ئەمانە هەر بە تەواوی لای ئەم بە نامۆ مانەوە.

فۆیرباخ، خۆی ڕەخنەی لە تەقەلای دابڕکردنی بیر لە بنچینە هەستییەکەی دەگرێ، کەچی پەیوەندی زانینی تیوری بە پراکتیکەوە Praxis نەبینی. هەندێ جار قسە لەسەر پڕاکتیك ئەکات و هەوڵ ئەدات بیخاتە ناو پرۆسەی زانینەوە، بۆ نمونە ئەوە دووبارە ئەکاتەوە کە پڕاکتیك ئەو مەسەلانە چارەسەر ئەکات کە تیوری ناتوانێ چارەسەریان بکات. بەلام دەرك بەوە ناکەین کە تێگەیشتنێکی زانستانەی بۆ پراکتیك

هەبن. پراكتیكی مەتریالیستانە لای ئەوە وەك تیوریش بووە بەگشتی. لەگەڵ ئەوەشدا فۆیرباخ بۆ مەسەلەی ڕۆڵی بڕینەوەی چالاكی هەستی لە پرۆسەی زانیندا، سەرەتاكانی پـزەی ـ ی توانستی پەیداكردنی چارەسەرێكی زانستانەی ڕاست بۆئەم مەسەلە گنۆسیۆلۆژییە بنچینەییەی تیابوو.

## ـ ڕا كۆمەڵایەتی و ڕەوشتییەكان.

ڕا كۆمەڵایەتی و ڕەوشتییەكانی، بەشی هەرە كەمی چارەسەر كراوە ڕەسەنەكانە لە فەلسەفەی "فۆیرباخ"دا. فۆیرباخ هەروەك فەیلەسوفەكانی تری پێش ماركسیزم نەیتەوانی مەتریالیستانە لە ژیانی كۆمەڵایەتی و هۆشی كۆمەڵایەتی و لەدوایشدا لە ڕەوشت بگات. ئەم فەیلەسوفەمان لەدژی لێكدانەوەی ئیدیالیستی ئایینی وەستا، بەڵام نەگەیشتە ئاستی تێگەیشتنی مەتریالیستانەی مێژوو. چونكە لەبری هێزە غەیبییەكانی هەست، خواستە مرۆڤایەتییەكان بە جوڵێنەری مێژو دائەنێ، واتە بەشی واقیعی بەڵام نامەتریالی. فۆیرباخ بەربەرەكانی تێگەیشتەی ئیدیالیستی ـ ئایینی بۆ مێژوی جیهانی بەدیدی سروشتی Naturalistic ئەكرد كە لەتێگەیشتەی ئەنسرۆپۆلۆژی هەستورەیی مرۆڤایەتییەوە دەرئەچێ، لەبەرئەوەی كەهێزی سەرەكی و سنورداركردنی، ڕەفتاری هەریەكێك و ڕەفتاری كۆمەڵگەیە بەگشتی.

فۆیرباخ تێگەیشتەی ئیدیالیستی هیگڵی بۆ ئازادی بەدرۆخستەوە، بێ ئەوەی ناوەڕۆکی پۆسەتیڤی ڕوخستنی مەسەلەی پەرەسەندنی مێژوویی ئازادی سەرنج لێبدات. ئازادی لای فۆیرباخ یەکێتی مرۆڤە لەگەڵ مەرجەکان کە تیایدا ماهییەتەکەی دەرئەکەوێ. مەل لە هەوادا ئازادە ماسی لەئاودا ئازادە، مرۆڤیش لەهەر شوێن و کاتێکدا کە بارودۆخەکانی ژیانی ڕێگەی پێبدا تا تێندێسی سروشتی بۆ بەختەوەری بۆ بەدیهێنانی توانستەکانی بەدیبهێنێ وا ئەویش ئازادە. ئەم تێگەیشتە سروشتییە Naturalistsic ئەنسرۆپۆلۆژییە پەتییە بۆ ئازادی مرۆڤ وەکو داوای ڕوناکبیرەکانی وایە کە دەیانویست بارودۆخی ژیانی مرۆڤ والێبکەن کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤایەتیدا بگونجێ و ئەو بارودۆخە بکرێ بە مرۆڤایەتی.

لە سۆسیۆلۆژیشدا، تێندێستی ئەنسرۆپۆلۆژی شەقلێکی دیموکراسی - تەواو بورژواوا هەڵئەگرێ... گرنگترین شتی ناو ئەو ئێندێنسە داننانە بەکێتی ئەنسرۆپۆلۆژی هەموو خەڵك. جا ئەگەر خەڵك لە سروشتیاندا یەکسان بن، کەوابو هەموو پلە کۆمەڵایەتییەکان و جیاوازییەکی تریش هەیە کە پێچەوانەی سروشتی مرۆڤایەتین، ئەبێ نەهێڵرێ. ئەم تێگەیشتنەی بۆ یەکسانی دیسان هەر بەتەواوی وەك تێگەیشتنی دیموکراسی بورژوا بۆ ئازادی، سنور تەسك بوو. فۆیرباخ تاڕادەیەك بایەخی پێکهاتنی ئابوری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە نەدا کە چینێك دەست

بەســەر چــینێکی تــردا ئــەگرێ و پەیوەنــدی نێــوان چەوســاندنەوەو ڕەتاندنەوە لەلایەك و موڵکداریتی ـ لەلایەکی ترەوە نەدەبینی.

فۆیریاخ کەسەیری مرۆڤ وا ئەکات کەیەك بووەی سروشتییە، هەوڵ ئەدات بەوە باروبۆخێکی سروشتی بۆ بوونی مرۆڤ لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی بورژوازیدا بەدەست بهێنێ کە ئەوە ماوە بەسەڵت ئەدات تائەم یا ئەو ڕادە ئەنجامهێنانی بە پەرۆشی بۆ بەختەوەریی جێبەجێ بکات. ئنگلس لە باسی ئەو سەرەنجامەی فۆیرباخ بەدەستی هێنا ئەڵێ: بــێ گوێدانــە ئــەو نیــازەی ئــەو فەیلەســوفە مەبەســتی بــووە ئــەو سەرەنجامەی، بەرگریکردنە لە کۆمەڵگەی بۆرژوازی"(٧٠).

بێگومان فۆیریاخ خۆیی بوو، دوور بوو لە بەڵگە هێنانەوە بۆ نەبویی ڕەنجدەران و ڕەتاندنەوەیان، بەلام برِوایەکی قوڵی بە لەناوبردنی کوێرەوەری و بێبەشی لەماف هەبووە هەتا ناوی کۆمۆنیستیشی لەخۆی نا. بەلام ئەو تێگەیشتەیە هیچ ناوەڕۆکێکی کۆمەلایەتی و سیاسی تیا پەیدا نەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا فۆیریاخ نەیتوانی لەڕووی بابەتییەوە خۆی بخاتە سەروو دیدە دیموکراسی ـ بورژواکان لە دەربارەی کۆمەڵگەوە. هەروەك مارکس و ئنگلس پەنجەیان بۆ ڕاکێشاوە فۆیریاخ "توخنی ڕەخنەگرتن لە پەیوەندییەکانی ژیانی ئەو کاتە نەکەوتووە... هەرگیز نەگەیشتە ئاستی تێگەیشتنی جیهانی هەستی وەك چالاکییەکی هەستی و زیندوو سەرجەمیی ئەو کەسانەی ئەم جیهانەیان لێ پێکدێت. بۆیە بۆنمونە کە دەبینی کەبڕی خەڵکی تەندروست خەڵکێکی هەژار

کەشەکەتیی لەشیانی پروکاندنەوەوە سیل و نەخۆشی بەراز لەناویان ئەبات، ناچارە کە پەنابەرێ بۆ "تێوردبونەوەی هەستیی" بۆ "یەکسانکردنی خەڵك بە سروشتەکانیان "واتە سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە بۆ مەڵبەندی ئیدیالیزمی، هەر بەتەواوی لەو شوێنەدا کە کۆمۆنیزمی مەتریالیستی بە پێویست و نیسان بە مەرجی گۆڕانی پیشەسازی و سستێمی کۆمەڵایەتی وەکو یەك دەبینێ".

ئیدیالیستی فۆیرباخ لە تێگەیشتنی ژیانی کۆمەڵایەتیدا بە تۆخی لەو هەوڵەیدا دەردەکەوێ کەئەیدا بۆ دانانی ڕا سوسیۆلۆژییە مرۆڤایەتییەکانی لەسەر بنچینەی تەواو ڕەوشتی. هەروەك مەتریالیستە فەڕەنسایەکانی سەدەی هەژدەیەم وای دائەنا کە خۆپەرستی لۆژیکی، واتە بەرژەوەندی ئاشکراو شێوە دروستی سەڵتایەتی Egoism لە سەرەنجامدا لەگەڵ بەرژەوەندیی گشتی جوت دەبێ، بۆیە نابێت و هیچ پێویست نییە دژایەتییان لەگەڵ یەك هەبێ. جا ئەگەر خۆپەرستی و خەڵك پەرستی Altruism یەکەیەکی ئەنسرۆپۆلۆژی پێکبهێنێ (فویرباخ دەڵێ بەبێ خۆپەرستی سەرت نییە بەبێ خەڵك پەرستی دڵت نییە) وا خۆشەویستی ئەبێتە ئامرازی پێکهێنانی ژیانی کۆمەڵایەتی گونجاو، مرۆڤی ئەویندار بەتەنها ناتوانێ بەختیار بێ، چونکە بەختیاریی ئەو بەتوندوتۆڵی بەبەختیاریی خۆشەویستەکەیەوە بەستراوەتەوە.

بەوجۆرە بەختەوەری ڕاستەقینە بەختەوەریی بۆ هەمووان گەرەکە، ئەوەش هیچ پێویستی بەوە نییە، کە ئەرك داشکان بۆ هەست بکات و

هیچ ناکۆکییەك لەنێوانیاندا هەبێ ئەنگلس ئەڵێ: لای فۆیرباخ لەهەموو زەمان و زەمینێکدا خۆشەویستیی خوڵقێنەری موعجیزەیە... ئەمەش لە کۆمەڵگەیەکدایە کەدابەش بووە بەچەند چینێکی خاوەن بەرژەوەندی تەواو ناکۆك بەیەك! بۆیە فەلسەفەکەی لێرەدا دوو شەقڵی شۆڕشگێڕانەی خۆی لە دەست ئەدا..."(٧٢).

لەبەرئەوەی فۆیرباخ وای دائەنا کە خۆشەویستی هێزی جوڵێنەری پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئامانجەکەیەتی بۆیە بەوەی دائەنا کە کتومت هێزی جوڵێنەری پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییە بەتایبەتی لایەنی ڕەوشتی. ئەم گەشبینییە ڕەوشتییە، بێگومان خۆی ئەدا بەڕاستییە مێژووییەکان و ڕووداوی ڕۆژانەدا... بەڵام فۆیرباخ تەقەلا ئەدا کە بەپشت بەستن بەدیدەکانی خۆی بچێتە سەرو ئەو ڕوداوە ڕیالیستانەکە لە دووبارەکردنەوەی جوتبونی جەوهەری سەڵتی مرۆڤ لەگەڵ جەوهەری توخمی مرۆڤدا زیادەڕۆیی دەکات.

لەکاتەکانی شۆڕشی ١٨٤٨دا فۆیرباخ ڕووی کردە گوێگرەکانی لە قوتابیان و کرێکاران و وتی: "کەی سەردەمێکی نوێ لە مێژوودا دەست پێ دەکات؟ لەوێوە تەنها لەوێ جەماوەر یا زۆربەی زۆرلێکراوان، خۆپەرستی خۆی بەرامبەر خۆپەرستی نەتەوەیەك یان تاقمێك ئەخاتە گەڕ، لەوێدا کە چینەکانی خەڵك یان تەواوی چەند نەتەوەیەك سەرفراز دەبن دوای ئەوەی سەرکەوتن بەسەر دەستدرێژی کەمینە خۆبەزلزانەکە بەدەست دەهێنن، لەزۆرلێکراوی و ستەمدیدەکردنی پرۆلیتاریا ڕزگاری

دەبێ، تا چالاکی بەرزی مێژوی لەسەر شانۆ دەرکەوێ. بەوجۆرە خۆپەرستی زۆربەی مەزن لە مرۆڤایەتی کە لەژێرباری چەوسانەوەدا دەناڵێنن، ئەبێ مافی خۆی بەکار بهێنن حەتمەن بەکاری دەهێنن و سەردەمێکی نوێ لەمێژو دەست پێدەکات"(٧٣).

ئەگەر فۆیرباخ لەیەکێتی ئەنسرۆپۆلۆژی توخمی مرۆڤ کە نکۆلی ناکا لە جیاوازی کۆمەڵایەتی دروستبوی ناورێرەوی مێژو، تێبگەیشتایە، ئەگەر لێکۆڵینەوەکەی ئاراستەی ئەو جیاوازییانەو لەدوایشدا ئاراستەی "خۆپەرستی کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی چینە دژبەیەکەکان بکردایە وا لەسەرنجی ئەنسرۆپۆلۆژی تێدەپەرێ. بەڵام فۆیرباخ بەمانەوەی لە مەڵبەندەکانی ئەنسرۆپۆلۆژی دیموکراسیانەی بورژوادا، نەیتوانی پەرە بەو بیرە تاکیانەی بدات کە لەناویاندا لە تێگەیشتنی مەتریالیزمی مێژوویی نزیك دەبێتەوە. ئەوەی کارەکەی زیاتر شێواند ئەوەبوو کە فۆیرباخ لەڕووی ئەنسرۆپۆلۆژییەوە هەوڵیدا ئەوبیرانە بسەلمێنێ. بۆ نمونە ئەیووت: "لە کۆشکدا بیرکردنەوە جیاوازە وەك لەکوخدا. سەقفی نزم وادەردەکەوێ کە فشار دەخاتە سەر دەماغ. خەڵك بیرکردنەوەیان لە هەوای کراوەدا تەواو جیاوازە لەگەڵ بیرکردنەوە لەشوێنی داخراودا، قەڵبالغی خنکێنەوە، بەڵام کراوەیی دڵ و دەرون ئەکاتەوە "ئەم لێکدانەوە سروشتییە بۆ ناکۆکی بنەڕەتی نێوان چینە "بەرزەکان" و جەماوەری پێشێلکراوی "خوارەوە" لەڕاستیدا هیچ ئەنجامێکی نابێ جگە لە شاردنەوەی ئەو ناکۆکییە نەبێ.

نرخی کۆمەڵایەتی و ڕەویشتیی ڕاکانی فۆیرباخ بەگشتی لەوەدا بوو کەنکۆڵی ڕەخنەی ویرانکەری ئاراستەی تەقەلای فەیلەسوفە ئیدیالیستەکان و پیاوانی لاهوت کرد کە دەیانویست ـ بەهۆی ئایینەوە ـ دروستی پرەنسیپەکانی یاساو ڕەوشتی بورژوازی. بسەلمێنن، ئەوەی دووپارە دەکردەوە کە ئایین ناتوانێ ببێتە بینچینەی یاسادانان و ڕەوشت.

راکۆمەڵایەتی و ڕەوشتییەکانی فۆیرباخ بنچینەی تیوری بۆ دیموکراسی ـ بۆرژوازی پێکدەهێنێ. بۆیە حاڵی نین لە واهیمەی دیموکراسی ـ بۆرژوازی. ئەو مرۆڤە "سروشتی" و ڕاستەی" کە زۆرجار قسە دەربارەی دەکات و کە مرۆڤی پاشە ڕۆژو مرۆڤی ڕزگاربوو لەو شتانەی سەڵتایەتییەکەی دەشێوێنێ ـ تیا دەبینێ، ئەم زاتە تەواو ئەنسروپۆلۆژیە پەتی و ناچینایەتییە، لە کۆتاییدا وێنەیەکی ئیدیالیستانەی مرۆڤی کۆمەڵگەی بۆرژوازی دەمێنێتەوە. بەڵام ئەو هەنگاوەی کە فۆیرباخ نەینا ئەبو لەگەڵ ئەوەشدا هەر بنرێ. ئەوبو لەبری پەرستنی مرۆڤی پەتی کە ناوکی ئایینی نوێی فۆیرباخ پێکدەهێنێ، زانستی بخاتە جێگەی کە دەربارەی خەڵکە ڕاستینەکان و دەربارەی پەرەسەندنی مێژووییان بێ" (٧٤).

لەفەلسەفەکەی فۆیرباخدا فەلسەفەی کلاسیکیی بۆرژوای ئەڵەمانی گەیشتە ترۆپکی پەرەسەندنی. نرخی مێژوویی ئەم فەلسەفەیە لەوەدایە کە تێگەیشتەی دیالیکتیکی بۆ جیهان و بەرنامەی دیالیکتیکی فورمەلە

کرد هەرچەندە لە مەڵبەندی ئیدیالیستانەوە بووە ـ هەر لەبەر خودی ئەوە فەلسەفەی کلاسیکیی ئەڵمانی بوە یەکێك لە سەرچاوەکانی تیوری مارکسیزم و فەلسەفەکەی مەتریالیزمی دیالیکتیکی و مێژویی.

# بەشی نۆیەم

ـ فەلسەفەی دیموکراتە شۆڕشگێڕەکان لە ڕوسیا و وڵاتانی تردا..

١ـ بیری فەلسەفی و سۆسیۆلۆژی لە ڕوسیادا لە چلەکانەوە تا شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەم.

ـ مەتریالیزمی دیموکراتە شۆڕشگێڕەکان و تێکۆشانیان لە دژی ئیمپریالیزم .

٢ـ بیری فەلسەفی و سۆسیۆلۆژی لای گەلانی ڕوسیای قەیسەری لە سەدەی نۆزدەهەمدا.

٣ـ ڕێبازە پێشکەوتووەکان لە بیری فەلسەفی و کۆمەلایەتی لای گەلانی ئەوروپای خۆرهەلات لە سەدەی نۆزدەهەمدا.

٤ـ ئیدیۆلۆگە دیموکراتە شۆڕشگێڕەکانی چین لە سەدەی نۆزدەهەمدا.سون یات سن.

## فەلسەفەی دیموکراتە شۆڕشگێڕەکان لە ڕوسیاو وڵاتانی تردا..

## *بیری فەلسەفی و سۆسیۆلۆژی لە ڕوسیادا لە چلەکانەوە تا شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەم.

## *مەتریالیزمی دیموکراتە شۆڕشگێڕەکان و تێکۆشانیان لە دژی ئیدیالیزم.

دوای کوژانـەوەی ڕاپەڕینەکـەی دیسـەمبەرییەکان و ئـەو قەسابخانە دڵڕەقانەیـەی بـووە هـۆی لـەناو بردنـی هاوبەشـانی ، بـۆ ماوەیـەکی دورودرێژ کۆنەپەرستی سیاسی دەسـتی بەسـەر ڕوسیادا گرتـو گشت توانــای خــۆی بــۆ خنکانــدنی خونچــە ســـەرەتاکانی جوڵانـــەوەی ڕزگاریخوازانــەی ڕوســی تــەرخان کــرد. لەگــەڵ ئەوەشــدا سســـتێمی دەرەبەگایەتی ـ بەندەگێتی لەو سەردەمەدا بەرەنگاری گرژییـەکی تیـژو قوڵ ببوو کە مەسەلەی ڕوخانـدنی ئـەو سسـتێمەی بەگـەرمی هێنـابووە پێشەوە. ساڵ لە دوای ساڵبە تایبـەتی لـە چـل و پـەنجاکانی سـەدەی نۆزدەهەمەوە شـەپۆلی ڕاپـەڕینی جوتیـاران بـە ڕوسـیادا بڵاودەبـوەوە، باشـترین نوێنـەرانی بازرگــان و نوبــەڵای ڕۆشــنبیر هابەشــی خــەباتی ئازادیخوازانەیان کـرد. لـە کۆتـایی سـەدەی هەژدەیەهەمیسـدا بـۆرژوای ڕوس بە پێچەوانەی بـۆرژوای فەرەنسـاوە. چـینێکی شۆڕشـگێر نـەبوو،

زراوچونیسی له جوڵانەوەی ئازادیخوازانەی ڕوسیاو ئەوروپای خۆرئاوا پالپێوەنا کە ببێتە کلکی زۆردارو حوکمی‌موتڵەق.

لەو ماوەیەشدا مەسەلەی هەڵوێست لە مافی دەرەبەگێتی و ئەنجامەکانی، چەقی خەباتی ساسی و ئایدیۆلۆجی بو لە ڕوسیادا. لینین ئەڵێ:"ئەبێ ئەوەمان لە یاد نەچێ لەو سەردەمەی ڕوناکیرانی سەدەی هەژدەهەم ئەیاننوسی(کەڕای باوو بە سەرکردە بۆرژواکان لە قەڵەمیان ئەدا)، لەو ماوەیەی کە ڕوناکبیرەکانمان لە چلەکان تا پەنجاکان دەیانووسی...ئالەو سەردەمانەدا هەموو مەسەلە کۆمەڵایەتییە کان ئەگێڕێنرانەوە بۆ خەباتکردن لە دژی مافی بەندەگیی و پاشماوەکانی"(٧٥).

"ئۆڤارۆن"و"بۆگۆدین"و"شیشڤێرۆڤ"و فەیلەسوفی تیش لە ئدیۆلۆگەکانی سەربازگەی بەندەگێتی بوون کە بەئاشکرا بیری سیاسی و ئایینی غەیبی کۆنەپەرستیان بڵاودەکردەوە کە مەبەست لێیان بیانوو هێنانەوەو چەسپاندنی سستێمە دەرەبەگاتییەکانی ڕوسیا بووە...دەریان خست کە فەرمانرەوایی سەڵت باشترین شێوەی فەرمانرەوایەتییە لە ڕوسیادا، دیسان ڕەواجیان بەو پرنسیپە ئەدا کە دەیووت ڕێگەی مێژویی گەلی ڕوس ڕەسەنە، ئیتر ئاکۆکی چینایەتی و گۆرانە شۆڕشگێڕەکان بە ڕوسیا نامۆن سروشتی گەلی ڕوس وایە کە ملکەچ و دلسۆزییەکی بێسنوری بەرامبەر فەمانرەوایەتی سەڵت هەبێت.

ئیدیۆلۆگەکانی تری ئەم بەرەیە پرۆپاگەندەیان بۆ تیۆری ئیدیالیزم و لاهوتی دواکەوتە دەکرد، لە دژی مەتریالیزم و ئیلحاد دەوەستان، فەلسەفەیان ئەخستە خزمەت لاهوت و لەگەڵ ئەو مەزەبەدا کە دەیووت گیان نەمرەو ویستی مرۆڤ ئازادە...تەقەلایان ئەدا کە زانست ملکەچی باوەڕە ئاینییەکان بێ و بە گومان بن لە توانستی ئەقڵی مرۆڤ.

هەر لەسەرەتای چلەکانەوە شانبەشانی ئیدیۆلۆگی بەرەی بەندەگێتی، تەیاری ناوبانگ دەرکردوو بە سلاڤەکانSalvophiles لە بیری کۆمەلایەتی ڕوسیدا دەرکەوت. دیارترین نوێنەرانی ئەم ڕێبازە"ئەلەکسی خۆمیاکۆڤ"(١٨٠٤ــ١٨٦٠)و" کۆنستانتین ئەکساکۆڤ"(١٨٧١ـ١٨٦٠)و ئیڤان گیرییڤسکی" (١٨٠٦ـ١٨٥٦)و"یوری سامارین (١٨١٩ـ١٨٧٦)و ژمارەیەکی تریش بوون. ئەمانە هەندێ لایەنی واقعی دەرەبەگایەتی ـ بەندەگێتی ـ یان ڕەخنە لێ دەگرت.تێزێکیان خستەروو کە دەیووت:"دەسەلات بۆ قەیسەرو ڕاش بۆ گەلە". داوای ئازادی وشەو ئاشکراکردنی دادگایان ئەکرد، دیسان داوای کۆڕێکی زانیاری و داوای بە پێویست زانینی دامەزراندنی کۆڕێکی دونیایی ـ یان ئەکرد کەرۆلی دەزگای ڕاوێژ ببینێ. هەروەها لە"سەرخان" ی کۆمەلگەوە داوای سەرفرازی جوتیارانیان دەکرد.فەرمانڕەوایەتی سەلتیان بە شێوەیەکی ڕەسەنی فەرمانرەوایەتی دائەنا کە لە سەر ڕێکەوتنی نێوان گەل و میری دامەزراوەکە ئاکۆکی و دوژمنایەتی چینایەتی و شۆرش لە ئارادا ناهێلێ. سلاڤییەکان، بەهەلە، وایان دائەنا

که سیفەتەکانی خواپەرستی و سۆفێتی و واز لەخۆشە ژیان هێنان و پەنا بۆ بردن و ملکەچی بۆ قەیسەرێت، سیفەتی ڕەگ داکوتاون لە گەلی ڕوسدا... دیسان ڕێبازی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی ڕوسیاو ئەو ڕێگە مێژوییەی ئەوروپای خۆرئاوا لە سەردەمی نوێدا لە سەری ڕۆیشت.. بە شێوەیەکی میتافیزیکانە بەربەرەکانییان دەکرد.

سلافییەکان لە فەلسەفەدا غەیبی بوون و لایەنگیری کلێسەی ئەرسۆزۆکسی و فەلسەفەی( مەسیحییەت) بوون، ڕەواجیان بە سازاندن لە نێوان فەلسەفە لەگەڵ ئاین، ئەقڵ لەگەڵ ئیماندا ئەدا. فەلسەفەی ئایینی غەیبی شیلنگ ـ یان پەسەند ئەکردو لە مەڵبەندی ڕاسترەوییەوە ڕەخنەیان لە فەلسەفەی هیگڵ و فەلسەفەی پۆسەتیڤ Positivism دەگرت.

ڕووناکبیرانی نوبەلا: پیۆتەرچادیف ١٧٩٤ـ١٨٥٦،نیکۆلای ستانکیڤیج ١٨١٣ـ١٨٤٠ و تیمۆفی گرانۆفسکی ١٨١٣ـ١٨٥٥ جێگەیەکی نایابیان لە خەباتی بیری سییەکان و چلەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا گرتبوو.

لە سەردەمی خوێندنیدا لە زانکۆی مۆسکۆ"ستانکیڤیج" ئەڵقەیەکی ڕۆشنبیریی دامەزراند،بەمەبەستی توێژینەوە لە فەلسەفەی شیلنگ و فیختەو هیگڵو بیلینسکی و بۆتکین باکونین و ژمارەیەکی تریشی تیابوو. پەیام هەلگرانی ئەم ئەلقەیە بە چاوێکی نیگەتیڤەوە سەیری بەندەگێتی و ئایدیۆلۆژی ڕەسمییان دەکردو داوای ڕووناکبیریی و مرۆڤایەتیHumanism و ریفۆرمی ڕەوشتی پێرسونالێیان ئەکرد.

پزگاری گەلیان لە چنگ دەرەبەگێتی دەبەستەوە بە مەسەلەی ڕووناکبیری و بەرزبونەوەی ئاستی ئەقڵی و ڕەوشتی نوبەلاکان..ستانکیڤیچ و هاوڕێکانی ئیدیالیستی بابەتی بوون ، جیهانی چواردەوریان بەبەرهەمی چالاکی گیانی موتڵەق دانەنا.

ئەو ئەلقەیەی ستانکیڤیچ ڕۆلێکی چاولێنەپوشراوی وازی کرد لەڕووی پرۆپاگەندەو بۆ ئیدیالیزمی ئەڵەمانی لە کۆمەڵگەی ڕوسیدا، تا ڕادەیەکیش هاوبەشی بڵاوکردنەوەی دیدی دیالیکتیکانەی بۆ جیهان دەکرد. لە دواییەکانی ژیانیشیدا فەلسەفەکەی فویرباخ سەرنجی ئەم فەیلەسوفەی ڕاکێشا، بەڵام خۆی نەگواستەوە بۆ مەڵبەندی مەتریالیزم.

**لیبرالەدەرەبەگە ـ بۆرژواکان:**

لە نێوان چلەکان و شەستەکانی سەدەی نۆزدەدا ئایدیۆلۆژی لیبرالی دەرەبەگایەتی ـ بۆرژوا پێکهات. لە نوێنەرە ناودارەکانی: ڤاسیلی بۆتکین ١٨١١ـ١٨٦٩،کۆنستانتین کاڤلین ١٨١٨ـ١٨٨٥و میخائیل کاتکۆڤ ١٨١٨ــ١٨٨٧بوون. لە چلەکاندا هێشتا لیبرالەکان بە تەواوی لەدیموکراتە شۆرشگێڕەکان جیا نەبوونەوە..لە زۆر ڕووەوە ڕەخنەیان لە بەندەگێتی گرت وەکو نەبوونی ئازادی وشەو ڕۆژنامەگەری..هتد بەڵام ئەم خەباتەی لیبرالەکان لەدژی دەرەبەگەکان تەنها ململانێیەکی ناوخۆی چینە دەسەلاتدارەکان بووە، جیاوازیشیان لەگەڵ خاوەن بەندەکانی زەویدا تەنها لە ڕووی ڕادەو شەقڵی داشکاندنەکاوە بووە هەروەك لینین سەرنجی لێداوەو ئەیووت:" لیبرالەکان ئەیانویست

ڕوسیا"لە سەرەوە""ڕزگار" بکەن بێ ئەوەی دەسەڵاتی قەیسەر یا خاوەندارێتی دەرەبەگەکان و دەسەلاتیان بڕوخێنرێ،بەڵکو هەر بەوە ڕازی بوون کە داوای "داشکان" لە بەردەم گیانی سەردەمدا بکەن(٧٦).

پێکهاتن و پەرەسەندنی ئایدیۆلۆژی دیموکراسی شۆڕشگێڕ لەروسیادا بە ناوی بیلینسکی و گێرتسین و ئۆگارێف و چێرنیشیڤسکی و دۆبرۆلیۆبۆپۆڤ و چەند ناوێکی تری جوڵانەوەی ئازادیخوازی ڕوسدا بەستراوەتەوە. دیموکراتە شۆڕشگێڕەکان کە لە سەردەمی چەڵەمەی سستێمی دەرەبەگیی داروخانیدا هاتنە سەر شانۆی ژیانی کۆمەڵایەتی.. بەرگرییان لە بەرژەوەندی جوتیارو بەندەکان و بەشە پڕوکاوەکان دەکرد، بۆ ڕوخاندنی فرمانڕەوایەتی سەلتایەتی موتڵەق و لابردنی سستێمی بەندەگێتی تێدەکۆشان. ئەو دیموکراتە شۆڕشگێڕانە لە لایەنگرانی سۆسیالیزمی یۆتۆپی جوتیاریی بوون، ژمارەیەکیشیان بڕوایان وابوو کە دەبێ دوای گۆڕانە شۆڕشگێڕییەکانی میشاعە جوتیاری و"ئەرتیلات"ی کرێکاری ڕاستەوخۆ سۆسیالیزم لە ڕوسیادا دابمەزرێ. دیسان ئەو دیموکراتە شۆڕشگێڕانە ڕۆڵێکی دەرکەوتوویان لە مێژووی بیری کۆمەڵایەتی و تیۆرییە مەتریالیست و ئیلحادییەکاندا بینی و بیری پێشکەوتوانەیان لە بۆارەکانی سۆسیۆلۆژی و زانستی جوانی و زانستی ڕەوشتدا خستەروو..ڕێبازی تێکەڵ مەتریالیزمی فەلسەفییان گرتە بەرو نەریتە مەتریالیستی و ئیلحادی و مەتریالیزم و زانستە سروشتییەکان و

هونەری پێشکەوتوویان لەگەڵ جوڵانەوەی شۆڕشگێڕیدا دەکرد. دیسان لە بواری پەرەپێدانی دیالیکتیك و ڕەخنە لە تیورییە میتافیزیکییەکانی ئیدیۆلۆژی سەربازگەی ڕەسمی و سلافییەکان و دەرەبەگە بۆرژوا لیبرالەکان زۆر بەرهەمیان پێشکەش کرد...زۆر لە مەتریالیزمی دیالیکتیکی نزیك بوونەوە.

**ڤیساریۆن بیلینسکی١٨١١ـ١٨٧٨:**

لە خێزانێکی "رازنوچنتسی:* بووە، لە سییەکاندا لەگەڵ ئیدیالیزم بووەو پشتی لە ڕوناکبیریی مرۆڤایەتی و ڕیفورمی ڕەوشتی خەڵك کردووە. لە شاتوگەری"خەوی وێژەیی"(١٨٣٤)دا هەوڵیدا ئەوە بسەلمێنێ کە جیهانی دەوروپشت هەمووی هیچ نییە تەنها "نەفسێکی یەك ئیدیەی نەمرە"..بەلام هەتا لەو کاتەشدا لەیەنگیرانی مەتریالیزمی ئیدیالی بووە،ئەیووت:"ئیدیە" وەستانی بۆ نییە.. ئەژیو ئەجوڵێ، یەکبینە نوێ دائەهێنێ و کۆن ئەروخێنێ.دیسان هەر لەسییەکانداتازایانە هێرش ئەباتە سەر لاتنگیری کۆنەپەرستانەی بلۆکی نووسەرانی سەر بەفەرمانرەوایەتی موتڵەقی سستێمی بەندەگێتی.

---

*رازنوچنتسی: بەشی ناوەڕاست و پیشەگەرەکانی کۆمەڵگەی ڕوسیایە.

ئیتر لەو کاتەوە ئەو فەیلەسوفە دەستی کرد بە جێهێشتنی مەلبەندی ئیدیالیزم و ڕووی کردە بەرگریکردن لە ڕیالیزم و جەماوەریی لە هونەرداو پەسن ـ کردنی دانراوەکانی بۆشکین و گۆگۆل و کریلۆڤ .

له ساله‌کانی ١٨٣٩-١٨٣٧دا وه له ژێرکارتێکردنی ڕا کۆمه‌لایه‌تی و سیاسییه کۆنپارێزه‌کانی هیگلداو له کاتی شه‌پۆلی کۆنه‌په‌رستانه‌ی دواله‌ناوبردنی ڕاپه‌رینی دیسه‌مبه‌ریه‌کان گه‌یشته سه‌ره‌نجامێکی هه‌له‌و ئه‌یووت: ئه‌بێ "ملکه‌چی واقیعی تال بین". به‌لام له سه‌ره‌تای چله‌کاندا به‌و هه‌له‌یه‌دا چووه‌وه‌و که‌وته هێرش بردنه سه‌ر لاکۆنپارێزه‌کانی فه‌لسه‌فه‌ی هیگلی . له‌و گواستنه‌وه‌یه‌شدا بۆ مه‌لبه‌ندی دیموکراسی شۆڕشگێر، بیلینسکی مه‌سه‌له‌ی ڕوخاندنی سستێمی به‌نده‌گێتی و حوکمی سه‌لتایه‌تی خسته پله‌ی یه‌که‌م. تاله چله‌کاندا ڕوداوه شۆڕشگێڕه‌کان و بیری سۆسیالیستیی یۆتۆپی فه‌ره‌نساوییه‌کان وای له بیلینسکی کرد که بانگه‌واز بۆ بیری سۆسیالیزم هه‌لبدا. به پێچه‌وانه‌ی یۆتۆپییه‌کان ئه‌یووت سۆسیالیزم له ناو ڕاپه‌رینی جه‌ماوه‌ریدا به دی دێت، له خۆیه‌وه‌و به‌بێ خوێن نایه‌ته دی. له‌گه‌ل ئه‌وه‌شدا سۆسیالیزمه‌که‌ی بیلینسکی زانستی یۆتۆپی بوو، چونکه ڕێگه‌ی دروستی به‌ره‌و سۆسیالیزم و ئه‌و هێزه کۆمه‌لایه‌تی و مێژوییانه‌ی که ده‌سته‌به‌ری به‌دیهێنانی نه‌ده‌بینیی و ده‌ره‌کی به په‌یامی مێژویی پرۆلیتاریا نه‌ده‌کرد، هه‌رچه‌نده هاوسۆزی خۆی به‌رامبه‌ری نکولی له ڕۆلی سه‌رکرده مێژوییه‌کانی نه‌ده‌کرد..لای وابوو که جولێنه‌ری سه‌ره‌کی پێشکه‌وتنی کۆمه‌لایه‌تی - مێژویی و هێزی جولێنه‌ری سه‌ره‌کی بنچینه‌یی له گۆرانه کۆمه‌لایه‌تییه‌کاندا هه‌ر گه‌له...سه‌رنجی دا بۆرژوای جێگیره‌وه‌ی ده‌ره‌به‌گه‌کان ته‌نها بۆ سودی تایبه‌تی خۆیان

دەسەڵاتدارێتی دژ بە گەل بەکارنەهێنن،لە هەمان کاتدا گەیشتە پێشبینییەکی قووڵ دەربارەی"پێویستییە مەتریالیستیەکان"و"داخوازییە مەتریالیستییەکان" لە گەشەکردنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا کە تیایاندا جولێنەری مەزنی چالاکیی ڕەوشتی دەبینیی و دەیووت ئەگەر مرۆڤ پێویستی بەخواردن و جلوبەرگی مەتریاڵ و پێویستییەکانی تری ژیان نەبوایە وا بەردەوام لە دۆخی ئاژەڵدا دەمایەوە. هەروەك دیموکراتە شۆڕشگێڕەکان خاوەن ئومێدی مێژوویی هەڵقوڵاو لەباوەڕ بە هێزی خولقێنەری گەڵ لە لای یەکەم و لە دیدی دیالیکتیکانە بۆ ژیان لە لای دووەم بوون، دیسان بە داپێچییەوە بیری پەرەسەندن و کامڵبونی بێ سنورو یەکبینەی مرۆڤایەتی دووپات دەکردەوە.

مەتریالیزمی بیلینسکی دەستکەوتێکی گرنگی دیموکراسی شۆڕشگێڕیی ڕوس بوو. لە نامەیەکیدا بۆ گێرتسین ئەڵێ:داخم ناچێ کە ناتوانم ئەوەی بڕوام پێیەتی لە دەربارەی ئاین بیڵێم. لەوتارەکەمدا(خوایەك و ئاینێ)تاریکی و پێوەندو قامچی دەبینم"(٧٧).لە نامەیەکی تردا بۆ گۆگۆڵ (١٨٧٤)دوژمنایەتییەکی بێ پایان لە دژی دەسەڵاتداریەتی سەڵتایەتی بەندەگێتی و ئیدیۆلۆژیی کۆنەپەرستانەی کۆنەپەرستی چینە دەسەڵاتدارەکانی دەربڕیوە. لە خەباتیدا دژ بە شۆڕش لینین گرنگییەکی گەورەی داوە بەنامەکەی بیلینسکی بۆ گۆگۆڵ. دیسان لینین لە گوتەیەکیدا"لە ڕابوردووی

ڕۆژنامەگەریی کرێکاریی لە ڕوسیادا؟ بیلینسکی پەسەن دەکات بەو"ئایدیۆلۆگەی"کە لە جوڵانەوەی ڕزگاریخوازانەماندا ڕێگەی بۆ لە ناوبردنی یەکجارەکی نوبەلا خۆشکرد.

لە شوێنەوارە مەزنەکانی ئەم فەیلەسوفە ڕووخستنی نوێی کێشەی هونەرو ئەدەب و نرخ و ڕۆڵی کۆمەلایەتییەبووە... لەدژی تیۆری" هونەر بۆ هونەر"ی ئیدیالیستانە بووەو وای دەبینی کە هونەر ڕەنگدانەوەیەکی ژیان خۆی بووەو هەروەك ژیان لەگۆڕان و پەرەسەندنی هەمیشەیی دایە.. حاشای لەو تێزە ئەکرد کە ئەیووت بیری جونیی بابەتەکانی هونەر پێکدەهێنێ.. ڕاستە جوانیی مەرجێکی پێویستی هونەرەو بێ ئەو پێك نایەت، بەلام هونەری ڕاستەقینە ئەبێ مەسەلە گرنگەکان باس بکات و چارەسەریان بۆ دابنێ و ئەبێ بەباشی ڕوونی ئاوێنەی سەردەمەکەی خۆی بێ. شێوەی هونەریی یەکێکە لەلایەنە گرنگەکانی هونەر، بەلام ئەم شێوەیە ئەبێ ناوەرۆکی هەبێ، ئەبێ پرۆسەکانی ژیان لە هەمە چەشن و دەولەمەندیا ڕەنگ پێبداتەوەو بیری پێشکەوتوانەی سەردەم لە کۆمەلدا بلاویکاتەوەو بەرگری لێ بکات. بۆیە بە توندی"هونەر بۆ هونەرو جوانیی بۆ جوانیی ڕەت دەکاتەوە. ئەم ڕەخنەگرە گەورەیە دیسان مەسەلەی میللیەتی هونەری خستۆتەروو بەمەحەکی هەموو کارێکی هونەریی داناوە.. بیلینسکی داوای لە ئەدیبەکان دەکرد کە ڕۆلی نیشتیمانی خۆیان بەرامبەر بە

گەلەکەیان ببینن و گەل بەرەو پێش بەرن و گیانی سازش نەکردنیان پەروەردە بکەن لە دژی هەموو کۆن و کۆنەپەرستییەك.

**پێکهاتن و پەرەسەندنی دیموکراسی شۆرشگێر لای "گیرتسین" و "ئۆگاریڤ"**

ئەلکسەندەر گیرتسین (١٨١٢ــ١٨٧٠)و نیکولای ئۆگاریڤ (١٨١٣ــ١٨٧٧) دوو هاورێی بیربڵاوکەرەوەی بیری دیموکراسیی شۆرشگێر بوون و هەولیان ئەدا کە گۆرانی سۆسیالیستانە لە روسیادا بکرێ. لە کردارە گرنگە مێژووییەکانیان هێرشەکانیان بوو بۆ سەر سستێمی بەندەگێتی و حوکمی سەڵتایەتی موتڵەق لەروسیادا.پەیوەندییان لەگەڵ تشێرنیشفسکی و هاورێکانی بەست. ئەکتیڤانە هاوبەشییان لە دامەزراندنی رێکخراوی شۆرشگێری نهێنی "زەوی ئازادی"دا کردو داخوازییە نیشتیمانییەکانیان لە بەیانی "ئۆگاریڤ"دا"گەل چی پێویستە"فۆرمەلەکرد.

مەتریالیزمی فەلسەفی لای گیرتسین و ئۆگاریڤ: هەر لە سەرەتای چلەکانەوە یرتسین و لە دوایشدا ئۆگاریڤ روویان کردە مەتریالیزمی ئیلحادی و کەوتنە خەبات لە دژی ئیدیالیزم و غەیبییەتMysticism لە فەلسەفەو زانستەکانی سروشدا. لە بواری پەرەپێدانی نەریتە مەتریالستەکانی روسیادا هەوڵیان ئەدا فەلسەفەو سۆسیالیزم پێکەوە گرێ بدەن، سۆسیالیزمیان بە مەسەلەی سەرەکی فەلسەفەی سەدەی نۆزدەهەم و ئیدیەی شۆرشگێریی ئەو فەلسەفەیەیان دائەنان.

له" نامەکان دەربارەی توێژینەوە لە سروشت"(١٨٤٤ـ١٨٤٥) کە لینین بەرز نرخاندنی، گێرتسین لەسەر پەرەپێدانی فەلسەفەی مەتریالیزم و دیالیکتیک بەردەوام ئەبێ و ڕاستەوخۆ مەسەلە سەرەکییەکەی فەلسەفە: پەیوەندی بیر بە بوونەوە، هۆش بە مەتریالەوە ، دەخاتەڕوو ، ڕەخنە لە ئیدیالیزم دەگرێ چونکە پێچەوانەی ڕاستیبە ڕیالیستەکانە.

ئەو دوو ئیدیۆلۆگە مەسەلەی یەکێتی بوون و بیرـ یان خستەڕوو، ڕۆڵی ئیجابی و ئەکتیفی بیریان دەسەلماندەوە، ئەوەش هاوبەشییەکی دروستی مەتریالیزمی فەلسەفی بوو. هەروەك گێرتسین،یش لە دژی ئیدیالیزمی ئەڵەمانی و لە"خواترسی"Pietism" و تیۆرییە ئاینییە - غەیبییەکان وەستاوەو بەرگری لە دیدی مەتریالیستانە بۆ جیهانی دەوروبەر دەکرد.

بەلای ئەمان تیۆری زانن شەقڵ و مەتریالیستییە ئەندامانی هەستی مرۆڤ کە لەگەڵ شتە دەرەکییەکاندا کارلێك دەکەن بە سەرچاوەی زانینیان داناوە. ئەو باری سەرنجانەش کەلە شتە دەرەکییەکانەوە وەردەگیران ئەقڵ بۆ تێگەیشتەو بیر دیگۆڕین ..دیسان وایان دائەنا کە پەرەسەندنی سەرکەوتوانەی فەلسەفە، زانستەکانی سروشت یەکێتی توندو تۆڵی نێوانیان پێویست دەکات. لە بەرهەمە ئەدەبییەکانیشیاندا بیری دیموکراسی شۆڕشگێڕانە مەتریالیستیانە پەرپێسەند.. گێرتسن گرنگیی ئەدەبی دەردەخست و ئەیووت" ئەدەب بۆ گەلێکی بێبەش لە

ئازادیی کۆمەڵایەتی ، تاکە مینبەرە کە دەنگی بێزاری و دەنگی ویژدانی لێوە ئەبیسترێ".گیرتسین و ئۆرگاریڤ دوو ئیدیۆلۆگی مەتریالیست بوون . دیالیکتیکی هێراکلیس و ئۆرتۆو برۆنۆ و هیگڵ بە تایبەتی و بیرە دیالیکتیکەکان کە زانستە سروشتیەکان خستیانەڕوو بەرز دەیانرخاند. گیرتسین بەرگری لە یاسای پارێزگاریکردنی مەتریال و جولەی لە سروشتدا دەکرد و بۆ نمونە گواستنەوەی جولانەوەی مەتریال لە بارێکەوە بۆ بارێکی ترو گواستنەوەی جولانەوەی مەتریال لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تری دەسەلماندو ئەیووت ئەوە"مەزنترین یاسای سروشتە" و نۆژینەوەیەکی زانستیانەی بەنرخە..لای گیرتسین پەرسەندن لەناو ململانێی دژەکان دەخولقێ."ململانێ لە دەست پێکردندا ئەزەلییەو لە کوتایی هاتنیشدا هەر ئەزەلییە"ئەوە یاسای ژیانە، یاسای پەرەسەندنە، ململانێی دژەکانیش بە نەفی لایەکیان سەرکەوتنی لاکەی تر تەواو دەبێ. بەبێ نەفی ژیان و پەرەسەندن و پێشکەوتن نابێ.

گیرتسین و ئۆگاریڤ لە دیامایکتیک - دا"جەبری شۆرش" یان دەبینی ، سەلماندنەکانیان لە پێویستی کودەتای شۆرشگێرانەو پرۆپاگەندەیان بۆ سۆسیالیزم، ڕۆلێکی گەورەیان لە خۆئامادە کردن بۆ شۆرشی ڕوسیا وازیکرد. لینین لەو ڕووەوە ئەڵێ"دڵسۆزی و لەخۆبوردن بۆ شۆرش و پروپاگەندەی شۆرشگێری لە ناو ڕیزەکانی گەلدا ڕۆڵی خۆی

هەر دەبینێ تەنانەت ئەگەر دەیان ساڵی تەواویش بکەوێتە مابەینی تۆوچاندن و بەرهەم چنینەوە"(٧٨).

لینین بەرز فەلسەفەکەی گێرتسین دەنرخێنێ کە توانیویەتی لە بارۆدوخی ڕوسیای دەرەبەگایەتیدا لە ساڵەکانی پەنجاکانی سەدەی نۆزدەدا بگاتە ئاستێکی بەرز. لە دیالیکتیکی هیگڵ تێگەیشت و بە"جەبری شۆڕش "ی دانا. شوێن پێی فویرباخی هەڵگرت لە جێ هێشتنی هیگڵ، ڕووەو مەتریالیزم.

لایەنگرانی بیلینسکی و گێرتسین لە ئەندامانی ئەلقەی پیتراشیفسکی ـ میخائیل بوتاشیڤتس ـ پیتراشیڤیسکی (١٨٢١ـ١٨٦٦)و نیکۆلای کاشکین(١٨٢٩ـ١٩١٤)و نیکۆلای سیپشینیف(١٨٢١ـ١٨٨٢)و دیمتری ئەخشارۆمۆڤ (١٨٢٣ـ١٩١٠) و ژمارەیەکی تر ڕۆڵێکی گەورەیان لە پەرەپێدانی بیری فەلسەفی و کۆمەلایەتی سیاسی لە ڕوسیادا وازی کرد. ئەم ئەڵقەیە تەبا نەبوو. دوو باڵی تێدابوو شۆڕشگێڕو ناوەڕاست، باڵە دیموکراتە شۆڕشگێڕەکەی کاری بۆ ڕوخاندنی بەندەگێتی و حوکمی سەڵتایەیی ڕوسیا دەکردو ئامانجی دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری دیموکرات و بەدیهێنانی سۆسیالیزمی . بۆیە ڕووی کردە ئامادەکردنی گەل و سەربازەکان بۆ ڕاپەڕین. بەلام ئەمە وای لێ نەکرد کە ڕیفورم فڕێ بداتە لاوە.. ئەم باڵە نەیتوانی لە سۆسیالیزم بوو. یۆتۆپی زیاتر هەنگاو بنێ.. هەرچەندە داوای خاوەنداریتی گشتی زەوی و دەستگا پیشەسازییەکانی دەکرد و لە دژی ڕەگەز پەرستی و شۆڤێنیزم و

کۆلۆنیالیزم و داگیرکەرانی گەلان و دژایەتی کردنی نەتەوەی تر بوو. خاوەندارێتی تایبەتی گەورەو ئاژاوەی بەرهەمهێنان و چەوساندنەوەی مرۆڤ بەدەستی مرۆڤ ـ ی تاوانبار دەکرد.

بەڵام نیکۆلای چێرنیشیفسکی (١٨٢٨ـ١٨٨٩) سەرکردەی بزوتنەوەی دیموکراسی شۆڕشگێڕیی ڕوس و سەرچاوەی ئیلهامی بیری شەست و حەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەم بووە. فەیلەسوفێکی مەتریالیستی تێکۆشەرو سۆسیالیستێکی یۆتۆپی مەزن و ڕەخنە گرێکی ئەدەبیی بەرز بوو. لەگەڵ هاورێکانیدا پلەیەکی نوێ لە پەرەسەندنی فەلسەفەی دیموکراسی و مەتریالیزمی ڕوسییان دەست پێکرد، لە ساڵی ١٨٦٢ـ وەوە چەندین جار گیراوەو حەپس کراوەو حوکم دراوە هەر لەسیبریا نزیکەی نۆزدە ساڵ بەدورخراوەیی ماوەتەوە..بەڵام ئەوانە هیچی نەلە ئیرادەی کەم کردنەوەو نە چۆکی پێ دادا...ولە ساڵی ١٨٨٢دا بە هۆی خزمەکانیەوە گواسترایەوە بۆ ئوستراخان، تەنها لە چەند مانگی دووایی ژیانیدا ڕێگەی پێدرابوو کە لەمەلبەندی لەدایك بونیدا بژی. ڕۆمانی لە زیندانی قەڵای"پیترۆ پاڤلۆڤیکیا"دا"چی بکەین؟ ـ ماالعمل؟"ی دانا کەرۆلێکی باڵای لە پێکهێنانی ئایدیۆلۆژی شورشگێڕی لەناو لاوانی ڕوسیاو دەرەوەیدا بینی.

لینین ئەم فەیلەسوفەی بە دیموکراتێکی شۆرشگێڕی بەرزو پێشەنگی گەورەی سۆسیال دیموکراتی ڕوسیا دانا، لە هەمووان لە سۆسیالزمی زانستی نزیك بۆتەوە، بانگاوێژێکی فەلسەفی ڕەسیو و

فەیلەسوفێکی دیالیکتیکی بووەو دوژمنێکی سەرسەختی هەموو جۆرە ئیدیالیزم و غەیبییەت و کۆنەپەرستی بووە. لە بەرهەمە زۆرەکانیدا هاوبەشیەکی بە نرخی لە پەرەپێدانی تیوری پێشکەوتوو نەریتی مەتریالزمی دیالیکتیکی لە ڕوسیادا کرد.

چێرنیشیڤسکی لای وابوو کە سروشت، بە شێوەی سەربەخۆ لە هۆش، لە ئارادایەو لە پێش هەموو شتێکدایە. زەمان و زەمین دوو شێوەی بنچینەیی بونی مەتریالن. ئەیوت ئەگەر بێت و هەردوو تێگەیشتەی زەمان و زەمین لەهەردوو تێگەیشتەی جولەو مەتریال بکەینەوە وا جوڵەو مەتریال لە خۆیانەوە ون دەبن.. بەرگریی لە یەکێتی بوونی مرۆڤایەتی ئەکردوو پەرەی پێ دەدا...لە مەلبەندی مەتریالزمەوە پەرەی بە تیۆری زانیندا، بەڵام لەدیدی ئەنسرۆپۆلۆژیشدا سنووردار بووە، ئەوەش بەتایبەتی لە شیکردنەوەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکاندا دەردەکەوێ، هەندێ جار لەکاتی توێژینەوەی لە ململانێی چینایەتی ناو کۆمەڵ، ئەیویست ئەو ململانێیە بکاتە خەسلەتی سروشتی مرۆڤایەتی.

لینین پەنجەی بۆ سنور تەسکی پرنسیپی ئەنسرۆپۆلۆژی لە فەلسەفەکەی چێنیشیڤسکی و فیورباخدا ڕاکێشا. دانانی پراکتیکی مرۆڤایەتی لە ناو تێۆرۆی گرنگیەکی پرنسیپی قوڵی هەبوو بۆ تیۆرۆی فەلسەفی کە پێویستی گۆڕانی شۆڕشگێرانەی کۆمەڵگا ئاشکرا ئەکات. چێرنیشیڤسکی ئەوەی دوپات کردەوەکە زانیاری تێۆری ئەبێ لە

خزمەتی ژیان و مەسەلە پراكتیكیەكاندابێ ، دەركی بە گرنگی گەورەی تیۆری كردكە بێ ئەوە جۆلانەوەی شۆرشگێرانە ناتوانێ بالآ بكات و بەهێز ببێ. هەروەك دیموكراتەشۆڕشگێرەكانی تری ڕوسەكان داپێچی لەسەر بایەخی چارەسەری دروستی مەسەلە تیۆرەكانی ئەكرد، چونكە (پۆچەڵی تیوری بێگومان دەبێتە هۆی زیانی پراكتیكی). ئەم ئیدیۆلۆگە دیالیكتیكی بەكاردەهێنا تالەڕوی تیوریەوە پێویستی ململانێی چینایەتی و شۆرشی گەلی و بەدیهێنانی پرەنسیپەكانی و پێشكەوتنی مێژویی بەگشتتی بسەلمێنێ.

پەرەسەندنی كۆمەڵایەتی لای ئەم پەرەسەندنێكی پێچاوپێچەو لەناو ململانێی توندو تیژی نێوان هەژارو دەوڵەمەند، خاوەن مولك و بەش خوراوەكان دروست دەبێ، لای وابوو كەدابەشبونی چینایەتی ئەنجامی دابەشكردنی نابەرابەری سامانی ئابوریە.

پرنسیپەكانی جوانیی پەرەی بەدا. بەتوندی ڕخنەی لەتیۆری (هونەری پوخت) و (هونەر بۆ هەنەر)ی ئیدیالیستی كۆنە پەرستانە گرت. چونكە ئەوەی هونەر دێنێتە ژیانەوە هەرباروذۆخی ژیانی پراكتیكیی گەلە. ئەم ئیدیۆلۆگە وای ئەبینی كەئەركی نوسەر یاهونەرمەند گێرانەوەی ڕاستگۆیانەو سەرجەمیی گرنگترین تێندێنس و ڕێبازە مێژوییەكانی ژیانە، گێرانەوەیەك كەئامانج لێی بەهێزكرنی ویستی خۆێندواری بێ بۆسەرلەنوێ بیناكردنەوەی واقیع لەسەر

بنچینەیەکی لۆژیکی تر. دیسان دەیوت (ئەدەب هەر دەبێ لەخزمەتی ئەم یان ئەو ڕێبازی ئیدیەدابێ).

راسۆسیۆلۆژیەیکیەکانی چێرنیشیفسکی - هەروەك ڕای دیموکراتە شۆڕشگێڕەکانی تر پڕبوون لەبەئومێدی مێژوی و باوەڕی قوڵ بەکۆمەڵ بەجۆرێك کەسەرەرای هۆو کۆسپ و پەناوپێچەکانی بەردەمی نەوستاوە بەڵکو بەرەو پێشەوە دەڕوات. دیدەکانی ئەم فەیلەسوفە بۆ کۆمەڵ زۆر پێشبینی مەتریالستانەی قوڵی تێدابووە... ئەوەی خستەڕوو کەژیانی کۆمەلایەتی بەپێی خواستی(ئیدیەی موتڵەق) بەڕێوەناچێت بەلکو بە پێی یاسا تایبەتیەکانی خۆی دەڕوات. دیسان ئەو تیوریە کۆنەپەرستانەیەی بەدرۆرخستەوە کە دەڵێ گەلی هەلبژاردەو بەرز هەیە.

ململانێی چینایەتی ناو کۆمەلگای بە دیاردەیەکی تەواو یاسای دانەناو لای وابوو کە بیرەکانی ململانێی چینایەتی لەسەر برۆا بە هێزی خولقێنەری گەڵ ڕادەوەستێ..

هەرچەندە ئەم فەیلەسوفە نەگەیشتە ئاستی مەتریالیزمی مێژووی و نەگەیشتە ئاستی برۆاکردن بەرۆلی دیاریکراوی شێوەی بەرهەمهێنانی مەتریالیستی، بەلام دانی بەرۆڵی گەورەی چالاکی پراکتیکی گەلدا ناو بایەخێکی تایبەتیدا بە پەرەسەندنی پیشەسازی، لای وابوو کە پەرەسەندنی مێژویی و کار لە کارتێکردنی ناوەندی جوگرافی کەم دەکاتەوە هەرچەندە نکولیشی لە رۆڵی ئەمیان نەدەکرد.

ئەم فەیلەسوفە قەڵەمبازی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی یان شۆرشە سیاسیەکانی بەرووداوی مەزنی ناپرۆسەی ـ کۆمەلایەتی مێژوویی دادەناو دەیوت: ئەوانە رێگای دروستی مرۆڤایەتییە بۆ رزگار بوون لە کۆیلەیەتی سیاسی و ئابوری و گیانیی.. شۆرشی بە لەبارترین و سەرکەوتوترین قوتابخانەی روناکبیرکردن و پەروەردەی جەماوەری گەل دادەنا.. بە گەرمی خەوی بە گۆرانە سۆسیالیستییەکانەوە دەبینی، هەرچەندە بیرە سۆسیالیستیەکانی شەقلی یۆتۆپی هەلگرتبوو سۆسیالیستی میشاعەی جوتیاری بوون، لەگەڵ ئەوەشدا لەروی ئۆرگانیکەوە لەگەڵ دیموکراتی شۆرشگێردا تۆابۆوە.

لینین ئەڵێ: لە خەباتی جەماوەریدا داوای شۆرشی جوتیاری ئەکردو بەو مەبەستەی هەموو دەسەلاتی کۆن.

مارکس دەڵێ: چێرنیشیفسکی تاکە ئیدیۆلۆگ بوو لەناو هەموو زانا ئابوریەکانی ئەو سەردەمەدا بەکردەوە رەسەن بوو... دانراوەکانی پربوون لە رەسەنی و هێزی بیرکردنەوەو قوڵی.(٧٩)

دیسان لینین دەڵێ: چێرنیشیفسکی تاکە نوسەری مەزنی رووس بووە کە توانی لە پەنجاکانەوە تا ساڵی ١٨٨٨ لە سەر ئاستی مەتریالیزمی فەلسەفەی رەسیو بمێنێ... بەلام نەگەیشت یان رونتر، نەیتوانی بگاتە ئاستی بەرزی مەتریالیزمی دیالیکتیکی مارکس و ئنگلس، ئەوەش بەهۆی دواکەوتویی ژیانی گەلی روسەوە بوو..(٨٠)

**نیکۆلای دۆبرۆلیۆڤ :**

ئیدیۆلۆگێکی مەتریالیستی قوڵ و ڕەخنەگرێکی ئەدەبی درەوشاوە بوو. حوکمی موتڵەق و بەندەگێتی و لیبرالیزمی بە دوژمنی سەرەکی خەباتی ڕزگاری خوازانە دادەنا. لەگەڵ دیموکراتە شۆڕشگێڕەکاندا خەباتی بۆ گۆڕانە شۆڕشگێڕەکان دەکردوو خەوی بە سۆسیالزمەوە دەبینی. ڕەخنەی لە ئیدیالیزم و نازانمی و دوانەیی لە زانستدا دەگرت، هەڵوێستێکی مەتریالیستانەی چەسپیوی لە بەرامبەر مەسەلە تیوریەکانی زانیندا گرت و ڕەخنەی لە تیوریە میتافیزیکییەکان لەسەر( پرنسیپەکانی ژیانی هەمیشەیی) دەگرت و ئەوەی دوپات دەکردەوە کە هەموو دیاردەکانی سروشت و کۆمەڵ دیاردەی کاتی بگۆڕن... ئەوەشی دەسەلماند کە(یاسای نەگۆری پەرەسەندنی مێژوویی) هەیە و لە خواستی خەڵك سەربەخۆیە.

ئەم فەیلەسوفە سەیری جەماوەری گەلی وائەکرد کە هێزی بزوێنەری پەرەسەندنی کۆمەلایەتی مێژوییە. نرخی پێشکەوتوانەی گۆرینی سستێمی دەرەبەگەیاتی، بەسەرمایەداری دەسەلماند. بەلام سەرنجی ئەوەشی دا کە گوزەرانی چینەکانی کرێکاران لەژێر سایەی ئەم ڕژێمە نوێیەدا هەر بەخراپی مایەوە. لێزانانە پرنسیپەکانی مەتریالزمی فەلسەفی و دیالیکتیکی لە زانستی جوانی و ڕەخنەی ئەدەبیدا بەکارهێنا. ئەیوت نوسەری پێشکەوتخواز بەرامبەر بە ژیان بێلایەن ناوەستێ، بەڵکو لە پێناوی بەرژەوەندی بنچینەی گەلدا خەبات دەکات. مارکسیستە کلاسیکیەکان بەرز ڕۆڵی ئەم فەیلەسوفەیان نرخاندووە..

**رای فەلسەفی و سۆسیۆلۆجی میللیە شۆڕشگێڕەکان:**

ئایدۆلۆژی شۆڕشگێرە میللییەکان لە ڕوسیادا لە کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا پێکهات..لە ئیدیۆلۆگە بەناوبانگەکانیان (پیوتەرلاڤرون) و (میخائێل باکونین) بوو. بەگوێرەی شێوەو ڕێگەی خەبات بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان بوبون بە سێ بەشەوە: میللیە هاندەرەکان، میللیە ئاژاوە چیەکان، میللیە کودەتاییەکان. لینین ئەڵێ بنکەی کۆمەڵایەتی میللییەکان چینی بەرهەمهێنەرە گچکەکان بوو کە دوای ڕیفورم لەروسیادا بڵاوبونەوە.. هەرچەندە لینین ڕەخنەی لە میللییەکانی شەست و حەفتاو هەشتاکان دەگرت بە هۆی تێندێنسی خۆیان لە سۆسۆلۆژیدا، زیاد پێ هەڵدان بە میشاعەی جوتیاری و ناو پاتریارکی و لەبەر ئاژاوەو تەکنیکی تۆقێنەرانەی سەڵتایەتییان و هەڵەکانی تریان... بەڵام بەباشی دیموکراسییە گونجاوو خەباتە فیداکارانەکەیان لە دژی زۆرداری و دامەزراندنی ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕی نەهێنی و خستنە ڕوی چارەنوسی پەرەسەندنی سەرمایەداری ڕوسیای دەنرخاند.

پیوتەر لاڤرۆن: ئیدیۆلۆگێکی دەرکەوتووبوو، لە ساڵی١٨٧٠دا لە دورخراوگەکەی هەڵهات بۆ دەرەوەی ڕوسیا.. دەستی کرد بە چالاکی شۆڕشگێڕانەی گەرم، هاوبەشی کۆمۆنەی پاریس و ئەنتەرنناسیۆنالزمی یەکەمی کرد. لە مارکس و ئینگلز نزیك بوەوە،هاوبەشی کارەکانی کۆنگرەی یەکەمی ئەنتەرناسیۆنالزمی دووەمی کرد.

جولانـەوەی کرێکـاری لـە خۆرئـاوادا و چـالاکی ئەنتەرناسـیۆنالزمی یەکـەم و کۆمۆنـەی پـاریس و بەدڵـەدیی لـە دانراوەکـانی مـارکس و ئنگلس.. کارێکی گەورەیان هەبووە لـە سـەر پێکهـاتنی بـیری لافـرون.. بەرهەمەکانی ئەم فەیلەسوفە: (شۆرشی کۆمەڵایەتی و ئەرکی ڕەوشت ) و( کۆمۆنەی پاریس) و ئەوانی تر بەڵگەی ئەو ڕاستییەن..

لینین، یۆتۆپیی لافرۆن و مـەزەبی و میللیـی و سەرلێشێوانی خـۆی، ڕەخنەی لێگرتووە. لەهەمان کاتدا باوەڕی شۆرشگێڕانە و خەباتی دژبـە زۆرداری و بلاوکردنـەوەی بـیری شۆرشـگێرانەی بـاش هەڵسـەنگاندووە، ناوی ناوە (جەنگاوەری تیوری شۆرشگێڕانە) (٨١).

**بـەڵام میغانیـل بـاکۆنین ١٨١٤ــ١٨٧٦** تیورسـتی سـەرەکی میللییـە ئاژاوەچیەکان بوو. دوای ئەوەی چووە ئەنتەرناسیۆنالزمی یەکەمـەوە، دەستی کردووە بـە ململانێیـەکی سـەخت لـە دژی مـارکس و ئـنگلس و لایەنگرەکانیان، بۆیە دەریان کرد.

بیروبۆچـوونەکانی لـە"دەولـەت و ئـاژاوە"(١٨٧٣)و" سۆسـیالزم و ئیلحاد" دا بـلاو کـردەوە. ئـەم ڕێبـازە هـەروەك تـەیارێکی کۆمەڵایـەتی ئیـدیۆلوژی چـینەکانی پیتـی بـرژواو خلتـەی پرۆلیتاریـا" بـوو بـەهۆی جێگیربـونی دەسـەڵاتی سـەرمایەی گـەورەوە تـوش هـاتبون بـۆ دەربازگەیەك دەگەران تالەو گۆڕانە ڕزگاریان بێ، ئەویش بـەیاخیبوونی خۆکارو داتەپانی دەوڵەت. باکۆنین جودایی چۆنایەتی پرنسیپی نێوان دەوڵەتی بۆرژواو دەوڵەتی پرۆلیتاریا هی نێوان دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا

ودیکتاتۆریەتی بۆرژوای ئەدەبینی، هەردووکیانیشی وەکو یەك ڕەفز دەکرد.

باکونین لای وابوو کەشۆرشی کۆمەڵایەتی لەشێوەی یاخی بوونی جیهاندایە کەجەماوەری ڕەتاوەی جوتیارولۆمپێن - پرۆلیتاریا پێی هەڵدەستێن.. کەلەو ولاتانەوە بەرپا دەبێن و تیایا پرۆلیتاریا پیشەسازی زاڵ نییە بەڵکو زۆربەی جەماوەرە نەپساویان لەنێو ڕێبازی ئاژاوە چینەکان کرد...

## ٢ـ بیری فەلسەفەی سۆسیۆلۆژی لای گەلانی ڕوسیای قەیسەری لەچەرخی نۆزدەهەمدا...

لەژێر کارتێکردنی باری گرژی ستێمی دەربەرەگێتی - بەندەگێتی و ڕوخاندنی و بەنشونماکردنی خەباتی ڕزگاریخوازی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا... کلتوری شۆرشگێرانەو بیری کۆمەڵایەتی پێشکەوتوانە لەلای گەلانی ئوکرانیاو ڕوسیای سپی و پشتی قوقاس و کازخستان و ئاسیای ناوەراست و گۆمی بەڵتیك و گەلانی تری ڕوسیای قەیسەری پەرە پیسەند...

ىسیان مێژوی بیری فەلسەفی وکۆلایەتی - سیاسی لای گەلانی ڕوسیای قەیسەری لەسەدەی نۆزدەدا بەتوندی بەمێژوی جوڵانەوەی

ڕزگـاری خوازانــەی گەلــی ورس و کلتــورە پێشــکەوتوانەکەیەوە بەستراوەتەوە.

**ئوکرانیا:**

لەســەدەی نــۆزدەدا پلەیــەکی نــوێ لــە پەرەســەندنی کــەلتوری پێشــکەوتوانەی گــەلی ئوکرانیــا دەســتپێکرد، لــە نــاو خــەباتی دژ بەبەندەگێتی و قەیسەریەتدا، ڕێبازی دیموکراسی شۆڕشگێر خەملی. لە نــاو بــەناوبانگترین نوێنــەرانی :"تــاراس شفیتشــگۆ"، " لیســیا ئۆکراپینکــا"، "م.کۆتسیۆبینســکی"و ژمارەیــەکی تــر بــوون. ئــەم فەیلەسوفە

---

خڵتــەی پرۆلیتاریــا ـ لــومپن ـ پرۆلیتاریــا: ئەوتوێــژە ناچــینایەتیە بــێ بەرهەمەیەکەلــە کۆمەلگــەی ســەرمایەداریدا دروســت دەبــێ وەك: تاوەنكــارو پەڕەوازەو قەحبەو دەروازەكەرەكان.

مەلحیدانە خەباتێکی توندیان لە دژی ئاین و ئیدیالیزم لە فەلسەفەدا کرد" تـاراس شیڤتشـگو" سـەرکردەی بـیری جولانـەوەی دیموکراسـی ـ شۆڕشگێری ڕوسیاو نوێنـەری دەرکـەوتوی بـیری فەلسـەفی ئوکرانیـای سەدەی نۆزدەیەم بوو. ڕۆڵێکی گەورەی لە پەرەپێدانی هۆشـی خـۆی و نیشـتیمانی و کۆمەلایـەتی گـەلی ئۆکرانیـا وازی کـرد، ئـەوەش بـەهۆی

نوسینەکانیەوە بو کی پڕبون لە ڕق و کینەی جۆش سەندوی دژیە زۆرداران.

بەرگری لە واقیعی بابەتی جیهان و ئەزەلیەتی مەتریال و لە ناوچونی نەکرد، لای ئەم سروشتە نەمرەو بێ کۆتاییە، لە هەمەرەنگیدا و هەموو پروسەو دیاردەکانی ناوی لە جوڵان و گۆڕانی یەکبینەدان، بەڵام ڕیشەی چینایەتی ئاین و ڕێگەو شۆێنی سەفرازبوونی نەدەبینی. لە لێکدانەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا ئیدیالیست بوو، هەرچەندە بۆچونەکانی هەندێ ڕەگەزی تێگەیشتەی مەتریالزمی دیالیکتیکی تیا بووە...داوای سۆسیالزمی جوتیاری یۆتۆپی دەکرد. جوانی ناو سروشت و ژیانی بە سەرچاوەو سەرەتای هونەر دائەنا.لە کاتێکدا کە ئیدیالیستەکان"ئیدیەی جوانی"یان بە سەرچاوە دائەنا. بەڵام سیڤان فرانکۆ: نوسەرو ئیدیۆلۆگی دەرکەوتوی ئۆکرانیا زانا و زانای ئابوری و فەیلەسوفێکی بەرز بوو. بەرگری لە مەتریالزم دەکرد...مولحید و دژ بە هەمووو ئاینێك بوو. ئیدیۆلۆگیی مارکسیزم کارێکی باشی کردە سەر فرانکۆ. لە کۆتایی حەفتاکانەوە بایەخی دا بە سۆسیالزمی زانستی، هەندێ بەشیلە "سەرمایە"ی مارکس و"ئەنتی دۆهرینگ"ی ئینگلس وەرگێڕایە سەر زمانی ئۆکرانی و وتاری دەربارەی" بەیانی پارتی کۆمۆنیست" ئەنوسی.. هەرچەندە ئەم فەیلەسوفە ژمارەیەکی زۆر لە بابەتەکانی مارکسیزم تێگەیشت و ڕەواجی بە هەندێ لە بیرەکانی دەدا، بەڵام نەبوو بەلایەنگرو بانگاوێژی مارکسیزم.

**روسیای سپی و لیتوانیا:**

کۆنستانتین کالینۆفسکی١٨٣٦ــ١٨٦٤ نوێنەرێکی بەرزی بیری کۆمەڵایەتی پێشکەوتوو سەرکردەی خەباتی ئازادیخوازانەی جوتیارانی ڕۆسیای سپی بوو. کارتێکردنی دیموکراتە شۆڕشگێڕەکانی ڕوسدا بیروڕاکانی دروست بوون. بڕوای وابوو کە ئازادی تەنها بە تێکۆشانی چەکداری بەدەست دەهێنرێ. داوای کۆماری دیموکراسی دەکرد کە لەسەر پرنسیپەکانی ئازادی و یەکسانی دابمەزرێ.

دیسان"ئەنتاناس ماتسیکیڤیتشۆس" ڕۆلێکی بڵندی لە مێژوی گەلی لیتوانیا و جوڵانەوەی ئازادیخوازانەیدا بینی... بەرگریی لە جوتیاران ئەکرد کەداوای ئازادی و زەویان ئەکرد. لە ساڵی١٨٦٢دا لەگەڵ هاورێکانی سەرکردەی ڕاپەرینەکەی جوتیارانی لیتوانیای کرد.

**پشتی قۆقاس:**

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا لە ژێر کارتێکردنی کلتوری پێشکەوتوانەی فەلسەفەی مەتریالیزم لە ناوچەکانی پشتی قۆقاس: ئەرمەنستان و جۆرجیاو ئازەربایجان پێکدەهات.

**ئەرمەنستان:**

لە ئەرمەنستان شاعیرو ئیدیۆلۆگی بە ناو بانگی ئەرمەنی میکائیل نالبەندیان(١٨٢٩-١٨٦٦) بانگی بۆ بیری مەتریالیزم ئەدا. بە بیرەکانی

هاوڕێی دیموکراته شۆڕشگێڕەکانی ڕووس بوو، ڕەخنەی لە فەلسەفەی ئیدیالیزمی ئەڵەمانی دەگرت. وا سەیری ژیانی کۆمەڵایەتی ئەکرد کە پرۆسەی ململانێیە لە نێوان هێزە پێشکەوتنخوازەکان و هێزە کۆنە پەرستەکاندا کە تیایا نوێ و پێشکەوتو سەردەکەوێ. بەڵام نالبەندیان نەگەیشتە ئاستی مەتریالزمی مێژویی. ئەم ئیدیۆلۆگە سۆسیالیستێکی یۆتۆپی بوو کاتێ دەریخست کەڵەڕۆڵی مێژویی پرۆلیتاریا تێنەگەیشتووەو ئەوەی دەوتەوە کە جوتیاران بە سەربەخۆ ئەتوانن دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتی بەدەست بهێنن، ئەیوت لە ڕێرەوەی میشاعەی لادێوە ئەتوانرێ سۆسیالزم دابمەزرێ چی لە ڕوسیا و چی لە ئەرمەنستان.

**جۆرجیا:**

ئیلیا تشافتشافادزێیە(۱۸۳۷ـ۱۹۰۷) دەرکەوتووترین ئیدیۆلۆگی کلاسیکیی ئەدەبی جۆرجیا و یەکێك لە جەماوەریترین سەرکردەی جولانەوەی ڕزگاریخوازانەی نیشتیمانی جۆرجیای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم بوو. لە فەلسەفەکەیدا مەتریالیستی بوو، گومانی لە بونی بابەتیی جیهانی نەبوو. لە ڕێرەوی خەباتیدا لە دژی ئیدیالیستە غەیبیەکانی جۆرجیا هەوڵی ئەدا ئەوە بسەلمێنێ کە بنچینەی زانیاری مرۆڤ"گیانی یەزدانی" یان ئیدیە نییە، بەڵکو دەرکی هەستی مرۆڤ خۆیەتی . جوڵە لای ئەم خاسیەتێکی بنچینەیی سروشتە. جوڵەو پەرەسەندن لە ڕێرەوی ململانێ و پێکدادانی دیدی جیاجیا پێك دێت.

ئـەم فەیلەسـوفە ڕۆڵێکـی گـەورەی لـە مێـژوی ژیـانی فەلسـەفی و کۆمەڵایەتی ـ سیاسی لـە جۆرجیـای سـەدەی نۆزدەهـەم وازی کـرد کـە لەگەڵ ئیدیۆلۆگە پێشکەوتوخوازەکانی تردا زەمینەیان بۆ پەخشـکردنی مارکسیزم خۆشکرد.

**ئازەربایجان:**

مـیرزا ئاخونـدۆف (١٨١٢ــ ١٨٧٨) ئـەدیبێکی بـەرز و ڕونـاکبیرێکی دیمـوکرات و دامەزرێنـەری مـەتریالیزم و ئیلحـاد بـوو لـە ئازەربایجـان. بەڵام ئیلحادییەکان بە سنورو ڕوناکبیری بوو، نەیتوانی بنەچەی ئـاین و ڕەگ و ڕیشەی کۆمەڵایەتییەکانی لێکبداتەوە. بەڵام بە خـەباتی لـە دژی ئـاین و جەبرییـەی ئـاین یـەکێك لـە پایـەگا سـەرەکییەکانی زوردارییـی ڕۆژهـەلاتی هێنایـە لـەرزین. لەمەلبەنـدی دیموکراسـییەوە ڕەخنـەی لـە سسـتێمی کۆمەڵایـەتیو میریـی خۆرهـەڵاتی دەرەبـەگێتی و ژیـان و ڕەوشتی ئەو خۆرهەڵاتە و زۆرداریی خۆرهەڵاتی کەبێ ڕەزاترین شێوەی زۆرداری دەرەبەگایەتی بووە، گرتووە.

**ئاسیای ناوەڕاست:**

لـەژێر کـارتێکردنی کلتـوری پێشـکەوتوانەی ڕۆسـدا لـە ئاسـیای ناوەڕاسـتدا کـە دواکـەوتوترین ناوچـەکانی ڕوسـیای قەیسـەری ئـەو سەردەمە بووە، ڕێبازێکی نوێ لە بیر- ڕێبازی ڕونـاکبیری دەرکـەوتووە. نوێنـەرانی ڕونـاکبیریی بـەڕەنگاری نوێنـەرانی ئیـدیۆلۆگی دەرەبـەگێتی

کۆنەپەرست بوون. دیسان لە دژی هێشتنەوەی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییە پاتریارکییەکان بوون.

ئەحمەد دونیش(١٨٢٧ــ١٨٩٧) ناودارترین تۆێنەرەی بیری پێشکەوتووی ئاسیای ناوەڕاستبوو. لە بوخارا- تاجیکستان - هاتۆتە جیهانەوە. لە فەلسەفەکەیدا ئیدیالیست بوو. گیانی یەزدانیی بە فاکتوری بوون دائەنا، بەڵام لای وابوو کە گیانی مرۆڤی سەڵت هەر لەلەشدا ئەبێ بە لەناوچونی ئەو ئەمیش لە بەین دەچێت. یەکەم کەس بوو کە ڕەخنەی گرتووە لە سستێمی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی میری لە بوخارادا. داوای ریفۆرمی ئەکرد.. لە ڕۆژانی دوایی ژیانیدا گەیشتە ئەو باوەرەی کە دەبێت پەنا ببرێتە بەر ڕێبازی ڕادیکاڵانەتر، بەتوندوتیژیشەوە، بۆ ئەوەی بەو ڕێگایە گوزەرانی گەل باش بکرێت، بەڵام بە ئاشکرا داوای ڕۆخاندنی سستێمی فەرمانڕەوای نەئەکرد.

ئابای کونبانبایف (١٨٤٥ــ١٩٠٤) شاعیرو ڕوناکبیری پایەبەرزی کازاخستان بوو. تێندێنسی مەتریالیزم و ئیدیالیزم لە بیروراکانیدا تێکەڵبوبون. ڕەخنەی لە ڕێگەو شوێنەکانی سەنگی ڕەوشتی کۆمەڵگەی دەرەبەگێتی پاتریارکی ئەگرت کە کەتیایا "کوڕ باوك و برا براکەی دەفرۆشێ" لە پێناو سامان و دەستکەوتی تایبەتیدا. هێرشی دەکردە سەر مشەخۆریی چینە چەوسێنەرەکانی کە بێز لە کار دەکەنەوە. ڕا ڕوناکبیرییەکانی ئابای، باڵا پێکردنی پایەی ئەقڵی مرۆڤ و تاوانبارکردنی نەزانین و خوو و نەریتی کۆنەپەرستانەی ئایینی، بوون ئەوانە بایەخێکی

پێشــکەوتوانەی گرنگیــان لــە بــارودوخی کۆمەڵگــەی دەرەبــەگێتی پاتریارکیدا هەبووە.

**لاتڤیاو ئەستونیا:**

دیــارترین نوێنــەری بــیری پێشــکەوتو لــە لاتڤیــای چــەرخی نۆزدەهەمــدا"پیوتــەر بــالود"(١٨٣٩ــ ١٩١٨) بــوو. ئیــدیۆلۆگێکی مەتریالیست و مولحید بووە، شان بەشانی دیموکراتــە شۆرشــگێرەکانی ڕوس خــەباتی نەپســاوی لــە دژی زۆرداری دەکــرد بۆیــە ســیبریا دورخرایەوە.

"یان ڕاینیس"شاعیرێکی شۆرشگێرو ئیدیۆلۆگێکی مەزنی لاتڤیا بوو، لــە دانراوەکانیــدا بــیری مــەتریالیزم و دیــالیکتیکی بڵاوکردوتــەوە. پەرەســەندن لای ئــەم لــەناو ململانێــی نــوێ لەگــەڵ کۆندایــە و کــە بەســەرکەوتنی نــوێش تــەواو دەبــێ. لــە ژێــر کــارتێکردنی کردارەکــانی مــارکس و ئــنگلس و بلیخــانۆف و بەتایبــەتی لیــنین لــە دیمــوکراتی شۆرشگێرەوە بوو بە سۆسیالستی پرۆلیتاری. بــەڵام نــەبوو بەلایــەنگری تەواوی مارکسـیزم و نــەیتوانی بگاتــە ئاســتی مەتریالیزمی دیــالیکتیکی تەواو.

لە ئەسـتۆنیای سـەدەی نۆزدەهەمـدا کـارل یاوبسـۆن(١٨٤١ـ١٨٨٤) وەك ئیدیۆلۆگێکی مەتریالیستی ڕوناکبیری و"ئەدواردڤیلدە"ە نوسەری

بەرزو دیموکراسی شۆڕشگێڕ، کاریان بۆ بڵاوکردنەوەی بیری پێشکەوتوانە دەکرد.

**٣- ڕێبازە پێشکەوتووەکانی بیری فەلسەفی و کۆمەڵایەتی لای گەلانی ئەوروپای خۆرهەڵات لە سەدەی نۆزدەهەمدا:**

شان بە شانی ئیدیۆلۆگە پێشکەوتنخوازەکانی گەلانی ڕوسیای قەیسەری.. فەیلەسوفە پێشکەوتنخوازەکانی گەلانی ئەوروپای خۆرئاواش بەتایبەتی فەیلەسوفە ڕێباز دیموکراتە شۆڕشگێڕەکان هاوبەشیەکی زۆریان لە پەرەپێدانی فەلسەفەی پێش مارکسیزم کرد. لەو سەردەمەدا لە ولاتانی ئەوروپای خۆرهەڵاتدا لە بارودوخی گەشەکردنی بزوتنەوەی جوتیارانەی دژ بە دەرەبەگایەتی و لە پەرەسەندنی خەباتی ڕزگاریخوازانەی نیشتیمانی دژ بە دەرەبەگایەتی لە پەرەسەندنی خەباتی ڕزگاریخوازانەی دژ بە داگیرکردنی بێگانە بیری فەلسەفی نەشونمای ئەکرد.

سەرچاوەی تیوریی بیری فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و جوانیی لە ئەوروپای خۆرهەلاتی سەدەی نۆزدەهەمدا... فەلسەفەی ئیدیۆلۆگە مەتریالیستەکانی ئەوروپای خۆرئاوا(لەسەدەی هەژدەو نۆزدەدا) و دیالیکتیکی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی و سۆسیالزمی یۆتۆپی - ڕەخنەیی بووە، دیسان هەندێ جار دیموکراسی شۆڕشگێڕی ڕوس و فەلسەفە مەتریالیستەکەی و ڕای جوانیی ڕیالیستەکانی سەدەی

نۆزدەهەم یەکێك لەو سەرچاوانەی پێك دەهێنا. دیسان ئیدیۆلۆگەکانی ئەورووپای خۆرئاوا پەناشیان بۆ کەلەپوری فەلسەفی گەلەکانیان دەبرد.

ئەو پەرەسەندنەی ئیدیۆلۆگی دیموکراسیی شۆرشگێر بووە هۆی گۆران و چونە ناو پلەیەکی نوێ لە پەرەسەندنی مەتریالیزمدا.. ئەوەش هەنگاوێك بەرەو پێشەوە، چونکەئەو پەرەسەندنەی فەلسەفە، بیرەکانی دیموکراسی شۆرشگێرو پرنسیپەکانی سۆسیالزمی یۆتۆپی و دیالیکتیکی هیگلیی پێکەوە کۆکردەوە کەلە مەڵبەندی رەخنەگریی سەرنجلێدراوەو چارەسەرکران و لێکدرانەوە. نوێنەرانی بیری دیموکراسیی شۆرشگێر لە بیری مارکسیزم نزیك بونەوەو بوون بە یارمەتیدەرێکی گەورەی پەرەسەندنی ئەو بیرە. راستە کە دیمبۆفسکی، پوتیف، مارکوفنش و دیموکراتە شۆرشگێرەکانی تر دوای خوێندنەوەی کردارەکانی مارکس و ئنگلس نەبون بە ئیدیۆلۆگی مارکسیست، بەلام رۆلی پێشەنگی مارکسیستانەیان لە وڵاتانی خۆیاندا وازی کرد.

لە قۆناغی گواستنەوە لە دەرەبەگایەتییەوە بۆ سەرمایەداری، بیری دیموکراتی شۆرشگێر لە پۆلۆنیا، بولگاریا، سرب، تشیکا، سلۆفاکیا، هەنگاریا رۆمانیا لە سەدەی نۆزدەهەمدا پەرەیسەند کە لە زۆر کاتدا شەقامێکی مەتریالیستی هەبوو، هەندێ جاری تریش بیری دیالیکتیکانەی قوڵی تیابووەو خزمەتی خەباتی رزگاریخوازانەی جەماوەری گەلی کردووەو بنچینەی تیوری شۆرشی دیموکراتی و زانست و کولتوری پێشکەوتوانەی پێکهێناوە.

دیموکراته شۆڕشگێڕەکان بەوە لە فەیلەسوفەکانی پێش مارکسیزم جیادەکرانەوە کە بە دابراوی کاریان نەدەکرد بەڵکو بەم یان ئەو شێوە بـە جوڵانـەوەی ڕزگاریخوازانـەی گەلـەوە بەسـترابونەوەو بەرژەونـدی جەماوەری پێشێلکراویان تەعبیر لێدەکرد بە تایبەتی جوتیاران.

مـەتریالیزمی دیموکراتـە شۆڕشـگێرەکان و دیـدە دیالیکتیکـەکانیان مـەزنترین بەرهەمـە تەواوکـەرەکانی فەلسـەفەی مـەتریالیزمی پـێش مارکسیزم بووە. دیسـان دیموکراتـە شۆرشـگێرە بـەتواناکان خـەباتێکی نەپساوی سازش نەزانیان لە دژی هەموو جۆرە ئیدیالیزمێك كـردووە تـا بەمەتریالیزمی دیالیکتیکیشەوە لکان.. بـەڵام هـەروەك لینین ئـەڵێ لـە بەردەم مەتریالیزمی مێژوییدا وەستان(٨٢).

**٤ـ ئیدیۆلۆگە دیموکراتە شۆرشگێرەکانی چین لە سەدەی نۆزدەیەمدا.**

هەر لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە وڵاتی چینی دەرەبەگایـەتی دەگۆڕا بـۆ نیمچـە کۆلـۆنی. زیـادبونی دەسـەڵاتی دەوڵـەتانی بیـانی لـە چـینداو سیاسـەتی خیانەتکارانـەی خێزانـی دەسـەڵات بـە دەسـتی مەنشـوریا بـووە هـۆی زیـاتر نـارەزایی هێـزە پێشـکەوتووەکان.دوای شکسـتی چـین لـە جـەنگی ئەفیونـدا و سـەرکەوتنی ئنگلسـتان ئـەم نارەزاییـە پـەرەی سـەند بـۆ ڕاپـەرینی جوتیـاریی کـە لـە مێـژودا بەناوی"ڕاپەرینی تایپینیەکان" باسکراوە(١٨٥١ـ١٨٥٦).

لە"دەولەتی ئاسمانیدا"کـە تایپینییـەکان لـە ناوچـە ئازادکراوەکـانی وڵاتەکـەیان کـە لـە ژێـر دەسـتی مەنشـورییەکان دابـوو، دایانمەزرانـد.

ریفۆرمی پێشکەوتوانە کرا... پێشەکی یاسای چارەسەرکردنی زەوی و
[illegible]ار بوو.. راپەڕینی تایپنییەکان سەبارەت بە چەند هۆیەکی مێژویی.. لە
ناو برا، لەگەڵ ئەوەشدا پاڵێکی گەورەی نا بە ژیانی بیری گەلی چین
ڕووەوە پێشەوە. دوای دەیان ساڵیش بیری یەکسانی کە تایپینییەکان
خستیانە ڕوو شۆڕشگێرترین بیری جولانەوەیەکی ڕیفورم خواز دەستی
پێکرد و ساڵی ١٨٩٨دا کپ کرا لەگەڵ ئەوشدا رۆڵێکی پێشکەوتوانەی
وازی کردو هاوبەشیی کرد لە بڵاوکردنەوەی گیانیی شۆڕشگێری لەناو
بەشە پێشکەوتووەکانی کۆمەڵگەی چیندا.

لە ئیدیۆلۆگە ریفورمیستە پێشکەوتنخوازەکانی ئەو سەردەمەی
چین" تان سی‌تون"(١٨٦٥ـ١٨٩٧) بوو، فەلسەفەکەی، بەردەوامبوونی
باشترین نەریتی فەلسەفەی مەتریالیزمی ڕێرەوی چەندین سەدە بو.
تەقەلای ئەوەی ئەدا کە مەزەبێکی فەلسەفە سەربەخۆ دابنێ.

سون یان سن(١٨٦٦ـ ١٩٢٥)لە بەناوبانگترین شۆڕشگێرەکانی چینی
کۆتایی سەدەی نۆزدەو چارەکی یەکەمی سەدەی بیست بوو. لە ساڵی
١٩٠٧دا بیرە بنچینەییەکانی لەم سێ پرنسیپەدا دارشت:
نیشتیمانپەروەری، دیموکراسی و بەختیاری گەل. ئەم داخوازیانەی ئەم
فەیلەسوفە پێشخواستی گەلی چین بوو بۆ ڕزگار بوون لە زوڵمی
دەرەبەگایەتی و ئیمپریالیزم و بۆ دامەزراندنی دەولەتێکی سەربەخۆ لە
چیندا.

ئەو بەرنامە ئابوریيەی سون يان سن داينا لە رووی بابەتييەوە ڕێگەی بۆ پەرە سەندنی سەرمايەداری كردەوە هەرچەندد خۆی ئەيوت بە جێبەجێكردنی بەرنامەكەی؛ چين دەتوانێ خۆی لە قوناغی سەرمايەداری لابدات. لە ڕاكانی ئەم فەيلەسوفەدا تێندێنسی مەترياليزم دەردەكەوت.لايەنگيری تيوريیەكەی داروين"بنەچەی جۆرەكان"ی ئەكرد، هەڵوێستيشی لە تيوری"بەرزە پەرە" پۆسەتيف بوو. لەگەڵ ئەوانەشدا فەلسەفەكەی گەلێ ڕای هەڵبەستراوEclectic ناكۆكی تيابوو، ديسان گەلا ڕای ئيدياليستانەی دەربارەی هەندێ مەسەلە خستە پێش چاو.

را فەلسەفی و كۆمەلايەتييەكانی سون يان سن مەترياليستی گونجاو نەبوون بەلكو ئامانجی سەرەكی لەو ڕايانەی چارەسەركردنی كێشەكانی بەردەمی جولانەوەی رزگاريخوازانەی وڵاتی چين بوو كە لە دژی دەرەبەگ و ئيمپرياليزم بووە. لە ژێر كارتێكردنی شۆرشی مەزنی ئۆكتۆبەردا سون يات سن سەرنجی لە ڕاكانی پێشووی دايەوە و سێ پرنسيپی تری خستە سەر سێ پرنسيپەكەی پێشووی: هاوكاری لەگەڵ كۆمۆنيستەكان، لايەنگيركردنی خەباتی كرێكاران و جوتياران لەپێناوی ديموكراسی لەهەموولايەنێكی ژيانی كومەلأيەتی چيندا،چونە ناو يەكێتی كۆمارەكانی سۆسياليستی سۆڤێتەوە.

بەو جۆرەبيری ديموكراسی شورەشگێرانە لەكۆتايی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بيستەمدا لەوڵاتی چين پەرەيسەند.واتە لەو كاتانەدا

کــە چــین لــە قۆنــاغی گواســتنەوەدا بــوە لەدەرەبەگایەتییــەوە بۆسەرمایەداری.

# بەشی دەیەم

- سەرەتای هەڵوەشانی فەلسەفەی بۆرجوازی
- فەلسەفەی شۆبنهاوەر نوێنەری تێندێنسی نائەقڵیی بۆرجوازییە.
- سیورین کێرکیگارد فەیلەسوفی نا ئەقڵی ئایینی - یە.

پۆسەتیڤیزمی ئۆگەست کۆنت.

## هەڵوەشانی فەلسەفەی بۆرجوازی

شۆڕشــە دیموکراسـییە ـ بۆرجوازییـەکانی ســاڵی ١٨٤٨ ئـەوەی سەلماند کە بۆرجوازی لیبراڵ بە تەواوی شۆڕشگێڕێتی لە دەست داوەو بۆتە چینێکی دوژمن بـە پێشـکەوتن. چینی کرێکـار کـە لـەوەو بـەر بـە هاوپەیمانی چینی بورژوا خەباتی لەدژ نوبەلاو حوکمی زۆرداری دەکرد، لـەو شۆڕشـانەدا لـە دژی خـودی بۆرجـوازی وەسـتا، ئـیتر ئیدیۆلۆگـە بۆرجوازییەکان واسەیری پرۆلیتاریایان ئەکرد کە هێزێکی کۆمەڵایەتییەو هەڕەشە لەبوونی سەرمایەداری دەکات. دوای ئەوە بۆرژوا بیری لە جێبە جێکردنـی گۆڕانـە دیموکراسـییە بۆرجوازییـەکان نـەدەکردەوە، بـەڵکو ڕووی کردە پەیمان بەستن لەگەڵ هێزە دەرەبەگە کۆنە پەرستەکان.

سەرەتای داروخانی فەلسەفەی بۆرجوازی هەر لەپێش ساڵی١٨٤٨ـەوە سەری لە ئاسۆ دەرکێشابو. دوای شکسـتی شۆڕشـەکان ١٨٤٨یش ئەو فەلسەفەیە کەوتە ناو قوناغی دەست پێکردنی داڕوخانـەوە. کەوتـە پاکانە لە دەستکەوتەکانی پێشووی فەلسەفەی بۆرجوازی، دیـالیکتیکی ئەخستە لاوەوبوو بە بانگاوێژو بەرگریکەر لـە پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـە سەرمایەدارییەکان. دەردی نائەقڵی Inationallsm کە پایـەی زانسـت و ئەقڵ نـزم دەکاتـەوە بڵاوبونـەوەو نـازانمی Agnosticism کـە لـە دیـدی فەیلەسـوفەکانی بـۆرژاوە بویـو بـە تاقـە دەروازەی زانسـتی ـ فەلسەفی بۆ توێژینەوە لە واقیع بوو بە فەلسەفەی زاڵ و باو.

لایەنگرانی نائەقڵی سەیری باوەڕکردن بە ئەقڵ و توانستەکانیان وادەکرد کە مەترسییەکە چواردەوری کۆمەڵگە داوەو هەڕەشەی لە قەوارەی دەکات، چونکە ئەو باوەڕکردنە ئەبێتە هۆی دۆزینەوەی یاسایی پەرەسەندنی کۆمەڵ و بینینی ئاسۆکانی، دیسان دەبێتە هۆی سەرنجدانی ڕەخنەگرانەی پشکنەری بنچینەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ـ موڵکداریی تایبەتی مافی بۆرجوازی و ڕەوشت و ئایین.

**ویستی نائەقڵی شۆبنهاوەر:**

ئارورشۆبنهاوەر ١٧٨٨ـ ١٨٦٠لە نوێنەرە سەرەتاکانی تێندێنیی نائەقڵیی بۆرجوازیە. ڕوداوەکانی ساڵی ١٨٤٨کینەی ماتدراوو ڕقی بێسنوری ئاودەرونی شۆبنهاوەری لەدژی جەماوەرو پێشخواستە شۆڕشگێڕانەکەی وروژاند.

مەزەبەکانی کانت و ئیفلاتون و بەشێکی شیلنگ ـ یش سەرچاوەی بنچینەیی تیوری فەلسەفەکەی شۆبنهاوەر بوو. ئەم ئیدیۆلۆگە بەربەرەکانی دیدی مێژویی هیگڵ و نرخاندنی بەرزی بۆ ڕۆڵی دەوڵەت لە پەرەسەندنی کۆمەڵدا بەتێکەیشتەی نامێژویی پێرسۆناڵی.. بەسەڵتایەتی Individualism لە ڕەوشتدا. بەربەرەکانی دەکردو فرمانی دەوڵەتی هەر بەئەرکێکی پۆلیسی دادەنا. ماهییەتی مرۆڤ لە دیدی ئەمەوە خواستی سەربەخۆیە لە ئەقڵ، ئارەزوویەکی کوێرانەیەو لە بونی فیزیۆلۆژی مرۆڤ جیا نابێتەوە، دەرکەوتنێکی ویستی

سەرجەمیی کەونـە و بنچینەو نـاوەڕۆکی ڕاستەقینەی هـەموو ئەوانـەی هەن پێکدەهێنێ.

لە فەلسەفەکەی شۆبنهاوەردا ئیدیالیزمی بابەتی و ئیدیالیزمی خۆیی تێـك دەئـاڵێن. دیسـان ویسـتی Voluntarism شـەقڵی دەرخـەری مەزەبە فەلسەفییەکەیەتی.

بـە دەرکـەوتنی شـێوازە بـەرزەکانی ژیـان کـە مـرۆڤ تروپکیـان پێکدەهێنێ، هۆش وەك ئـامرازێکی یاریـدەدەر بـۆ کـردار بەوەڵـەد دێ. لەگـەڵ هۆشیشـدا" جیهـان وەکـو دیـد" بـە شـێوە جـۆراو جۆرەکـانی دەردەکەوێ: بابەت و خۆ، زەمین و زەمـان، فرەشـتی تاکە پەیوەنـدی هۆییان. لەمەوبەر" جیهـان" تـەنها"ویسـت" بـووە، بـەڵام ئێسـتا بـووە بەبابەتێ بۆ خۆی ناسراو، یـان "دیـدێ". شۆبنهاوەر پێشـنیار دەکـات کـەنابێ دەسـت پێکـردن لەبابەتـەوە بـێ هـەروەکو مەتریالیسـتەکان دەیکەن، بەڵکو لەو دیدانەوە بێ کە ویستی هۆشمەند دەیخولقێنێ..... تێزی بنچینەیی لە فەلسەفەکەی ئەم ئیدیۆلۆگەدا ئەمەیە: مـن بـە تـەنها هەم، هەمووی جیهان هیچ نییە دیدەکانمە. بـەوەش شۆبنهاوەر لەسـەر زەمینـە ئیدیالسـتەکەی، دەوەسـتێ هەرچـەندە بـڵاوی دەکـردەوە و دەیوت کە سەڵتایەتیSolipsism "فەلسەفەی شێتانە".

کرداری ویستراو،بەو پێیـەی لەگـەڵ کرداری لەشـدا جـوت دەبـێ یا ڕاستەوخۆ،یاـ لـەناو پرۆسـەی زانـین - بـە هـۆی بینـایی بـۆ هـۆش

دەردەكەوێ. بەو جۆرە دوو چەشن لە زانینمان دەربارەی لەشمان دەزێ:

١) زانینی ڕاستەوخۆ دەربارەی ماهییەتی لەش یان دەربارەی "ویست"،

٢) زانینمان دەربارەی لەش وەك بابەتێ لە نێوان بابەتەكانی تردا. سەرەنجام لەشیكردنەوەی زانینیی پەتی لای شۆبنهاوەر دەگۆڕێ بە ڕەخنەی كۆنەپەرستانە لەڕاست و لە بیری زانستانە. بەرگی شەقڵ ڕەخنە لە شێوە لۆجیكییەكانی تێگەیشتەو هێرش بۆ سەر دیالیكتیك،بە تایبەتی یاسای یەكێتی و ململانێی دژەكان، دەپۆشێ.

شۆبنهاوەر دەڵێ زانست چالاكیی زانراو نییە بە قەدەر ئەوەی چالاكییەكی بێگارانەیە بۆ خزمەتی ویستی Will. ئامانجی زانست لای ئەم ئیدیۆلۆگە جێبەجێكردنی مەبەستە پراكتیكییەكانە كە هەمیشە مەبەستەكانی ویستە، یان ئارەزووی كوێرانەیە...

دیدی شۆبنهاور بۆ ژیان پڕە لە بێ ئومێدی هەموو دەم لە نێوان ئارەزوو تێركردنیدا لە هاتوچۆدایە... كەی ئەو ئارەزووە تێركرا ئیتر هەست بە بێزلێكردن و بێ تاقەتی دووچاری مرۆڤ دەبێ و شەپۆلی بێ ئومێدی ژیان هەتا دەوڵەمەندو بەختیارەكانیش پڕدەكات. شۆبنهاوەر بە ئومێدیی، بە دیدێكی پوچ و گاڵتەیەكی تاڵی ئازاری مرۆڤایەتی دادەنێ كە لە سنور تێدەپەرێ. بەلام هۆش، پاش ئەوەی مرۆڤ

حەتمیەتی سەرجەمیی شەڕێ نەمریی ئەدۆزێتەوە ڕێگەی سەرفرازی بێ ڕۆشن دەکاتەوە و فەیلەسوف و هونەرمەنت بۆیان دەردەکەوێ کە ویست بە هەموو ئاشکراکاییەکانەوە یەکێکە و دابەش نابێت. جا ئەگەر خولك هەبێ لەناو چینە دەولەمەندەکاندا وەك بێبەشەکان بێچارەبن ئیتر هیچ بۆ ڕەنجدەران نامێنێتەوە، وەك ئەم ئیدیۆلۆگە دەڵێ، ئەوە نەبێ کەواز لەو خەباتە بهێنێ کە لە پێناو ژیانێکی باشتردا دەیکا.. نەك هەر لەخەبات و بەس بەڵکو لە ئارەزوو پێویستیەکانیش.

پوختەی تێندێنسی ویستی شۆبنهاور داوا کردنی دەوڵەتی پۆلیسییە، دام و دەزگای تۆقاندن و لەناو بردنەکە زۆر پێویستن بۆ لە ناوبردنی ڕاپەڕینی جەماوەر کە لەدژی زۆرداریی مولکدارێتی و سستێمی خاوەن دەسەلات و دام ودەستگاکانی دەیکا.

لە بیستەکاندا ڕاکانی شۆبنهاور جێگەی سەرنج نەبووە، بەلام پێش شۆرشی١٨٤٨ هەلگەڕانەوەیەکی بنەڕەتی لە هەلوێستی بورژوای ئەلەمانیدا ڕووی دا بەتایبەتی دوای ئەو شۆڕشە. ئیتر دیالیکتیکی هیگل بە کەلکی ئەو بورژوایە نەدەهات کە لە بەردەم جولانەوەی شۆڕشگێریی کرێکاران و بەرین بوون و سەرکەوتنەکانی سەرەتادا تۆقابو.. ئەو تۆقاندنە شەپۆلی نائومێدی و بەدگومانی لە ڕیزەکانیدا جێهێشت. دیسان مۆدەی نائەقلی و نازانمی بلاوبوەوە، ئیتر لە پڕ شۆبنهاور کە فەیلەسوفێ بوو کەس نەیدەناسی، بوو بە "سولتانی بیر" بەوێ جۆرە

وەرچەخانی بۆرژوا بەرەو کۆنە پەرستیی سیاسی ناوەرۆکی کۆمەلاّیەتی راستەقینەی "ویستیی" و "نائەقلّیی" شۆپنهاوەر دەردەخات.

**- سیۆرین گێرکیگارد**

**فەیلەسوفی نائەقلّیی ئاینی - یە**

نوسەرو فەیلەسوفی ئەمسـاوی سیورین گێرکیگارد(١٨١٣_١٨٨٤) ئیـدیۆلۆگێکی بـەرزی تـری بـوو کـە بیروراکـانی سـەرەتای داتـەپانی فەلسـەفەی بۆرجـوازی دەرئەخسـت. لـە سـەردەمی ژیانیـدا ناوبـانگی دەرنـەکرد، راکانیشـی ئەبوو تاکۆتـایی ئـەو سـەدەیە، ئـەو کاتـەی کـە سەرمایەداری پەرەی سـەنـد، بـۆ دواقۆنـاغی - ئیمپریالیزم - چاوەروان بکات بۆ ئەوەی بۆرژوا بایەخی پێ بداو دەهۆلّی بۆ بکوتێ ، بە تایبەتی لە ئەلّەمانیاو دەولّەتانی تری ئەوروپای خۆرئاوادا. دیسان پاش جـەنگی دووەمی جیهانی بایەخدان بەو فەلسەفەیە زیاتر بوو.

ئەم فەیلەسوفەش وەك شۆپنهاوەر بیری نائەقلّیی رێبازی بووە. لای ئـەم بـیر هـەرگیز ناتوانـێ دەرك بـە واقیـع نـەکات. ئـەوەی بـیری لێ دەکەینـەوە بـوونی لـە واقیعـدا نییـە، ئـەوەی تـەنها بابـەتێکی بـیرە، توانسـتێکە و هیچـی تـر. بـیر پەتییـە، بـەلاّم بـوون چاوێنییە Concrete... ئەم فەیلەسوفە لە سەر راکانی بەردەوام ئەبێت تا بیسـەلمێنێ کـە کـارێکی مەحالّە بتـوانرێ مـەزهبێك یـان زانسـتێکی فەلسەفە دابمەزرێنرێ کە هەموو واقع بگرێتەوەو رێگەی پاشەرۆژمان بۆ رۆشن بکات و ئاسوی لێوە دیاربێت.

گێرکیگارد تێگەیشتەی دیالیکتیکانەی بۆ گۆران ڕەت دەکردەوە کە پرۆسەیەکی یاساییەو گۆڕانە چەندایەتییەکانی ناوی ئاراستە دەکات بۆ دەرکەوتنی سیفەتە چۆنایەتییە نوێیەکان. دیسان بەریەرەکانی دیالیکتیکی" چەندایەتی"هێگلی بە دیالیکتیکی "چۆنایەتی" دەکرد کە جیاوازییە چۆنایەتییەکان بە سەرەتایی و چەسپیوو نەگۆڕی دادەنا، گۆڕانە پلە بە پلە بەردەوامە پێکگەیشتوەکانی نەدەسەلماند.

پەرەسەندنی، تەنها قبە پەرەسەندنی پێرسونالّی و پرۆسەی گیانی پاکژی دادەنا کە بەو گۆڕانە چۆنایەتییانەی لە گەلّیدا دەبێ لە پرۆسەی تر جیادەکرێتەوە. ئەم فەیلەسوفە تێگەیشتەی" چەندبارە"ی هێنایە پێشەوە تا بەریەرەکانی ئیدیەی هێگلی لە دەربارەی سازانی دژەکان لە ئاوێتەی **Synthesis** بەرزتر ـ ی پێ بکات. "سازان"ی دژەکان لای هیگلّ لە سروشتی بابەتییەوە هەلّدەقولّێ، بولاّم لای گێرکیگارد پێویستی بە فاکتۆرێکی خۆیی نوێ هەیە ـ کرداری ویستی. لای ئەم دیالیکتیکی ململانێی دژەکان و یەکێتییان وا تەسك دەکاتەوە تا لە چوارچێوەی تەنها کرداری سەلّتیدا قەتیسی دەکات.

راکانی گێرکیگارد هەر تەنها هەلّەیەکی تیوری نەبوو، بەلّکو بیرەکانیشی لە ڕادە بەدەر کۆنە پەرست بوو کە بە ویست و بڕیارەوە دەیخستە ڕوو. لای وابوو کە بێسودە قسە لەسەر ژیانی کۆمەلاّیەتی بکرێ چونکە سەرجەم ئەوەی بۆ کۆمەلّگە گرنگە، دەولّەت سەرپەرشتی دەکات و ئیتر سەلّت هیچی لەسەر نییە ئەو نەبێ کە کاری ئەو

سەرپەرشتییە بە کۆمەڵگە بسپێرێ و پیرۆزیی دەسەڵاتیی میریی ڕێز لێ بگیرێ. بۆیە قسەکانی لەسەر شۆڕشگێڕەکانی ١٨٤٨ پڕبوون لە ترسو لەرزو ڕق و کینە لە دژی جەماوەری ڕەنجدەرو و خەباتی شۆڕشگێڕانەیان.

قۆناغی ئایینی لای کێرکیگارد دوا قۆناغی پەرەسەندنی سەڵتەو بەرزترینیانە کە جوانیی و ڕەوشتی لە پێشەوە دێن. تەنها لە قۆناغی ئاینییدا بۆ یوکەم جار مرۆڤ خۆی دەناسێ... ئەبووت زانین تەنها لە ئاینەوە دێت.. مەسیحییەتیش تەنها ئاینە کە ڕێگەی ڕاستی ڕەوشتمان بۆ ڕوناك دەکاتەوەو مرۆڤ ئاراستەی ئەوەی بە کردار هەیە دەکات، بەوانەش دەیەوێ نکوڵی لە زانین بکات و ڕۆڵی ئەقڵ بکوژێنێتەوە. هەرچەندە لە سەر تێندێنسی بێ ئومێدی لەگەڵ کلێسەی پرۆتستانتی نەمساوی کەوتە ناکۆکیەوە، بەڵام ئەوە هیچی لە جەوهەری فەلسەفەکەی نەدەگۆڕی. ئەو تەنها ناخۆشی نێوان یەك سەریازگە بووە کە زۆرانبازی لە دژی هەموو جۆرە شێوەیەکی مەتریالزم و ڕوناکبیریی و ئیلحاد ئەکرد. بۆیە سەمەرە نییە کە ئەمڕۆ پیاوانی ئایینی کلێسەی پرۆتستانتی و فەیلەسوفە ئیدیالیستە نانەقڵیەکان شانازی بە کێرکیگارد دەکەن و سۆزو بیرەوەری پڕشکۆ بۆ سەرۆکەیان دەردەبڕن.

**پۆسەتیڤیزمی ئۆگەست کۆنت.**

ئۆگەست کۆنت(١٧٩٧ــ١٨٥٧) لە دەرکەوتوترین نوێنەری پۆسەتیڤیزم Positivism بوو لە فەرەنسا. لە سەردەمی لاوێتیدا

شاگردی دەستی سۆسیالستی گەورەی یۆتۆپی سان ـ سیمۆن بوو. گەلێ لە بیرەکانی وەرگرت.. بەلام فەلسەفەکەی بە سەرجەمی دژی سۆسیالیزم و دژەکرداری بۆرژوای کۆنە پەرست بوو لە دژی جولانەوەی بالاکردنوی رزگاریخوازانەی رنجدەران.

بەدوانزدە سال(١٨٣٠ـ١٨٤٢) بەرهەمە سەرەکییەکەی" چەند وانەیەکی لە فەلسەفەی پۆسەتیڤیزم" تەواو کرد کە لەشەش بەرگدایە.ئەم پلەی ژیانی بیریی بە پلەی یەکەم ناوبراوە، تیایا کۆنت لە جیهانی دەرەوەوە لە سروشتەوە روەو مرۆڤ دەچێ. لە پلەی دووەمدا"پلەی سۆڤیێتی" واز لە رەگەزە مەتریالیستەکانی دەهێنێ و وا پێشنیار دەکات کە تەنها لە باری سەرنجی مرۆڤەوە سەیری سروشت بکرێ نەك بەو پێیەی بوونێکی بابەتی سەربەخۆیە.. ئەیوت نابێت فەلسەفە بەتونها پێویستییەکانی هەستیش جێبەجێ بکات. دیسان لە ناو خۆشەویستی مرۆڤدا نقوم دەبێ و ئایینێکی تایبەتی"ئایینی مرۆڤایەتی" بۆ دائەنێ.

کۆنت لە تێگەیشتنی مێژودا ئیدیالیست بوو. جیهان لە دیدی ئەمەوە"را"ئاراستەی دەکات و پێشکەوتنی کۆمەڵ تەنها پێشکەوتنی بیرە. پێشکەوتنی بیریش هەر پێشکەوتنی کۆمەلایەتی ناکەوێ و بەس بەلکو هۆو بنچینەشیەتی.

مەزەبەکەی کۆنت لە زانین و زانستدا: دیسان مەزەبەکەی لە زانیندا ئیدیالیزم و پڕ لە ناکۆکی بوو. کۆنت لەم گوتەیەیدا: بیری مرۆڤ بە

دیاردەکانی نـەبێ دەرك نـاکرێ، بـەوەش بـەلای نازانمیـدا لایـداو شـوێن پێی "هیوم"ی هەلگرت. بەسنوردارکردنی بواری زانیندا کەلەبازنەی تەنها ڕواڵەتەکانا قەتیسی دەکات کۆنت ئەگاتـە ئـەم ئامانجـەو ئـەڵێ:لـەڕووی پرنسیپەوە توانای لێکدانەوەی زانسـت لەئارادانییـە.ئـەرکی زانسـت لای ئـــــــــەم "لێکدانـــــــــەوەی"ڕوخســـــــــارەکان و توێژینەوەی"ماهیـەتی"و"بەلگـەکانی"نییـە،بـەڵکو هـەلهێنجانی دیـاردە سـانەوییەکانەلەدیاردە ســەرەتاییەکان.کۆنـت وای دەبینـی کـەزانیاری زانستی شتێکی وەرگیراو لەبابـەت و شـتێکی پەیوەسـت بـە¯خـۆ¯وەی تێدایـە. تێگەیشـتەی"خـۆ"لای ئـەم تەسـك ئەبێتـەوە تالـەپێکهاتنی سایکۆفیزیۆلۆژی سەلت قەتیس دەکرێ.

کۆنـت لەگـەل خۆیـدا ئەکەوێتـە ناکۆکییـەوە کـە دەڵـێ زانسـت پێشـکەوتووە لەلایـەك،کەچـی لـە لای دووەم ئـەوە ڕەت دەکاتـەوە کـە نزیك بوونەوەی زانین لە بابەتەکەی زیاترە لە زانینی دیاردەکـانی تـەنها دیاردەکان، ئەو جگە لە نەتوانینی زانینیی گشت دیاردەکـان. بۆنمونـە: بەهیچ جۆرێك ناتوانرێ ناوێتـەی کیمیـاوی ئەسـتێرەکان بزانـرێ.کەچـی هـەردوو سـاڵ بەسـەر مردنـی کۆنـت - دا تێپـەڕ نـەبوو کـە هـەردوو وانـا"بـونزن" و"گیرهکـوف" ڕێگـەی شـیتالکردنی شـەبەنگ - ی ڕۆژیـان دۆزیەوە کە توانستی زانینی ناوێتەی کیمیاوی ڕۆژی دەرەخساند.

**یاسای سێ قۆناغی لە پەرەسەندنی مێژوویی زانین:**

کۆنت سستێمە فەلسەفییەکەی لەسەر بناغەی مەزەبەکەی"سێ قۆناغی پەرەسەندنی بیرو زانیاری مرۆڤایەتی": "لاهوتی"و "میتافیزیکی"و"پۆسەتیڤیزم" دامەزراندووە. لە قۆناغی ئاینییدا زانیارییەکانی مرۆڤ سنووردارن و خەیاڵ بەسەر بیردا زاڵەو خەڵك لە لێکدانەوەی دیاردەکانی سروشتدا یەزدان و گیانیان دەهاوێشتە ناوی.. ئەم قۆناغە لە ڕووی پراکتیکەوە هێزی موتڵەقی دەقە پیرۆزەکانی Authorityتیا زاڵ بووە، لە ڕوی سیاسیشەوە دەسەڵاتی ئاینییەکان و پاشاکان ڕۆڵی بینیوە. لە قۆناغی دووەمیشدا، یەزدان بە یەکەم هۆ نامێنێ، بەڵکو سروشت وەیان"ماهییەت" یێکی پەتییە. لەم هۆی یەکەمە لقی هێزە جۆربەجۆرەکانی وەك: هێزی کیمیاوی،زیندو هیتریش جیادەبنەوە.

قۆناغی میتافیزیکیش قۆناغی گواستنەوەیە لە پەرەسەندنی کۆمەڵگەدا.. تییا دەقە پیرۆزەکان لاوازبوون و گومان و خۆپەرستی بڵاوبووەوە و پەیوەندی سەڵت و کۆمەڵ لاواز بوو، ڕۆڵی ئەقڵ لەسەر حیسابی سۆز بەهێز بوو، لەڕوی سیاسیشەوە تێندێنسی دامەزرانی دەوڵەت لەسەر بناغەی دەسەڵاتی گەل بوو بە باو. قوناغی پوسەتیڤیزم دوا قۆناغ و باڵاترین پلەی پەرەسەندنی زانینە بە تایبەتی کۆمەڵە بە گشتی. لەم قوناغە"زانستییە"دا ئەقڵ جێگەی لێکدانەوە لاهوتی و میتافیزیکییەکان ئەگرێتەوە و هەوڵئەدات پایەگای ژیانی کۆمەلایەتی

لەسەر بناغەی زانینە پوسەتیڤیەکان Positive دابمەزرێنێ. ئەم زانینەش هەریۆ زانستەکانی ماتماتیك و فەلەك و سروشت و شیمیا نییە بەلچکو لەوانە تێدەپەرێ بۆ زیندەوەرزانی ە کۆمەلناس - یش Sociology. ئامانجی زانستی پۆسەتیڤیزم و مەرجی توانستی، دۆزینەوەی سستێم و یاساو سروشتی کۆمەلایەتییەکانە. بەلام مەسەلەی هەبوون و نهێنییەکەی .. ئەوانە هەرگیز توانای چارەسەرکردنیان لە ئارادا نییە، بۆیە دەبێ بخرێتە لاوەو دەست بەرداریان بین. پەرەسەندنی زانست - بەپێی ئەم تیوریە - هێزی بنچینەیی جولێنەری پێشکەوتنە کۆمەلایەتییەکانە. پێشکەوتنی زانستیش تەنها گواستنەوەیەکە لە دیدە ئاینییە غەیبییەکانەوە بۆ تێگەیشتەی پەتی لە دەربارەی سروشت ، لەو ێشەوە بەرەو زانستی"پوسەتیڤ".

ئەو تێگەیشتە نوێیەی ئەرکی" فەلسەفەی پۆسەتیڤیزم" خاوەنەکەی پالپێوەدەنێ کە پۆلێنێکی نوێ بۆ زانستەکان بهێنێتە ئاراوە،کەبەپێی ئاسانی و پەتێتیەکەی رێکیان دەخات:ماتماتیك و فیزیك وشیمیاو بایەلۆژی دواییەکەشی فیزیکی کۆمەلایەتی– سۆسیۆلۆژی– یە.لەم رێکخستنەدا زانستە بەرزەکان بندەستەی یاساکانی هەموزانستە نزمەکان ناکرێ و بەس بەلکو هی ئەو یاسایانەشن کە تەنها تایبەتن بە خۆشی.

کۆمەڵناسـیەکەی کۆنـت هـەر لاوازتـرین ئەڵقـەکانی سسـتێمە فەلسەفییەکەی نییە لە ڕووی تیوریـیەوە، بەڵکو لەڕووی سیاسیشـەوە کۆنەپەرستترینیانە. کۆنـت پێشـەنگی زنجیرە زانایـەکانی پۆسـەتیڤی کۆمەڵ بوو، کە ئەیانەویست کۆمەڵناسی نەك لـە ڕێرەوی تۆێژینـەوەی مێژوی ڕاستەقینەی پەرەسەندنی مروڤایەتییـەوە بینـا بکـەن بـەڵکو لـە سەرچاوە پەتییە پێشینییەکانەوە Apriori ئەوە ئەنجام بدەن. لینین هـەرزوو کەوتـە گیـانی ئـەو تیۆریانـەو دەریخسـت کـە:"کاتـێ پرسـیار دەکـەیت: کۆمـەڵ چییە، پێشـکەوتن چییە؟ مانـای وایـە ئـەبێ لـە کۆتاییـەوە دەست پێبکـەی.. ئـەی لـە کوێـوە تێگەیشـتەی کۆمەڵگـەو پێشکەوتن بە شێوەیەکی گشتی وەردەگرێت ئەگـەر تـا ئێستا لـە هیچ یـەکێك لـە سسـتێمە کۆمەڵایەتییـەکان - مـان نەتۆێژیبێتـەوە. هـەتا نـەتوانیبێ تـا ئێسـتا ئـەو تێگەیشـتەیە دابڕێـژرێ و نـەتوانێ هـیچ کۆلینەوەیەکی بابەتی بۆ هیچ یـەکێك لـە پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکان بکەی؟ ئەمە تەنها شەقلێکی ئاشکرای میتافیزیکییە..."(٨٣).

شـەقڵی کۆنەپەرستتانەی ڕاکۆمەڵایەتییـەکانی کۆنـت لـە دیـدی بـۆ کۆمەڵ دەرئەکەوێ، بە پێیەی" بـوونێکی کۆمەڵایەتییـە و وەکـو بوونـە زیندووەکانی تر وایە، کە هـەموو ئەندامـەکانی هاوکـاری دەکـەن و بـۆ" بەرژەوەندی گشت".

کۆنـــت کەشۆڕشـــەکانی هـــەردوو ســـاڵی ١٨٣٠و ١٨٤٨ ی فەرەنسەیبینی و هاوسەردەمی مێژوناسە فەرەنساوییەکانی سـەردەمی

گەڕانەوە بوو، تولنی ڕێبازی گشتی پەرەسەندنی کۆمەڵگەی فەرەنسا لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم تێبگات، توندو تیژی ململانێی چینایەتی نێوان پرۆلیتاریاو سەرمایەدارەکان کە ئالۆزتر دەبوون تێبگات . جا تەقەلای ئەدا کە پرۆلیتاریا ڕازی بکات کە کرێکاران و سەرمایەداران دوو چین نین، بەڵکو یەك چینن و ئەبێت ناسودەیی و خوشەویستی لە نێوانیاندا بەرکەمال بێ...لە دواییشدا دێتە سەر ئەوەی کە دووبارەی بکاتەوە دە دەبێ دەسەڵاتی سیاسی لە دەستی سەرانی پیشەساریدا بێ بە تایبەتی خاوەن بانکەکان ، سەبارەت بەوەی چینێکە بە گرنگتری و بەکەلکترو سەرجەمترین کار هەڵدەستێ..

بەو جۆرە فەلسەفەی بۆرجوازی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا ڕێگەی داروخانی گرتەبەر. لەو کاتەشەوە فەلسەفەی بۆرجوازی بە تەواوەتی لە نەریتە شۆرشگێرە مێژوییەکانی دەستبەردار بوو، تا ببێتە شانۆی ڕاو تێندێنسی کۆنەپەرست و ئیدیالیستەکان هی خۆیی و نازانمی و پۆسەتێڤ و هەلبەستراوەکان.

## فەرهەنگی زاراوەو وشەکان

لەم فەرهەنگەدا بەشێك لەو زاراوەو وشەو ناوانەی لەباسەکاندا هاتوون ڕوون کراونەتەوە، زۆری تر هەن سەبارەت بەوەی لەشوێنی خۆیاندا باسکراون بۆیە لێرەدا لو پێویستم نەزانی سەر لەنوێ لێرەدا باس بکرێنەوە.

بۆ لێکۆڵینەوەو ڕوونکردنەوەی زاراوەو وشەو ناوەکان و ڕێکخستنی ئەم فەرهەنگە پەنام بردۆتە بەر:

*سەرچاوەکە خۆی ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە ـ کە زانیاریەکان لەپەراوێزی لاپەڕەکاندا هاتوون و یاخود لەناو باسەکانەوە وەرگیراوون.

*مەوسوعەی فەلسەفەی ـ دانانی لیژنەیەك لەزاناو ئەکادیمییە سۆڤیەتییەکان ـ وەرگێڕاونی سەمیر کەرەم، چاپی پێنجەم ـ ١٩٨٥ ـ چاپگەی (الطليعة) بیروت.

*دانراوەکانی مارکس، ئینگلس و لینین.

*مێژوو، د.کەمال مەزهەر ئەحمەد ـ چاپگەی (دار افاق عربيه) بغداد، ١٩٨٣.

*چەند فەرهەنگێکی سیاسی و زمان ـ ی عەرەبی و سویدی و ئینگلیزی.

*چەند فەرهەنگ و فەرهەنگیلەیەکی زمانی کوردی.

**ئایدیۆلۆژی:** ئەو کۆمەڵە بیروباوەڕەیە کە لەناو کۆمەڵگەیەکدا بەهۆی بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە دەردەکەون. زانستی پێناسی سروشت و ژیان و کولتورو هونەرو ئایین و فەلسەفەیەو لای مارکسیست لینینییەکان ململانێی چینایەتی پێناس دەکەن، ئەشێ ئایدیۆلۆژی زانستی بێ یا زانستی نەبێ بەو پێیە ڕەنگدانەوەی ڕاستەقینە یان درۆزنانەی واقیع دەبێ. ئایدیۆلۆژی هەمیشە بەشێکە لەسەرخانی کۆمەڵ بۆیە پەیوەندییە ئابورییەکانی کۆمەڵ ڕەنگ پێ

دەداتــەوە... بەرژەوەنــدی چــینایەتیش پارمەتیــدەری دروســتکەری ئایدیۆلۆژییەکی سەربەم یان بەوچین بێت.

**ئەپســـتیمۆلۆژی**: Epistemology: لقێکــە لەفەلســـەفەی زانــین، لەئەسڵی زانین و سروشت و قوتابخانە جۆربەجۆرەکانی، لـە ئەنـدازەی دەکۆڵێتەوە.

**ئەتنۆلۆژی**: کۆمەڵە هەڵبژاردەی شیعر یا پەخشان یان مۆسیقا.

**ئەرستۆکراتی**: دەسەڵاتدارێتی خەڵکانی تایبـەتی، واتـە بەشـە هـەرە بەدەستەکەی چینی دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوا. چینی ئەرستۆکرات چینی ئەشرافە لەسـەدەکانی ناونجیـدا هـەموو دەسـەڵاتی ئـابووری سیاسـی و یاساییان بەدەستەوە بووە. تا دەسـەڵاتی چـینی بـۆرژوا فـراوان ببوایـە هی ئەمان کەم ئەبۆوە.

**بیر** Thought **فکر**: بەرهەمی بەرزی دەماخـە وەك مـەتریالێك کـە ڕێکخستنێکی ئۆرگانێکی تایبـەتی هەیـە. ئـەوەش پرۆسـەی پۆسـەتیڤە کەبەهۆیەوە جیهانی بابـەتی بەتێگەیشـتەو بڕیـارە تیۆرییـەکان... هتـد ڕەنگ دەداتەوە. بیریش لـە ڕێـڕەوی پرۆسـەی چـالاکییە کۆمەڵایـەتی و بەرهەمییـــەکانی مـــرۆڤ دەردەکـــەوێ و پەیوەندییـــە سروشـــتییەکانی ناوەوەی دەردەخات.

**بـەڵام ئیدیـە** Idea - زاراوەیـەکی فەلسـەفییە... مانـای: مانـا یـا ناوەڕۆك یان جەوهەرە. واتـەی ئیدیـە لـە مێـژووی فەلسـەفەدا بـەمانای جۆربەجۆر بەکارهێنراوە، کە سەیری ئیدیـە ئـەکرێ کـە لەزەینـدا هەیـە

ئەوە دیارە ئەکات بۆ: ١ـ وێنەیەکی هەستی کە لەزەیندا دروست دەبێ وەك ڕەنگدانەوەی بابەتە هەستییەکان. ٢ـ "مانا" یان" جەوهەر"ی ئەو شتانەی دەتوانرێ بگێڕرێتەوە بۆ هەستەکان یان باری سەرنجی خۆیان بۆ پرەنسیپی ڕەوشتیی کە هەبوون ئەدات بەجیهان.

**پانتیزم Panthesm**: مەزەبی یەکێتی بوونە. ئەم ڕێبازە یەزدان و سروشت لەگەڵ یەکدا جووتدەکات.

**پسیکۆلۆژی یان سایکۆلۆژی**: واتە زانستی دەروونی، دەروونناسی. ئەقڵی.

**پشتی قۆقاس**: ئەم ناوچەیە ئێستاکە ئەکەوێتە ناو کۆمارەکانی: جۆرجیا، ئەرمەنستان و ئازەربایجان.

**پێکهاتنی پێشەکی Preformationism**: تێگەیشتەیەکە لەپەرەسەندندا پێچەوانەی دیالیکتیکە، بەپێی ئەوە گوایە سیفەت و پەیوەندییە جیاکەرەوەکانی بووی ئۆرگانیکی خەملیو لەوێنەیەکی ئامادەکراوی ناو ـ پزە ـ دایە بەڵام تیوریەکەی داروین لەپەرەسەندنی ـ پزە ـ بەهۆی گۆڕانە یەك لەدوای یەکەکانەوە دەبێ کەمەرجە تایبەتییەکانی وەراستەت ئاراستەی ئەکات کەبەتەنها لەبارودۆخی دیاردەکراوی ناو مەیانێکی دەرەکی دەردەکەوێ.

**ترانسیندینتالی Transcendental**: ئەم زاراوە لای "کانت" ئەو شتانەی ئەگرتەوە کە لەپشت هۆش و چالاکی زانینەوە بوون وەکو سەربەستی ویست.. نەمریی دەروون و یەزدان" شتەکان لەخودی

خۆیاندا". بەڵام ـ Transcendenta ـ لای کانت بۆ وەسفی هۆشی مرۆڤ و بەهرەی زانین بەکاردەهێنرا.

زانیاری ترانسیندینتالی ئەوەیە.. کەهەمووان بەو پێیە یەکسان دەبن و چەند وێنەیەکی پێشەکی "زەمان و زەمینی" تێیدایە کە تەنها بەهۆیانەوە هەموو زانین و ئەزموونێك ڕوو ئەدات.. هەموو پرنسیپەکانی بیری لۆژیکی بابەتی "لۆژیکی ترانسیندینتالی" پێکدەهێنن. لۆژیکی ترانسیندینتالیش دەکرێت بە دوو بەشەوە:

*شیکردنەوەی ترانسیندینتالی ـ بابەتەکەی: تێگەیشتنە.

*دیالیکتیکی ترانسیندینتالی ـ بابەتەکەی: پێچەوانەکانی ئەقڵە.

**ئێستاتیکا:** جوانیی یا زانستی جوانیی ـ بەگشتی لە جوانیی و هونەرو دیسان لەو هەستانەش دەکۆڵێتەوە کە جوانیی دەخەنە ناو دەروونەوە.

**ئێستیقرا Induction:** وشەکە خۆی مانای لەتەك ڕۆیشتنە بۆ زانینی هەواڵ و خەسڵەتەکانی ڕووداوێ، کارێ، ڕایە، تیوریە یا بیرێك. لایەنگرانی ئەم ڕێبازە دەڵێن ئەوە بەم ڕێگەیە چارەسەر دەکرێ. ئەم ڕێبازە وەکو بەرنامەیەکی توێژینەوە مانای ڕێگەی توێژینەوەی دیاردەکانە بە ئەزموون کە لە ڕێرەویدا لە ڕاستییە تاکەکانەو ئەچی بۆ مەسەلە گشتییەکان و ڕاستییە تاکەکان دەبن بەمەسەلەی گشتی. ئیستیقرا هەمیشە بە یەکێتی لەگەڵ بەڵگەییدا Deduction ـ استنباطی دەردەکەوێ. مەتریالیزمی دیالیکتیکی هەردووکیان بەدوولا لە زانین، دیالیکتیکانە بۆ واقیع دادەنێ کە پێکەوە بە ستراونەتەوەو

لێك جیا نابنەوەو لەناو یەکدان و هەریەکە ئـەوی تـر سـنوردار ئـەکات.. ئەویان پەنا ئەباتە بەر ئەزموون بەڵام ئەمـەی دوایـی بـڕوای بـەوە نییـە بەڵکو لەناو بەرنامەی شیکاری لۆژیکیدا پشتی بەبەڵگەی هەڵهێنجانە.

**بەڵگەیی Oposteriori ـ استدلالی:** ئەم ڕێبازە لـە سـەر کۆڵینـەوە لە واقیعە جیاجیاکان و حاڵەتە تایبەتییەکان پێکهاتووە، مەبەسـت لێـی هەڵهێنجان و دەرهێنانی پرنسیپە گشتییەکانە لێیان.

**بەرنامـە Metod ـ منهج:** لەگشـتی تـرین مانایـدا: ئامرازێکـە بـۆ بەدیهێنانی ئامانجێ کەڕێگەیـەکی دیـاریکراوە بـۆ ڕێکخسـتنی چـالاکی. بەمانای فەلسەفیی تایبەتیش ئامرازێکە بۆ زانین. بەرنامە ڕێگەیەکـە بـۆ دەسـتکەوتنی وتنـەوە ـ تردید ـ ی زیهنـی ئـەم بابەتەیـە کـەلێی دەکۆڵرێتەوە. جەوهەری ترین مەرجەکانی پەرەسـەندنی سـەرکەوتوویی زانین لە بەکارخستنی هۆشیارانەی بەرنامەیـەکی زانسـتانەدایە.. ئەگـەر بەرنامـە لەگـەڵ ئـەو بابەتـەی لـەژێر لێکۆڵینەوەدایـە جـووت ببـێ وا زانستانە دروست ئەبێ. وە لەبنچینەی هـەر بەرنامەیـەکی زانینـدا یاسـا بابەتییـەکانی واقیعـی تێدایـە هـەر لەبـەر ئەوەشـە کـە پەیوەندییـە لەجیابونەوە نەهاتووەکانی بەرنامە بەتیۆرییەوە هەیە.

**بنـەماو سـەرخانی کۆمـەڵ Basis and superstructure:** دوو تێگەیشتەی مـەتریالیزمی دیالیکتیکییـە کەئاشـنایی نێـوان پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییە ئابورییەکان و هەموو پـەیوەندییەکانی بەرهـەمهێنانی تـری ناو کۆمەڵگەیەکی دیـاریکراو دەردەخـات. بنـەما کـۆی پەیوەندییـەکانی

بەرهەمهێنانە کەبینای ئابوری کۆمەڵگە پێك دەهێنی. "تێگەیشتەی" "بنـەماو" و تێگەیشـتەی "پەیوەندییـەکانی بەرهـەمهێنان" بـەمانای یـەکتری و هاومانـا نیـن بـەلام جـووت نـین چـونکە تێگەیشـتەی پەیوەندیـیـەکانی بەرهـەمهێنان بەتێگەیشـتەی "هێزەکـانی بەرهەمهێنانـەوە" بەسـتراوە. بـەلام تێگەیشـتەی "بنـەما"بـە تێگەیشتەی"سەرخان"ەوە بەستراوە. سـەرخانیش پەیوەندییـە هـەموو رێکخراو و بیرو دامودەزگاکان دەگرێتەوە. پەیوەندییەکانی سـەرخانیش پەیوەندییە ئایدیۆلۆجییەکانیش دەگرێتەوە. هەر سیستێمێکی ئـابوری - کۆمەلایـەتی بنـەمای دیـاری خـۆی و سـەرخانێکی هـاوجووتی هەیـە. مێژوونوسـە مارکسیسـتەکان جیـاوازی ئاشـکرا بـۆ بنـەماو سـەرخانی کۆمەڵگـە جیاجیاکـانی کۆیلەیـەتی و دەرەبـەگێتی و سـەرمایەداری و کۆمۆنیزم دادەنێن. سەرخان کەئەبێتە هۆی دەرکەوتنی بنەمای ئـابوری و کەئەمـەش دەنگدانەوەیـەتی.. شـتێکی نێگـەتیڤی نییـە بـەڵکو ئـەو ڕۆڵێکی پۆسەتیڤ لە پرۆسەی مێژوویـدا وازی دەکـات و لایەنەکانیـەوە کاری تێدەکات بەلایەنی ئابوریشەوە کەبوونی سەرخان خۆشی لەسەری دەوەستێ لەکۆمەڵگەی فرەچیندا بنەماو سەرخان ناکۆك و دژیەیەکن.

**ئـەزمونی نێگـەتیف Empinisme**: ئـەم ڕێبـازە ئیدیەیـە بەرنامـەی ئەزمونی پراکتیکـی و ریالیسـت بـەکاردەهێنێ بـۆ دۆزینـەوەی ڕاسـتییە مەتریالیسـتی و مەعنەویـەکان لـەبری یاسـاو پرنسـیپە ئەقڵییـە دانپیانراوەکـان. ئەزمونییـەکان زانـین ئەگێڕنـەوە بـۆ هەسـتەکان،

ئەقڵییەکانیش ئەوە دوپات دەکەنەوە کەسەرچاوەی هەندێ پرنسیپ ئەقڵە نەك ئەزمونی هەستی.

**ئەفسانە، میسۆلۆژی:** ئەفسانەگەری شێوەیەکە لەشێوەکانی گێڕانەوەی فۆلکلۆر.. ئەفسانە ئەو ئەو چیرۆکانەن کە لەسەرەتای پلەکانی مێژوودا دروستکراون. شێوە خەیاڵییەکانیش هەر بۆ لێکدانەوەی دیاردە جیاجیاکانی سروشت و کۆمەڵ بووە، ئەفسانەکان هەموو بەسەر هێزە سروشتیەکاندا زاڵ دەبن و بەلاوەکی دیاندەنێن، بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی دەسەڵاتی راستەقینە بەسەر هێزەکانی سروشتدا ئەفسانە ون دەبێ.

**ئەکلیرۆس:** دەستگایەکی ئایینیە ئەکلیرۆسی مەسیحی لەسەدەکانی ناوەنجیدا لەژێر سایەی دەسەڵاتی کاسولیکی و پاپاکانی رۆمادا خاوەنی هەموو دەسەڵاتێك بووەو رۆڵێکی گەورەی لەژیانی ئەو سەردەمانەدا وازی کردووە.

**ئەنسرۆپۆلۆژی:** زانستی مرۆڤ یان زانستی کۆمەڵگە سەرەتاییە کۆنەکان، لەپەیدا بوونی مرۆڤ و پەرەسەندنی و جیاوازیی لەگەڵ ئاژەڵ دەکۆڵێتەوە. سەرجەم مرۆڤ ئەکات بەچەند نەوە یا خێزانێکەوە.

**ئەنسرۆپۆلۆژی فیزیکی:** لە کولتورو چالاکیی ئەقڵ (ئەنسرۆپۆلۆژی کولتوری) دەکۆڵێتەوە.

**ئەنسرۆپۆلۆژی بەکارخستن:** لەریفۆرمی ستێمی پەروەردەو ئابوری و یاسایی و کۆمەڵگە سەرەتاییەکان پێکدێت.

**ئەنسرۆپۆلۆژی کۆمەلایەتی:** لە دروست بوونی کۆمەلایەتی کۆمەلگەو پەیدا بوون و پەرەسەندنی ستێمە کۆمەلایەتییەکانی کۆمەلگەی کۆن و سەرەتاییەکان لەخێزان و ئابوری و پەروەردەی سیاسی و ئایینی و خوورەوشت و نەریت و... هتد دەکۆڵنەوە.

**ئۆتۆکراسی:** دەسەلاتی ئۆتۆکراسی دەسەلاتێکی تاکرەوی رەهای و زۆرەملێیە، واتە فەرمانرەوایی. نوێنەری تویژاڵی هەرە سەرەوەی چینی خاوەن دەسەلات، فەرمانرەوایەتی بەدەستە.

**ئورسۆزۆکسی:** مانای وشەکە باوەڕ راست، یان خاوەن بیروڕا دروستەکان. لەساڵی ١٠٥٤دا لە کڵێسەی کاسولیکی جیابۆوە، لەچەند کڵێسەیەکی نیشتمانی و سەربەخۆی وە (قوستەنتینییە، ئەسکەندەرییە، ئەنتاکییەو قودس)و کڵێسەکانی روسیاو یۆنان و قوبرس و گەلێ ولاتی ئەورووپای خۆرهەلات و ئەمریکا پێکهاتووەو رێکخراوە.

**ئۆنتۆلۆژی:** بەشێکە لە میتافیزیک، لەسروشتی یەکەمی بوون دەکۆڵێتەوە، واتە لەمەتریاڵ و لەبوون.

**ئیرومانتیا:** سەیری جیۆمانتیا بکە.

**تۆماویزم:** رێبازی سەرەکی فەلسەفەی کاسۆلیکییە کە تۆمای ئەکوینی دەستی پێ کرد. تۆماریزمی نوێش لەناوەراستی سەدەی نۆزدەیەمدا دەرکەوت بەمەبەستی ژیانەوەی تۆماویزم. تۆماویزمی نوێ فەلسەفە دەکاتە خزمەتکاری لاهوت و لەدژی کۆمۆنیزم بەکاری

دەهێنێ. پاپا لیوی دەیەم ـ ۱۸۷۹ ـ دانی نا بە تۆماویزمی نوێدا کەتاکە فەلسەفەی دروست و گونجاوە لەگەڵ بیروباوەڕی مەسیحییەتدا.

**تیوکراتی:** ئەو ستێمەیە کە لەسەر باوەڕی ئاینی دامەزراوە، لەمەشەوە تیوری "مافی یەزدانی"، کەدەڵێ پاشا سێبەری یەزدانە لەسەر زەوی، داهاتووە. هەمیشە کڵێسەو دەوڵەتی پاشایەتی لەململانێدا بوون تا بەسەرکەوتنی پاشاو دەسەڵاتی دنیایی کۆتایی هاتووە. لایەنگرانی ئەم ستێمە ئاینییە دەیانووت سەبارەت بەوە کەفەرمانڕەوایەتی لەیەزدانەوە بەپاشا گەیشتووە دەبێ هەموان ملکەچی بن و کەس ناتوانێ لێی یاخی بێت.

**جەردکردن Abstraction:** وشەکە مانای "هەڵهێنجان" و "پوختەکردن"، زاراوەکە بەپڕۆسەو بەئەنجامەکەشی دەوترێ. بەپێی ئەم تیورییە دەبێ هەموو دەرك بە پڕۆسەکانی جەردەوە بیەسترێ چونکە بێ ئەوە دۆزینەوەی جەوهەری شت یان چونە ناو قوڵاییەکەیەوە مەحاڵ ئەبێ. لەلۆجیکی دیالیکتیکیشدا دیسان جەرد بۆ یەکلایەنی و ناپەرەسەندوش بەکار دێ یا لە چاوێنی جیا بکرێتەوە. لەم تیۆرییەدا: پرۆسەی بیرکردنەوە کەمرۆڤ جەوهەرەکەی دەرئەخات ئەیهێنێتە پێشەوەو گرنگ و هاوبەشییەکان هەڵدەهێنجێ و لە کۆنکریتییەکان قورتاریان دەکات. واتە خوڵقاندنی بیری پەتی و پاکژە.. ئەو بیرانەی کەناگیرێن یاناتوانرێ دەستیان لێبدرێ.. واتە ئەو بیرانە لەمانا کۆنگرێتییەکانیان جەرد ئەکرێن.

**جیۆمانتیا:** درۆبینـه، ئـهم زاراوه لهگـهڵ ـ ئیرۆمانتیـا، هیـدرۆمانتیاو سـیمیا. بـهو زانسـتانه ئـهڵێن "زانسـته درۆزنـهكان" ئهوانـه لهڕوسـیادا بڵاوبوونهوهو ههریهكهیان پهیوهندی بهشتێ یا بابهتێكهوه هـهبووه بـۆ نمونه: جیۆمانتیا پهیوهندی بهجیۆلۆجییهوه ههبوو، سیمیا پهیوهنـدی بهكیمیاوه ههبوو.. هتد.

**خودی شتهكان Noumenon:** وشهكه یۆنانییهو مانـای ئـهو شـتهیه كهبیری لـێ دهكرێتـهوه یـا تهسـهووری دهكـرێ.. زاراوهكـه مانـای ئـهو جهوههرهیه كهبهبێ عهقڵ تهسهوور نـاكرێ، واتـهی پێچهوانهی ئهوهیـه كه دیاردهیه. ئیفلاتوون یهكهم كهس بوو ئهم زاراوهی بهكارهێنا.

**دائیزم Deisme:** یان "یهزدانی مهرجیی" واتـه بڕوابـوون بهیـهزدان لهدهری ڕێبـازه ئایینییهكانـدا. لایـهنگرانی ئـهم فهیلهسـوفه لایـان وابـو كهیهزدان ههیـه بـهڵام دهسـت ناخاتـه نـاو كـارو بـاری ژیـانی كۆمـهڵ و سروشتهوه. لایهنگرانی ئهم ڕێبازه ئهیانووت با باوهڕ به یهزدان بهێـنین بهبێ ئهوهی هیچ ڕێبازێكی ئایینی بگرینه بهر.

**دایـك سـالاری ـ ماتریـاركی:** پلهیـهكی مێژوویـیه لـه پهرهسـهندنی كۆمهڵگـهی میشـاعهی سـهرهتایی كـهدایك ڕۆڵـی یهكـهم لهبـهڕێوهبردنی ئابوری و كۆمهڵایهتی بینیوه. ئهم ستێمه لهههموو كۆمهڵگهیهكدا، بـهبێ دهگمهن، هـهبوو. لهوسـهرهتایهدا ژن و مێـردی بهكۆمـهڵ بـووه.. بۆیـه منداڵ ههر دایكی ناسراوهو ههر ئهمیش سـهرناوی وهچـهو نـهوه بـووه.. ئابوری تیرهو تایهفـهش بهدهسـت ئافرهتـهوه بـووه. ڕاوشـكار پیشـهی

پیاو بووه بەڵام هەموو پێویستی ژیانی دانەپۆشیوە.. لەپێشەوە هەموو ژن کاری کشتوکاڵ سەرپەرشتی ماڵ و منداڵ و ئامادەکردنی خواردن و کاری کێلگەیان کردووە، بۆیە خاوەن دەسەڵات بوون. لەگەڵ دەرکەوتنی بەخێوکردنی ماڵات و ئاژەڵدا ڕۆڵی پیاو زیاترو هی ژن کەمتر بووە.. ئیتر بەرە بەرە پیاو بۆتە هێزی بەرهەمهێنەرو خاوەن کەرەسەو ئامرازی بەرهەمهێنان و خاوەنی کۆیلە بەمەش ستێمی مەتریارکی نەماوەو ستێمی باوکێتی - پاتریارکی، باوك سالاری - دەستی پێ کردووە.

**دەهری:** ئەم تاقم و کۆمەڵە خەڵکە بوون کەبڕوایان بەیەزدان نەبووە، ئەیانووت: گیتی ئەزەلی بوەو هەر ئەزەلیش ئەبێ.. کەس دروستی نەکردووە.. دەهرییەکان هیچ جۆرە باوەڕێکی ئاینییان نەبووە.

**دوابێکهاتن Epigenesis،** تیوری پەرەسەندنی مەلۆتکەی تەنە ئۆرگانیکەکانە.. ئەم تیورییە بەپێچەوانەی تیوری "پێکهاتنی پێشین - Preformationism" وادائەنێ کەپەرەسەندنی ئۆرگانێکی پێکهاتنێکی نوێیەو هیچ شوێنەوارێکی پێکهاتنی پێشەکی پێوە دیار نییە.

**دوانەیی Dualism:** (دوانکاری) ئەو فەلسەفەیە کەدەڵێ گەردوون لەژێر ڕکێفی دوو پرنسیپی دژ بەیەکدایە - یەکەمیان "خێرە" و

ئەوەکەی نـر "شـەڕە" ئەوانـەی پـەیڕەوی ئـەم فەلسـەفەیان دەکـرد بڕوایان وابو کەمرۆڤ لەدووشت پێکهاتووە ـ ئەو. دوانەش گیان و لەشە.

**دۆگمـــاتیزم Dogmatism**: شـــوێنێکەوتنی کوێرانـــەی ڕێبازێـــك، چەقبەسـتویی عـەقڵی. تێگەیشـتەیەکی تایبـەت بـەباوەڕە. دۆگـم یـا دۆگمەکان کەباوەڕێکیان هەبێ ئیتر بواری هیچ جۆرە مشتومڕو ئاڵوگۆڕو کەم و زیادکردنی نادەن.. چونکە بڕوای تەواوەتییان بەوەیە کـەخۆیان خـاوەن حەقیقەتـــەکانن. کەچــی لەبنەچـــەدا ئـــەو حەقیقەتانـــەیان سەلمێندراوی بێ بەڵگەن.

**دۆمـــەنیکان**: دامەزراویچـکی ئـایینی "ڕەهبانییـە" ئەنـدامانی ئـەم دامەزراوە بەبرایانی "ڕێ پیشاندەر" ناویان دەرکردووە لەساڵی ـ ١٢٠٦ ـ دا دامەزراوە بەو ئامانجەی ببێتە مەڵبەنـدی بەدرۆخستنەوەی هـەموو ئـەو داهێنـە نوێیانـەی لەسـەر ئـایین دەکـرێن، بۆیـە لەچـەرخەکانی ناوەڕاستدا بوون بەخاوەن فەرمانی فەلسەفی و لاهوتی.

**دیالیکتیـــك Dialectics**: بەرامبـــەر وشـــەی "جـدل"ی زمـــانی عەرەبییە. کۆڵینەوەیە لە ناوەڕۆکی "بیر" خۆی نەك شێوەکەی.. مانای کۆڵینەوەیە لەیاسا بنچینەییکانی گۆڕان و جوڵەو پێکاچوون لەسروشـت و کۆمەڵدا. کەناکۆکی بەبنچینەو خوڵقێنەری گۆڕانەکان دادەنێ و دەڵێ: شت لـەگۆڕانی یەکبینەدایـە. مـەتریالیزمی دیـالیکتیکیش زانسـتی یاسـا گشتییە بنچینەییەکانی پەرەسـەندنە لەسروشـت و کۆمەڵـدا. نـاوەڕۆکی تیۆری دیالیکتیکی بڕوابوونـە بـە نـاکۆکی واتـە هـەر شـتێك دوو لایـەنی

پۆسەتیڤ و نێگەتیڤ، چاك و خراپی، تیایە، لایەك ئەمرێ و لاکەی تر گەشەئەکات. لای دووەمی ئەم تیوریە "نەفی نەفییە" کە ڕێڕەوی پرۆسەی دیالیکتیکی دیارئەکات.

**دینامی - پۆزسەتیڤی:** ئەم فەلسەفەیە لەناو ڕەگەزە مەتریالیستەکاندا تەنها بڕوا بەو هێزانە ئەکات کەکارە لێکدراوەکانیان بە درێژەوەبوونی تەنەکان و خسڵەتەکانیان دیار ئەکرێ. فەیلسوفی فەرەنسی کونت ۱۷۹۸ - ۱۸۵۷ داینا. نکوڵی لەزانینی پەیوەندییە یاساییەکانی ناوەکیی ئەکردو دیسان حاشای لەوە ئەکرد کە فەلسەفە بەرنامەیەکە بۆ زانین و گۆڕینی جیهانی بابەتی. ئەم فەلسەفەیە خۆی لەسەروو مەتریالیزم و ئیدیالیزمەوە دائەنا.

**ڕۆمانسی - ڕۆمانتیزم:** جوڵانەوەیەکی ئەدەبی هونەرییە، لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە لە ئەوروپادا دامەزرا. لەئاکارەکانی ئەم ڕێبازە... زاڵبوونی هەواو خەیاڵی شاعیرانەیە بەسەر عەقڵدا، شاتوبریان بڵاوی کردەوە. لەنوێنەرە مەزنەکانی ئەم جوڵانەوەیە: لامارتین و هۆگۆ بوون.. ڕۆمانسییەکان خولیای داب و نەریتی کۆن بوون، لەدژی شۆڕشی فەرەنسا وەستان، لەگەڵ هەڵەکانیشیاندا ڕۆڵیان لەدۆزینەوەی چەند یاسایەکی زانستی مێژوودا وازی کرد.

**ڕێنیسانس - سەردەمی بوژاندنەوە یا ڕاپەڕین:** پلەیەکە لەپەرەسەندنی ڕۆشنبیری ئایدیۆلۆژی لەهەندێ وڵاتانی ئەوروپای خۆرئاواو ناوەڕاستدا. دروست بوونی پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان پێویستی هاتنەکایەی ئەم

جولانەوەیەی سەپاند، بەگشتی گەشانەوەی بەربڵاوی هونەرو زانست ئەکرێ بەهاوسەردەمی ئەو پلەیەی ڕاپەڕین. مێژووناسان ماوەکەی لەسەدەی چواردەوە تاسەدەی حەڤدە دیاردەکەن.

**رواقی Stoi**، ئەم ناوە لە کۆندا بەو جێگەیە وتراوە کە شاعیرەکانی تیا کوبونەتەوە.. ئیتر ڕێبازە فەلسەفیەکە Stoicism یان پێ وتووە. فەیلەسوفە موسلمانەکان بە خاوەن چەتر یان خاوەن پایە ناوی پەیڕەویکەرانی ئەم فەلسەفەیەیان بردووە.. (سەیری کۆسمۆپۆلیتی بکە).

**زەردەشت**: ڕابەرە ئایینییە لە دەوروبەری ٥٨٣ پ ع دا کۆچی کردووە پێغەمبەرێکی کۆن و داهێنەری ئایینی زەردەشتییە. زەردەشت لەمیدیا ـ کوردستانی ئێران ـ هاتۆتە جیهانەوە. یەکەم جار لە "بەلخ" ـ ئێستا دێیەکە دەکەوێتە ئەفغانستانەوە ـ ئایینەکەی بڵاوکردەوە لەوێشەوە گەیاندرایە وڵاتانی فارس. ئەخمینییەکان کردیان بەئایینی ڕەسمی دەوڵەتەکەیان. دیسان ساسانییەکان کردیان بەئایینی ڕەسمی دەوڵەتەکەیان تا عەرەبە موسلمانەکان ئێرانیان گرت و دەوڵەتی ساسانیان ڕوخاندو ئایینی ئیسلام جێگەی زەردەشتیی گرتەوە. خاڵی گرنگ لەم ئاینەدا بڕوابوونە بەململانێی یەکبینەی نێوان دووشتی دژ بەیەك کە "خێر" و "شەڕ"ە. خێر خوای ڕووناکییە (ئەهوارمازدا) و (ئورمازدا) شەڕیش خوای تاریکییە (ئانجرۆمینیۆش) ئەهریمەن.. زەردەشتی لەمەڕ: ئەو دونیا سزاو زیندوو بوونەوەی مردو و گەلێ شتی

کاری گەورەیان کردە سەر ئایینی جولەکەو مەسیحییەت.. زەردەشتی تا ئێستا لە هیندستان ماوە بە کەمیش لە ئێراندا.

**زەمان و زەمین:** دووشێوەی سەرەکی بوونی مەتریالە. فەیلەسوفە ئیدیالیستەکان بابەتی زەمان و زەمین نکوڵی لێدەکەن، بەڵام مەتریالیزم بابەتی زەمان و زەمین دەرك پێ دەکات و نکوڵی لەبوونی شتی تر دەکات کەلە دەری ئەمان بن. زەمان و زەمین لەمەتریال جودا نابنەوە.

سەرەنجامی **Apriori** ـ ئێستنتاجی یا بەدیهی.

**ستاتیك:** زانستی پارسەنگی هێزەکان.

**سۆسیۆلۆژی** ـ کۆمەڵناسی ـ یازانستی کۆمەڵایەتی.

**سیمیا:** سەیری جۆمانتیا بکە.

**فەرەنسیسکانی:** دامەزراوێکی ئاینییە، فەرەنسیس ئەسیزی لە ساڵی ١٢١٠دا دایمەزراند، هەزاریی کردە بنچینەی ژیانی ئەم دامەزراوە "رەهبانییە" قەشەکانی فەرەنسیسکانی خۆیان بۆ بڵاوکردنەوەو فێرکردنی ئایینی مەسیحی تەرخان کرد. دوای بیست ساڵێك لەدامەزراندن خۆیان گەیاندە شارە گەورەکانی میسر و سوریاو لوبنان و فەلەستین. قەشەکانی ئەم دەزگا ئایینییە "پاسەوانی زەوییە پیرۆزەکان بوون".

**فەلسەفەی تێوردبوون ـ تاملی: Spesulative philosophy** فەلسەفەی (رەڵێدان) (ژێربێژی) کۆمەڵە رێکخراوەیەکی مەسەلە فەلسەفییەکانە کەبە بەڵگە دەهێنرێنەوەو بێ ئەوەی پەنا ببرێتە بەر

ئـەزموون. فەلسـەفە تێووربوونەوەییـەكان دەخولقێنـن. بـەڵام هـیچ ڕێبـازێكی تێووردبـوونی نـەیتوانی لەبـەردەم تاقیكردنـەوەی ڕۆژگـاردا بوەسـتێ چـونكە لـە شـیكاركردنەوەی دواییـدا بەشـێوەیەك لەهـەموو هەمەجۆربوونێكی فەلسـەفەی تێوردبـوونی دەوڵەمەنـد تـرە كـە قـابیلی سنوورداركردن نەبێ.

**فیزیۆلۆژی ـ فسیۆلۆژی:** زانستی كارو فەرمانی ئەندامانی لەش.

**فینۆمینۆلـۆژی:** زانسـتی دیاردەكـان، لقێكـی زانسـتەكانەو لەوەسـفی دیاردەكان و پولینیان دەكۆڵێتەوە.

**فینۆمینۆنس Phenonenons دیاردە ـ مانای:** ڕووداوێ یان بوویـەك كەبتوانرێ سەرنجی لـێ بدرێ.

**كۆسمۆپـــۆلێتی Kosmoplites**، وشـــەكە یۆنانییـــەو مانـــای هاونیشـتیمانی جیهانییـەو، ڕواقییـەكان یـەكم دەسـتە بـووە كـە ئـەو بیرەیـان بڵاوكردۆتـەوە. ئـەم خواسـتی جیهـانیكردنی هاونیشـتمانییەو نەهێشـتنی سـنورە لەگـەڵ خواسـت و تێندێنسـی گیـانی سـەدەی هیلینیسـتی و گەلـە یەكگرتووەكانیـدا دەگونجـاو وەڵامدانەوەیـەكی ئارەزووی دامەزراندنی دەوڵەتێكی ڕۆمانی "جیهانیی" بـوو. لـە كاتێكـدا ئەرسـتۆو ئیفلاتـوون گـەلی یۆنانیـان لەسـەروو گـەلانی تـرەوە دائـەناو تەنانـەت مـافی كۆیلـەكردنی گەلانیشـیان بـەڕەوا ئـەزانی. لـەو كـات و سەردەمەدا ڕواقییـەكان هـەموو خـەڵكیان لەبـەردەم یاسـادا بەیەكسـان دائەنا كە ئازاد و كۆیلە، یۆنانی و بەربەرەكان و پیاو ژنیشی دەگرتەوە،

ئەمەش هەنگاوێکی پێشکەوتوانەی سەر ڕێگەی پەرەسەندنی بیری یەکسانی مرۆڤایەتی ئەو سەردەمە بوو. بۆ سەردەمانی فراوانبوونی دەسەڵاتی ئیمپریالیستانە لەلایەك و یەکێتی سۆڤیەت لەلایەکی ترە.. ڕەچەڵەکی بیرەکە هەر بۆ ئامانجی ئابووری و سیاسیی و دەستگرتنە بەسەر بازاڕەکاندا: تیورییەکی کۆنەپەرستانە بووە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.. داوای دەست بەرداری لەهەستی نیشتمانپەروەری کولتوری نەتەوایەتی و کەلەپورو نەریتی نەتەوە... هتد ئەکات، ئەمەش تەماعی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان دەردەخات کەرەواج بەم بیرە ئەدەن تا دەست بەسەر جیهاندا بگرن و ئەوەی ناوی سەربەخۆیی و ئازادی گەلانە زەوت بکەن. بە جیهانیبونیی ئەم سەردەمەش قۆناغێکی نوێ و گەشەکردووی هەمان بیرە.

**کۆسمۆجۆنی:** لقێکە لەلقەکانی زانستی (گەردون)... باسی ئەسڵ و پەرەسەندنی ئەستێرەو تەنەکانی ئاسمان و سستێمەکانیان ئەکات، لەڕووی تیوریشەوە مرۆڤ ئەتوانێ باسی زانستی پێکهاتنی گەون لەڕووی پەیوەندی لەگەڵ ئەستێرەکان و باسی زانستی پێکهاتنی گەون لەڕووی ئەستێرە گەڕۆکەکانەوە بکات، هەرچەندە لەڕووی پراکتیکەوە پەیوەندییەکی بەرابەرییان لەگەڵ یەکتردا هەیە. ئەمیش وەکو کۆسمۆلۆجی زۆر بەستراوەیە بەفەلسەفەوە... ئەمانەش شانۆی ململانێی نێوان ئیدیالیزم و مەتریالیزم، ئایین و زانست بووە.

**کۆسمۆلۆژی**: لقێکە لە لقەکانی زانستی (گەردون)، ئەم زانستە واتەسەووری گەردون ئەکات کەکۆیەکی ڕەسیوە. بەگشتی لەسەرچاوەو بنەچەی گەردوون و جۆری پێکهاتنی زانستی گەردونی نوێ دەکۆڵێتەوە تا ئەو سنورو ناوچەیە دەگرێتەوە کە تیایا زانستی فەلەك و فیزیك فەلسەفە تێکەڵ دەبن.

**گاڵتەجاڕی** Cynosarg: وشەکە خۆی بۆگاڵتە پێ کردنە یان بۆ سەرنجێکی گاڵتێنە بەکاردەهێنرێ. مانای دەقی وشەکەش سەگی خێزانە. لەمەوە Cynisn: هاتووە. گوایە دەڵێن "ئەنتیسقان" و قوتابییەکانی لەشوێنێکدا کۆدەبنەوە کەناوی ـ Cynosarg ـ سەگی خێرل بووە، ئیتر بۆ گاڵتەکردن بەو کۆمەڵە وایان ناوناون. لەعەرەبیدا بە ال "کلبیە" ناودەبرێ. ئیتر فەلسەفەکەش بەو جۆرە ناونراوە... بۆ کوردییەکەشی "گاڵتە جاڕی" زیاتر لەناوەڕۆکی زاراوەکەوە نزیکە.

**گەڕیدەیی ـ میشائی** Periatetikos: واتە گەڕۆکەکان، ئەم فەلسەفەیە بۆیە واناوی وتراوە چونکە کەئەرستۆ وانەی بەشاگردەکانی ئەوتەوە بەڕۆیشتن و پیاسەو گەڕانەوە قسەی بۆ ئەکردن وشاگردەکانیشی بەدەوریەوە لەگەڵیا ئەجولان و گوێیان ئەگرت.. سەبارەت بەوەش ئەو زاراوەم بۆ هەڵبژاردووە.

**گنۆستیزم** Gnosticisn: ڕێبازی ئەو مەسیحییانە بووە کە بڕوایان وابو مەتریال شەڕەو بەزانیاریی گیانیی، لێی سەرفراز دەبن.

**گومـانیی** Scepticism: لایـەنگرانی ئـەم فەلسـەفەیە گومانیـان لەهەموو شتێ ئەکردو هیچیان بەیـەقینی نەئەسـەلماندو ئـەیانووت هـەر لـەم ڕێگەیـەوە دەگەینـە ئـەنجامی دروسـت و ڕاسـت. "بـیرون" ڕوونـاکبیرێکی ئـەم ڕێبـازەبوو ئـەیووت: فلانەشـت وادەردەکـەوێ کەسپییە، هەنگوین وا دەردەکەوێ کەتام و شیرینە، ئاگر وادەردەکەوێ کەسووتێنەرە... ئیتر بـەو جۆرە ئەوانـەی پـەیڕەوی ئـەم فەلسـەفەیە ئەکەن بڕیاری تەواوەتی لەسەر هیچ شتێك نادەن. لەزمانی عەرەبیدا بـە "الفلسفه الريبيه" ناو دەبرێ.

**لۆگۆس ـ (وشە، ئەقڵ، یاسـا):** ئـەم زاراوە لەئـەدەبیاتی فەلسـەفی و ئاینیدا زۆر باو بووە، لای ئەرستۆو ئیفلاتوون یاسـای هـەبووەو یـەکێك بووە لە پرنسیپە لۆجیکییەکان. ئیتر هەر فەیلەسوفەو بـەماناو واتایـەك بەکاریهێناوە. هـیگڵ والـە لـۆگس ئەگەیشـت کەتێگەیشـتەیەکی ڕەهایـە (متڵەقــە). دیســان فەلســەفەکانی خۆرهــەلات و چــین و هندســتان جۆراوجۆر لێکدانەوەیان بۆ ئەم زاراوە کردووە.

**مانەوی:** باوەڕی خێرو شەڕ، ڕووناکی و تاریکییە. ئەڵێن ئیزدییـەکان ئەوەی ئەم ڕێبازە ئاینییەن.

**مەبەستی** Telelogy **الغائیە:** ئەم تیورییە دەڵـێ هـەموو دیاردەکـانی سروشـت، مەبەسـتییە، بـەپێی ئـەم تیورییـە نـەك هـەر مـرۆڤ بـەڵکو دیاردەکانی سروشتیش "مەبەست" ڕێنومای یەکە بە یەکەیانە و جۆرە گیانێکیـان هەیـە، جـا لەکاتێکـدا مـرۆڤ ئـەرکی خـۆی بەڕێگەیـەکی

هۆشیارانه دەستنیشان دەکات وا "مەبەست" بەڕێگەیەکی ناهوشیارانه لەسروشتدا ڕوێنراوە.

مەبەستی بۆ ئەوەش چووە کە دەڵێ ڕەگ و پرنسیپی ژیان و بیر بۆ ناو بنچینەی مەتریال شۆڕبۆتەوە کەنەك لە گەردی زیندوو بەڵکو لە مۆناداتیش پێك هاتووە. ئەم تیورییە هەوڵ ئەدات پەیوەندی سەرجەمی ناوخۆی هەموو دیاردە سروشتیکان و شەقڵی ملدانی بۆ بڕیاری یاسا لێك بداتەوە.

مەتریالیزمی باو Vulgar: لە عەرەبیدا بەمەتریالیزمی "عامی" یا ئاسایی و بێ ڕتوش ناوبراوە. ئەمە ڕێبازێکی ناو فەلسەفەی سەدەی نۆزدە بوو، زیاد لەپێویست پرنسیپە بنچینەییەکانی مەتریالیزمی هاسان دەکرد.. هۆی دەرکەوتنی زیاتر پەرەسەندنە بەگوڕەکەی زانستی سروشتی بوو ئیسان وەك دژە کردار بەرامبەر بە ئیدیالیزم... بەگشتی نکۆڵیان لە فەلسەفە دەکرد. ئەیانویست بە لێکۆڵینەوەی زانستانە گرفتە فەلسەفییەکان چارەسەر بکەن.

**مەزدەکی:** مەزدەك بانگاوێژێکی ئاینی ئێرانی بووە، پەیڕەوی فرمانەکانی "مانەوی" دەکرد، ئەیویست لەماڵ و ئافرەتدا هاوبەشێتی گشتیی و جۆرە سۆسیالیزمێ بێنێتە کایەوە. قوبادی یەکەم ـ ی شای ئێران مەزدەگی کردە ئاینی دەوڵەت تا هاتنی "کیسری ئەنۆشێروان" ئیتر زەردەشتی جێگەی گرتەوە.

**مرۆڤ پەروەری:** ئەم ڕێبازە مرۆڤ بە جەرگەی ژیان و گەردوون دائەنێ و لێیدەکۆڵێتەوە. لەسەردەمی گریك و ڕۆمادا گەشاوەتەوەو دوای بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیح، لاهوت جێگەی گرتۆتەوە، لەسەدەی پانزدەشدا لەسەردەمی "رینیسانس"دا سەر لەنوێ لەشێوەی گەڕانەوەی بۆ لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەبیات و کولتوور و هونەری یۆنانی کۆن هاتۆتە ئاراوە.

**مۆنارشی (مۆنارکی)** Monarchy: پاشایەتی لەسەرەتادا دەسەڵاتەکەی ڕەهابووە، لەگەڵ بالابونی دەسەڵاتی چینی بورجوادا سەری هەڵداوە. لەگەڵ گەشەکردنی شارستانیدا گۆڕاوەو شێوەی جیاجیای لەخۆگرتووە... تا گەیشتە هەڵبژاردنی پەرلەمان بە هەڵبژاردنی گشتی.

**Absolute**: فرمانڕەوایەتی سەڵتایەتی ڕەها (تاکڕەوی).

**Absolutism**: یا زۆرەملێ.

**میترۆلۆژی:** زانستی نیشانە گەری ئاسمان.

**نازانمی** Agnosticism: ئەم ڕێبازە لەزمانی عەرەبیدا بە "اللاادریە" ناودەبرێ. بەپێی ئەم ڕێبازە کەس جێگەی یەزدان و سروشت و ئەسڵیان نازانێ. وشەی Agnostic یش مانای "نازانم"ە ئیتر لەمەشەوە زاراوەکە داڕێژراوە، لینین ئەڵێ نازانمی کاکڵ لەتوێکڵ جوێ دەکاتەوەو لەهەست دوور ناکەوێتەوەو دوور لەدیاردەکان دەمێنێتەوەو نکوڵی لەشت دەکات کە ئەسڵی بێ. هەڵوێستی نازانمی

لەگونجاندنـــدا وا لەلایـــەنگرانی دەکـــات کـــە بیانخاتـــە ریـــزی ئایدیالیستەکانەوە.

**ناوەرۆک و ڕوخسار ـ یا "جەوهەرو ڕووکەش" یا "کاکڵ و تـوێکڵ" یـا "ناوەرۆک وشێوە:** دوو گوتەی فەلسەفین لایەنە بەپێویست ماتـدراوەکان لەهەر یەکە لەشتەکانی واقیعدا ڕەنـگ پێدەداتـەوە. نـاوەرۆک: کۆگـەی سیفەت و پەیوەندییە هەرە قوڵ و هەرە جێگیربووەکانی شتە کە ئەسڵ و ڕەوتی پەرەسەندنی دیاردەکات. بـەڵام ڕوخسـار: کۆگـەی سـیفەت و پەیوەندییە جۆربـەجۆرە دەرەکـی و بەجوڵـەی شـتەوەیە کەڕاسـتەوخۆ بەهەسـتەکان ئەدۆزرێنـەوە. ڕوخسـار ئـەو حاڵەتەیـە کەجەوهـەری تیـا دەدۆزرێتەوە. یەکێتی ئەم دوولایەنە لەوەدا دەردەکـەوێ کەهەریەکـەیان دەگۆڕێ بۆ ئـەوی تـرو ئـەوەی ڕۆژێ لـە ڕۆژان لەشـوێنی لەشوێنەکان جەوهـەر بـووە ئەشـێ لـەکاتێکی تـردا (یـان لەشـوێنێکی تـردا) ببێتـە ڕووکەش... پێچەوانەکەشی هەربەو جۆرە ڕاستە بەڵام یەکێتی نـاوەرۆک و ڕوخسار هەمیشە ناکۆک و هەردووکیان دوولای ناکۆکن.

ناوەرۆک ئەو ڕەگەزەیە کە دیارو سنووردار ئەکات بەڵام ڕوخسار ئـەو ڕەگەزەیە کـەدیارو سـنووردار ئـەکرێ. ڕوخسـار ڕاسـتەوخۆ دەرئەکـەوێ بەڵام ناوەرۆک شاراوەیە، ڕوخسـار لایەنـەکانی لـەناوەرۆک زیـاترە بـەڵام ناوەرۆک لەروخسار قووڵترە... ئیتر گەلـێ ناکۆکی تریان هەیە. نـاکۆکی نێوان ناوەرۆک و ڕوخسـار، سروشـتی ئاوێتـەی نـاکۆکی پرۆسـەی زانـین سنووردارئەکات، چونکە "هەر زانستێك ڕووکەش دەبێ ئەگەر ڕوخساری

دەرەکی شتەکان لەگەڵ ناوەڕۆکیدا ڕاستەوخۆ ڕێك بکەون "(کارل مارکس ـ سەرمایە) یەکێتی ناوەڕۆك و ڕوخسار نیسبی وکاتییە، گۆڕان بەرەنگاربوون ململانێی دێتە ڕێ.. سەرچاوەی ناکۆکی نێوان ناوەڕۆك و ڕوخسار جیاوازیکاری هەریەکەیانە لە پەرەسەندندا.. ناوەڕۆك بنچینەی پەرەسەندنە. "شێوە" شێوەی بوونی شتێك لەشتەکانە، ناوەڕۆك جوڵەی خۆی هەیەو شێوە لەسەر ئەو بەندە... هتد.

**ناوچەگەری** Particularism: خۆ بەستنەوە بەناوچەیەکەوەو حەز نەکردن لەگەڵ بەشێ یا ناوچەیە یا شوێنی تردا یەك بگرێ.

**ناویی** Nominalism، لەزمانی عەرەبیدا بە "الاسمیە" ناو دەبرێ. فەیلەسوفەکانی ئەم مەزەبە ئەڵێن ڕاستیی بوونی "توخم و چەشنەکانی" وەك خۆیان نین. وایان دائەنا کەتێگەیشتەی جۆرە گشتییەکان "ناو"ی ئەنجامی بیری مرۆڤ ئەو زمانەیە کەهەر بەکەڵکی نیشانەو دیاردە کردن دێن، بۆ ئەو شتانەی کەلە ڕاستیدا هەن. بەپێچەوانەی ڕیالیستەکانەوە لایەنگرانی ئەم ڕێبازە نکۆلییان لەوە دەکرد کەتێگەیشتن نمونەی پێشەکی و سەرچاوەی خولقێنەری شتە. دانیان بەیەکەمی بوونی شت و لابەلایی تێگەیشتە دائەنا. بەو جۆرە یەکەم تەعبیر بوو لە مەتریالیزمی سەدەکانی ناونجی.

**واتا ـ مەقولە** Categoricc: وشەیەکی یۆنانییە مانای بەیان یان تانکیدە. لە فەلسەفەدا تێگەیشتە سەرەکییەکان کە زیاتر خاسییەت و لاو پەیوەندی دیاری واقیع و زانین بەگشتی و جەوهەری ڕەنگ پێ

دەداتــەوە. واتاكــان لەپرۆســەی پەرەســەندنی مێــژوی زانــین لەســەر بنچینەی پراكتیكی كۆمەڵایەتی كەوا لەمرۆڤ دەكات زانیاری و رۆڵی جیهانی دەوروبەری وەربگرێ... پێكهاتووە.

**یەعقوبییەكان:** یەكێك لەو دوو تاقمەی (پارتی بۆرژوا)یە لەسەردەمی شۆرشی فەرەنسا ١٧٨٩ "پارتی چیا" شیان پێدەوت. ئەم تاقمە نوێنەری بەشی شۆرشگێری بورژوای ئەو سەردەمەی فەرەنسا بوو. داوای لەناوبردن مۆنارشی و دەرەبەگێتی دەكرد. بەشەكەی تر جیرۆندییەكان بوون، ئەمان رێگەی ئاشتبوونەوەو لەدواییشدا سازشكارییان گرتەبەر.

**یۆتۆپی:** ئەز زاراوە لەناوی كتێبەكەی "تۆماس مۆر"ەوە هاتووە، هەندێ ئەڵێن مانای یۆتۆپیا "ئەو شوێنەیە كەهەر نییە". رای دووەمیش ئەڵێ مانای "وڵاتی خێروخۆشییە".

هاوپەیوەستی Immanence ـ الفیض ـ نظریة الفیض. ناوەكیی پەیوەستیدارە.

**هەرتەقە** Heresy: ئەم وشەیە یۆنانییە، مانای هەڵبژاردن ئەگرێتەوە، مەبەستیش دووركەوتنەوەیە لە تیوری ئایینی ئەسڵی. ئەم رێبازە داهێنراوە، لەئایینی نەسرانیدا هەر بەناوی ئایینەوە هێزانەیە كایەوە، بەلام لەناوەرۆكدا دژی پرنسیپە ئایینییەكان بووە. بزوتنەوەكانی هەرتەقە بایەخێكی گەورەیان هەبوو چونكە مژدەی روخاندنی سستێمی دەرەبەگیی لە ئەورووپای خۆرئاوادا رادەگەیاند.

**هیدرۆمانتیا:** سەیری جیۆمانتیا بکە.

**هیلینی Hellenism:** پێڕەوکردنی بیرونەریتی شارستانێتی یۆنانی کۆنــە ٣٢٣ ـ ٣٠ پ ع. مەبەســـتیش لەهیلیینییــەکان مەکــدۆن و یۆنانییــەکانی ســەردەمی کۆنــە. فەلســەفەی هێلینســتی و ڕێبازەکـانی، لەشوێنی خۆیدا ڕوون کراوەنەتەوە.

## وشەکان

ئاکام: ئەنجامی کۆتایی، کۆتایی کەوتنەوەی

ئاوێتە: مرکب، ترکیب، Synthesis=پێکهاتە

ئەدگار: خاسییەت= ئاکار، تایبەتمەندی

ئەلەکتراو: کهرمائی

ئەکتیڤ: فعال، چالاکی

ئەندازەی شیکاری: الهندسة التحليلية

ئۆرگانیکی: عضوی، ئەندامیی

ئینسکلۆپیدیا: موسوعة

بابەتی: موضوعی

باری سەرنج: انطباعات

بارودۆخ: ظروف، هەلومەرج

بالاکردن: نمو، نەشونما

بانگاوێژ:داعیه

باو: باو، زاڵ،سائد

بەرزپەرەیی: ارتقائی

بەکارخستن: تطبیق، جێبەجێکردن، خستنەکار

بەلەدویستی: حب الاستطلاع، حب الاطلاع

بەڵگە: علة، حجة، دلیل

بەڵگەیی: سەرەنجامی، استدلالی، استنباطی.

بڕ: مقدار

بڕیار: قرار، حکم

بڕیارە ئاوێتە پێشبینییەکان: الاحکام الترکیبیة القبلیة، بڕیارە پێکهێنەرە پێشینەکان.

بڕێنەرەوە: فاصل، قاطع

بسوت: قابیلی سووتاندن، لەبار بۆ سوتان

بنەچەی جۆرەکان: اصل الانواع، بنچەی چەشنەکان.

بوار: هەودا، مجال

بێ هەستیی: لاشعوری

بێ مەرجی: اللامشروط، مەرج بەدەر

بێوێنە: مثالی ـ شاری بێوێنە:المدینة الفاضلة، شاری نمونەیی

پاتریارکی: باوکێتی، باوك سالاری

پاشایەتی لا ڕووناك: الملکیة المستنیرة(المتنورة)

پالەپەستۆی هەوا: ظغط الجو

پایەگا: أرکان

پەتی: بەتەنها، ڕووتو قوت، مجرد، ڕوتوخاوێن

پەرەسەندن: تطور، تەشەنەکردن

پەسن: مدح، پیاهەڵدان

پرۆسه: عملية، صيرورة

پۆسەتڤیزم:Positivism ، الفلسفة الوضعية

پۆلین: جۆرکردن، تصنيف

پیتۆل: نۆرزان، زیت و وریا، زیت و نۆرزان

پێدراوه هەستییەکان: المعطيات الحسية، هەبووە هەستییەکان

پز، پزه: جنين

پێشبینی: تنبوء

پێشخواست: طموع، بەخواست

پێکهاتنی پێشین: التشكيل المسبق، شێوەی بەرایی.

پێکهـاتنی کۆمەڵایـەتی: مەبەسـت تیـۆری "العقـد الاجتمـاعی"یـە، پەیمانی کۆمەڵایەتی.

پێگەیاندنی غەیبی: ایحا غيبي، بیر بۆ هاتنی غەیبی.

تایبەتێتی: خصائص، ئاکارو نیشانەکان، خەسڵەت.

تەدارەك: مرکب، کەژاوە، ئاپورە

تەن: جسم

تەوەر: محور

ترۆپك: لوتکە، قمة

توێژینەوە: دراسە، بحث، تەحلیل

توێکاری: تشریح

تۆێکارزانی: علم التشريح، زانستی تۆێکاری

تێز: طرح، موضوعة، اطروحة.

تێگەیشتە: مفهوم، چەمك

تێگەیشتن: فهم

تێوربوونی: تێوربیی، تاملی، رامانی.

تێندێنسی: نزعە، میل

جەرگە: ناوەند، مرکز، ناوجەرگە، چەق.

چاپگە: دار للطباعة والنشر، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوە

چاونەزێر: تەماحکار، چاوبرسی

بەرچاو: عینی، کۆنکرێتی، بەرجەستە.

چەق: جەرگە، مرکز، ناوەند

چەندبارە: تکرار، دووبارەبوونەوە

چوستی: کفاء ة ، چوست و چالاکی

خۆ: ذات - خۆی: ذاتی - خۆیەتی: ذاتیة

خورت: بەهێز، توندوتۆڵ

خۆ: الانا - خودی

خۆنا - اللا انا، ناخودی

خۆکار: عفوی، بێ بەرنامەیی

هەستپێکەری خۆیی چالاك :حدس الذات الفاعلة

داپێچی: الحاح، اصرار، سوور بون، پێ لەسەر داگرتن

داڕشتن: فۆرمەلە کردن، صیاغە و داڕشتنەوە

داشكان: تنازل، وازهێنان له شتێك بۆ كەسێكی تر.

داهێنان: ابداع،بدعة.

زەمان وزەمین: شوێن وكات، الزمان و المكان.

زۆرەملێ: استبدادی

زۆرداری: دەستەلاتی زۆرداری، سلطةاستبدادية

زیادەوەری: مبالغه،زێدەوەڕی

سازان:وفاق،سازبون،كۆكبون

سازش: مساومة

سەرجەمی: شامل

سەرچاوە ئێشێنییەكان: Apiori، منطلقاي قبليه-به پێی قۆناغ دەستنیشان دەكرێن

سەرداری: سیادە

سنووردار: محدود

شاری بێوێنه: المدينه الفاضلة، شاری نموونەیی

شەبەنگی ڕۆژ: طيف الشمس

شەقڵ: طابع، سمة

شمەكی نەختینەیی: سلع نقديه،شمەكی نەختی

شیكاری: تحليلی

شێواز: نمط

شێوە: شكل

ڕێنماکان، فرمانەکان: تعالیم

کاردانەوە: دژەکردار، رد فعل

کارلێك: تفاعل

کڵێسە: کەنیسە

کڵێسۆکی: ادیرە

کۆنپارێز: محافظ، نەریت پارێز

کۆنکرێت: چاوێنی، ملموس

گەردوون: کەون

گەردیلە: ذرة

گەشەکردن: ازدهار

گریمانە: فرضیة، بۆچوون

گشتێتی: سەرجەمیی هەموو، الکلی، العام

گوزەرگا: ممر، مسلك-ڕێڕەو

گومان: ظن

گیان: ڕوح

لاتنگیری: تطرف ـ لاتنگیری: متطرف، زێدەڕۆ،توندڕەو

لاشاندن: تجسید، بەرجەستەکردن، شێوەپێدان

لێکدانەوە: تفسیر

ماهییەت: ناوەڕۆك، جوهر، گەوهەر

ماتدراو: شارراوە، کامن

ماتریارکی: دایك سالاری، دایکێتی

مامناوەندی: معتدل

مشەخۆر: طفیلی

مۆڵبوون: تمرکز، ناوەندگر

میللییە ئاژاوەچییەکان: الشعبیون الفرضویون

میللییە شۆڕشگێڕەکان: الشعبیون الثوریون

میللییە هاندەرەکان: الشبعیون المحرضون

میتافیزیکی: بان سروشت، ئەودیو سروشت

ناکۆکییـە هاوتەکـەکانی نـاوخۆ: التناقضـات الداخلـة اللازمـة، ململانێ تەکیەکەکانی ناوخۆ

نامۆ: غریب، نەئاشنا

ناوەند: نێوکار، وسط

نەبویی: عدمی

نەپەنی: شارراوە

نەفیگە: منفی، تاراوگە

نەنگ: عەیب، ناجۆو، ناپەسەند

نوبەلا: خاوەن مولکە گەورەکان(وەك خان و ئاغا)، پیاو ماقوڵ

نومینێنیسNoumenens: خودی شتەکان

واتا: مقولە، واتا، وتەزا

واقیعی پێدەری ڕاستەوخۆ: الواقع المعطى المباشر، واقیعی هەبوی ڕاستەوخۆ

ویست: ارادە

یەکبینە: بەردەوام، باستمرار

هاوبەشێتی سەرەتایی: میشاعەی سەرەتایی، المشاعة البدائیة، پێکەبیوە ژیانی بەرایی

هاوڕەگەز: هاوتوخم، متجانس

هەست: حاسە

هەستدانەوەAffecte: انفعال، دژە کردار، هەڵچون

هەستوەر: حساس، بەهەست

هەستوەری: حساسیە

هەڵبەستراو: تلفیقی

هەڵچون و داچوون: المد والجزر

هەڵهێنجان: استنباط

هۆ: علە، سبب، فاکتەر، هۆکار

# پەراوێزو تێبینییەکان

١ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، بەشی یەکەم، فەسڵی یەکەم،ل١٢

٢ـ مارکس و ئنگلس،. دانراوەکان، بەرگی٢٠،ل٥١٣.

٣ـ سەیری کورتەی مێژووی فەلسەفە، بەشی یەکەم، فەسڵی یەکەم بکە.

٤ـ مارکس و ئنگلس، دانراوەکان، بەرگی ٢٣، ل٥٢٢.

٥ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی ٢٠، ل١٨٥.

٦ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، بەشی یەکەم، فەسڵی سێیەم، ل٦١.

٧ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، بەشی یەکەم، فەسڵی سێیەم، ل٧٠.

٨ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، بەشی یەکەم، فەسڵی سێیەم، ل ٨٤و٨٥.

٩ـ مارکس و ئنگلس، دانرلوەکان، بەرگی ٣، ل١٢٦.

١٠ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی ٢٣، ل٣٧٩.

١١ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، بەرگی یەکەم، فەسڵی سێیەم، ل١٠٠.

١٢ـ لینین، دانراوەکان، بەرگی ٢٩، ل٢٥٥.

١٣ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی٢٩، ل٣٢٦.

١٤ـ مارکس و ئنگلس، دانراوەکان، بەرگی٢٣،ل٦٩.

١٥ـ جواهیر لال نەهرۆ، دۆزینەوەی هیند، مۆسکۆ١٩٥٥،ل٢٣٣.

١٦ـ كورتەی مێژووی فەلسەفە، بەرگی یەکەم، ل٢٠٦.

١٧ـ مارکس و ئەنگلس، دانراوەکان،بەرگی٢٠، ل ٢٤٦.

١٨ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی ٢، ل٣١٤.

١٩ـ هەمان سەرچاوەی، بەرگی٢، ل٣١٤.

٢٠ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، ل ٢٠٦.

٢١ـ هەمان سەرچاوە، ل٢١١.

٢٢ـ مارکس و ئەنگلس، دانراوەکان، بەرگی٢٠،ل٢٤٧.

٢٣ـ جۆردانۆ برنۆ. مناظرات،مۆسکۆ١٩٤٩،ل٢٩١.

٢٤ـ مارکس و ئەنگلس، دانراوەکان،بەرگی٤، ل٣٠٦.

٢٥ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی٣٢،ل ٣٦١.

٢٦ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی ٣٢،ل.ل١٤٢ـ١٤٣.

٢٧ـ هەمان سەرچاوە،بەرگی ٢،ل١٤٠.

٢٨ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، ل٢٤٧.

٢٩ـ هەمان سەرچاوە، ل٢٥٣.

٣٠ـ هەمان سەرچاوە،٢٨٠.

٣١ـ هەمان سەرچاوەل ٣١٠.

٣٢ـ هەمان سەرچاوە، ل٣١٩.

٣٣ـ لینین، دانراوەکان، بەرگی ٤٥، ل٢٦.

٣٤ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی١، ل ١٥٤.

٣٥ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی ٢٥، ل ١٠٧.

٣٦ـ هەمان سەچاوە، بەرگی ٢٥، ل٩٣.
٣٧ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، ل٣٧٤.
٣٨ـ لینین، دانراوەکان، بەرگی ٢، ل٧.
٣٩ـ مارکس و ئنگلس، دانراوەکان، بەرگی٢١، ل٢٧٨.
٤٠ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی ٢٠، ل.ل٥٦ـ ٥٧.
٤١ـ لینین، دانراوەکان، بەرگی ١٨، ل٢٠٦.
٤٢ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی ١٨، ل٢٠٦.
٤٣ـ مارکس و ئنگلس، لەدانراوەکانی سەرەتا، مۆسکۆ١٩٥٦ـ،ل٤٤٢
٤٤ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، ل٤١٠.
٤٥ـ مارکس و ئنگلس، دانراوەکان، بەرگی ٢٠، ل٢٣.
٤٦ـ هیمبل، دانراوەکان، بەرگی١، ل ٢٦٤ـ٢٦٥.
٤٧ـ مارکس و ئنگلس، دانراوەکان، بەرگی٢٠، ل٢٤.
٤٨ـ لینین، دانرلوەکان، بەرگی٢٩، ل١٦٢.
٤٩ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی٢٩،ل١٧٩.
٥٠ـ هیمبل، دانراوەکان، بەرگی ١، ل٢٠٦.
٥١ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، ل٤٢٣.
٥٢ـ لینین، دانراوەکان، بەرگی ٢٩، ل٢١٥.
٥٣ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی ٢٩، ل٢١٥.
٥٤ـ هیگل، دانراوەکان، بەرگی١، ل ٣٤٤.
٥٥ـ هەمان سەرچاوە،بەرگی١،ل٦٠.

٥٦ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی٣،ل٧٠.

٥٧ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی٢،ل١٦.

٥٨ـ لینین، دانراوەکان،بەرگی٢٩،ل.ل١٧٨ـ ١٧٩.

٥٩ـ لینین، دانراوەکان، بەرگی ٢٩،ل٨٤.

٦٠ـ لۆدفێك فیورباخ، هەلبژاردە فەلسەفییەکان لە دوو بەرگدا، بەرگی١، ل١٩٩.

٦١ـ هەمان سەرچاوە،ل٢٠٢.

٦٢ـ هەمان سەرچاوە، ل٢٠٣.

٦٣ـ هەمان سەرچاوە،ل٧١٢.

٦٤ـ هەمان سەرچاوە، ل١٢٩.

٦٥ـ هەمان سەرچاوە، ل٤٩٢.

٦٦ـ هەمان سەرچاوە، ل٦٠٢.

٦٧ـ هەمان سەرچاوە، ل٤٣٠.

٦٨ـ هەمان سەرچاوە، ل١٩٠.

٦٩ـ مارکس و ئنگلس، دانراوەکان، بەرگی ٢٩، ل٢.

٧٠ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، ل٤٦٦.

٧١ـ مارکس و ئنگلس، دانراوەکان،بەرگی٣، ل٤٤.

٧٢ـ هەمان سەرچاوە،بەرگی ٢١، ل٢٩٨.

٧٣ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، ل.ل٤٦٨ـ٤٦٩.

٧٤ـ مارکس و ئنگلس، دانراوەکان، بەرگی ٢١،ل٩٩.

٧٥ـ لینین، دانراوەکان، بەرگی٢٠، ل٥٢٠.

٧٦ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی٢٠، ل٤٤.

٧٧ـ بیایینسکی، دانراوەکان،بەرگی ١٢، ل٣٣١.

٧٨ـ لینین، دانراوەکان،ل٢٦١.

٧٩ـ نامەکانی نێوان مارکس و ئنگلس لەگەڵ پیاوانی سیاسی ڕوس، مۆسکۆ١٩٥٦ل.ل١٨٧ـ١٨٨.

٨٠ـ لینین، دانراوەکان، بەرگی ١٨، ل٢٨٧.

٨١ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی ٢، ل٤٦٢.

٨٢ـ کورتەی مێژووی فەلسەفە، ل٥٨٤.

٨٣ـ لینین، دانراوەکان، بەرگی ١، ل١٤١.

## سەرنج:

١ـ ئەو ڕونکردنەوانەی لە پەراوێزی لاپەرەکاندا هاتوون ئەگەر ئامارە بۆ هیچ شتێ یا ناوی نەکرابێ وا مانای ئەوەیە هەر لەدەقە عەرەبییەکەوە وەرگێراوون.

٢ـ مەبەست لە: لینین، دانراوەکان، "المو لفات الكامله" یە.دیسان مەبەست لە: بیلینسکی، دانراوەکان،" المو لفات الكامله"یە.

## لەبەرهەمە بڵاوکراوەکانی نوسەر
## ١٩٧٣- ٢٠٠٥

یەکەم: نوسین و دانراو:

١ـ دیپلۆماسیێتی بزوتنەوەی کوردایەتی، سلێمانی ١٩٧٣.

٢ـ کۆماری میللی مەهاباد

چاپی یەکەم: کوردستان ـ ١٩٨٤.

چاپی دووەم: ستوکهۆڵم ـ ١٩٨٦.

٣ـ ڕەگ و ڕیشەی مێژوی تەقەلای بە عێراقی کردنی کوردو مەسەلەی کوردستان

چاپی یەکەم: سوید١٩٨٧

چاپی دووەم: سلێمانی ١٩٩٨

چاپی سێیەم: سلێمانی١٩٩٩

تێبینی: چاپی دووەم و سێیەم لەگەڵ ( بازنەکانی ململانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورددا ڕێکخراون).

٤ـ کوردو ململانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوە

چاپی یەکەم: کوردستان ـ ١٩٨٨

چاپی دووەم: سلێمانی ـ ١٩٩٨

چاپی سێیەم: سلێمانی ـ ١٩٩٩

تێبینـــی: چـــاپی دووەم و ســـێیەم لەگـــەڵ(بازنـــەکانی ملمڵانێـــی و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورددا ڕێکخراون).

٥ـ دەوڵەتی جمهوری کوردستان ـ نامەو دۆکومێنت

بەرگی یەکەم ـ چاپی یەکەم: ستۆکهۆڵم ١٩٩٢

بەرگی دووەم ـ چاپی دووەم: ستۆکهۆڵم١٩٩٥

بەرگی سێیەم ـ چاپی سێیەم: ستۆکهۆڵم ١٩٩٧

٦ـ بازنەکانی ملمڵانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورد

چاپی یەکەم: سلێمانی ١٩٩٨

چاپی دووەم : سلێمانی ١٩٩٩

٧ـ کاروانی بێ کۆتایی:

چاپی یەکەم: سلێمانی ٢٠٠٠

چاپی دووەم: سلێمانی٢٠٠٠

٨ـ ئەمریکاو عێراق و ئەگەرەکانی کورد لە بەردەم چاوەڕوانیەکاندا

چاپی یەکەم: سلێمانی ٢٠٠٢

دووەم: وەرگێران:

١ـ دەرویشـەکان بـە دوای ڕاسـتیدا ئەگـەڕێن ـ لـە عەرەبیـەوە کـراوە بەکوردی.

چاپی یەکەم: سوید ـ ١٩٨٢

چاپی دووەم: سلێمانی ـ ٢٠٠٠

٢ـ جولانـەوەی ڕزگاریخوازانـەی کـورد لـە خەباتیـدا بـۆ سـەربەخۆیی نەتەوایەتی و سیاسی ـ نووسینی پ. ڕادۆڤان پاڤیچ.

لە عەرەبیەوە کراوە بە کوردی.

چاپی یەکەم: ستۆکهۆڵم ١٩٨٥

چاپی دووەم: کوردستان١٩٨٦

٣ـ کورتەی مێژویی فەلسەفە ـ لە عەرەبیەوە کراوە بەکوردی.

بەرگی یەکەم: چاپی یەکەم ـ سوید ١٩٨٨

٤ـ لە پێناوی گەشەپێدانی ئەرشیفە نوێ دامـەزراوەکانی کوردسـتان ـ لەسویدییەوە کراوە بە کوردی

چاپی یەکەم: سلێمانی ـ ٢٠٠٠

٥ـ چون بنوسین ـ لە سویدیەوە کراوە بە کوردی

چاپی یەکەم ـ سلێمانی ـ ٢٠٠١

**سێیەم: ئەو بەرهەمانەی تری نوسەر کە بە ناوی ترەوە بڵاوکراونەتەوە.**

خەباتی کرێکاران..

چاپی یەکەم ـ سلێمانی ١٩٧٣

**چوارەم: لەگەڵ دەیان باس و لێکولینەوەو دیـدەنی کـە لـە ڕۆژنامـە و گۆڤارو بڵاوکراوەکاندا لە وڵات و دەرەوەدا**

بڵاوکراونەتەوە... بە تایبەتی:

**لەڕۆژنامەی:**

خـەبات، النـور، برايـەتی، التـاخی، کوردسـتانی نـۆی، ئـاڵای ئـازادی، سـلێمانی نـوێ، ڕای گشـتی، ئۆپسـالانییە تیـدنینگ ـ سـویدی ـ سوید،کوردستانی نوێ ـ چاپی ڕوسی ـ مۆسکۆ.

**لە گۆڤاری:**

رزگاری، پەیڤ، ڕابوون، مرۆڤایەتی، گـزینگ، ڕێبـازی نـوێ، مامۆسـتای کورد، تایم، ئاینده، پێشمەرگە، گۆڤاری ناوخۆ، دەنگی مامۆسـتا، نـوێ دەم، نڤار، پەیڤین، ئاران، ئامانج...

# ناوەڕۆك

# زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران- هەولێر

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر | وەرگێڕان لە | وەرگێڕ | شوێن | چاپخانە | ساڵ | لاپەڕە | بابەت |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١- | گرەو | عەزیز نەسین | عەرەبی | جەمال گرێسەوزی | هەولێر | (ب.ج) | ٢٠٠٣ | ٢٨ | چیرۆکی وەرگێڕدراو |
| ٢- | بێناسنامەکان ج٢ | عەزیز نەسین | فارسی | حەمە کەریم عارف | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٣ | ١٦٠ | ڕۆمانی وەرگێڕدراو |
| ٣- | ئاغا و شێخ و دەوڵەت ج١ | | ئەڵمانی | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٣ | ٣٦٠ | کۆمەڵناسی |
| ٤- | کورد و کوردستان- پاشی (١-٢٠٠) ج٢ | محەمەد ئەمین زەکی | | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٣ | (٢٧٢- ٢٧٨) | مێژووی کورد |
| ٥- | مرۆڤ لە نێوان پوولەکە و چەرمەسەریدا | سابیر بەکر بۆکانی | | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٣ | ٢١٦ | کۆمەڵناسی |
| ٦- | کورد لە سەدەی نۆزدەی بەریتانیادا | کریس کۆچێرا | فارسی | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ٤٦٤ | مێژووی کورد |
| ٧- | چاوەکانی ج١ | بزورگی عەلەوی | فارسی | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ٢٦٠ | ڕۆمانی وەرگێڕدراو |
| ٨- | ئینسایکلۆپیدیای فەیلەسوفان | م. ڕۆزنتال | عەرەبی | محەمەد وەسمان | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ٥٥٠ | فەلسەفە |
| ٩- | پەیوەندییەکانی کوردی لای لە وڵاتی باب و شەروان | د. جەمال ڕەشید | عەرەبی | مامۆستا محەمەد مەلا قادر | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ٢٢٠ | مێژووی کورد |
| ١٠ | بیرەوەرییەکانی ئەحمەدی تەغلی ج٢ | مارسل بروون | فارسی | حامەی حەمە سەعید | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ٣٢٤ | بیرەوەری |

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ٨ج | [illegible] | | | [illegible] | [illegible] | | | |
| -١٢ | کلیکی ئینتەرنێت چ٢ | سەرکەوت پێنجوێنی | | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ٩٨ | ئینتەرنێت |
| -١٣ | فێربوونی ئەرمەنی بە ئاسانی، | کورنۆ ئەحمەد | | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ٦٣ | زمان - فێربوون |
| -١٤ | [illegible] لە نێوان پەرلەمەنت و جەمەربەندی چ٢ | سابیر بەکر بۆکانی | | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ١٣٠ | کۆمەڵناسی |
| -١٥ | کێشە سێکسییەکان چ٢، | | | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ١٤٠ | پەروەردەی سێکسی |
| -١٦ | ئازادی یا مەرگ | نیکۆس کازانتزاکیس | فارسی | حەمە کەریم عارف | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ٥٦٠ | ڕۆمانی وەرگێڕدراو |
| -١٧ | فەرهەنگی شێوەزاری [illegible] کوردی چ٤ | فازیل نیزامەدین | | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ٨٤٥ | فەرهەنگ |
| -١٨ | زمانناسی و مەنتق لە پێناوی زمانناسیی کوردی | سەلام ناوخۆش | | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ١٠٣ | زمان |
| -١٩ | ئەدەب و فەلسەفە | کەریم دەشتی | | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ٥٢٧ | ئەدەب |
| -٢٠ | چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی | سەمەدی بیهرەنگی | فارسی | حەمە کەریم عارف | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ٢٤٠ | چیرۆک |
| -٢١ | ئۆزاران بۆلی خەوم لێ دێ، | چلوور ئامیق حەسەن | | | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ١١٢ | شیعر |
| -٢٢ | ئەفسانەی گریکی و ڕۆمانی | گرێس.ه. کوپەر | فارسی | حەمە کەریم عارف | سلێمانی | شڤان | ٢٠٠٤ | ١٥٢ | ئەدەب |

| | | | | زانە | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| - | پزیشکی کوردی و پەرامووشی پووداو و تازیندەیی شاکەس | جەلیل کاکەوەیس | | | سلێمانی | بینایی | ٢٠٠٥ | ١٥٣ | ئەدەبی کوردی |
| - | هونەری شیعر، ج ٢ | هۆراس | ئینگلیزی | د. حەمید عەزیز | سلێمانی | چوار چرا | ٢٠٠٥ | ٥٥ | ئەدەب |
| - | رەشەدی ( رەشەدی پزیشکی کوردی) | فوئاد رەشید | | | سلێمانی | پەیوەند | ٢٠٠٥ | ١٩٧ | ئەدەبی کوردی |
| - | ئیرگەری – کۆمەڵە وتار | محەمەد رەحمان | | | سلێمانی | گەنج | ٢٠٠٥ | ١٠٧ | زانیاری گشتی |
| - | مێژووی هاوچەرخی کورد، ج٢ | دیڤید مەکداول | فارسی | ئەبوبەکر خۆشناو | سلێمانی | پەروەردە | ٢٠٠٥ | ٧٤٧ | مێژووی کورد |
| - | بیبلۆگرافیای فۆلکلۆری کوردی | د. عومەر ئیبراهیم عەزیز | | | سلێمانی | چوار چرا | ٢٠٠٥ | ٣٢٠ | بیبلۆگرافیا |
| - | زانستی گۆرانی – چەپکێک لە هۆنراوەی گۆرانی | شێروان حەسەن حوسێنی | | | سلێمانی | گەنج | ٢٠٠٥ | ٢٥٢ | شیعر |
| - | لە پەیوەندییەوە بۆ خۆشەویستی، ج ٢ | ڕێبوار سیوەیلی | | | سلێمانی | شڵان | ٢٠٠٥ | ٢٢٤ | کۆمەڵناسی |
| - | تاسەی ئازادی ، ج٢ | سیامەند شێخ ئاغایی | | | سلێمانی | گەنج | ٢٠٠٥ | ١٥٣ | چیرۆک |
| - | سەگی سوورەی | سیامەند شێخ ئاغایی | | | سلێمانی | گەنج | ٢٠٠٥ | ١٩٠ | ڕۆمان |

